# ئاكارو ڕەوشتە بەرزەكانی پێغەمبەر صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ



نوسینی

ئیمامی ترمذي

وەرگێڕانی

نوری علی سلێمان

| | |
|---|---|
| نـــاوی کتێـــــب: | ئاکارو ڕەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەرﷺ |
| نووسیــنــــــی: | ئیمامی ترمذي |
| وەرگێـــڕانـــــی: | نوری علی سلیمان |
| نـەخشەسازی ناوەوە: | کۆمپیوتەر (کامران رفیق عمر) |
| ســـاڵی چـــــاپ: | ٢٠١٠ ز |
| ژمــــارەی سپـاردن: | (٢٧١٩)ی ساڵی (٢٠١٠)ی پێدراوە. |

# ئاكارو ڕەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەر ﷺ

نوسینی

ئیمامی ترمذي

پوختکردن و لێکۆڵینەوەی

زانای فەرمودەناس شێخ محمد ناصرالدین الالبانی (رحمە اللّٰه)

وەرگێڕانی

نوری علی سلێمان

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەكی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور انفسنا، ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضلَّ له، ومن يُضلل فلا هادي له، واشهد ان لاإله إلا الله وحده لا شريك له، واشهد أن محمدا عبده ورسوله، (يا ايها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ولا تموتن إلا وانتم مسلمون). يا أيها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا كثيرا ونساء، واتقوا الله الذي تساءلون به والارحام إن اللّة كان عليكمْ رقيبا). (يا أيها الذين آمنوا اتقوالله وقولوا قولا سديدا، يصلح لكم اعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم، ومن يطع ألله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما).

پاشان ئەمە بەشێكی ووردو ناسكە، تیایدا هەستاوم بە كورتكردنەوەی كتێبی ((الشمائل المحمدية))ی پێشەوا ترمذي كە خاوەن (كتاب السنن)ەو بە ناوی خۆیشیەوە ناسراوە، كتێبی (الشمائل) یش لەگەڵ ووردیو ناسكیدا _ لە تەواوكاریەكانی پرۆژە گەورەكەمە ((نزیكخستنەوەی سوننەت بۆ پێش دەستی ئوممەت)) كە ئامازەم پێداوە لە دووتوێی زیاتر لە یەك كتێب لە كتێبە چاپكراوەكانم، بەڵكو لە كتێبە دەستنوسەكانیشمدا، لەوانە كتێبی ((مختصر صحيح البخاری)) یە كە بەرگی یەكەمی بلاوكرایەوەو وداواكارم خوای پەروەردگار ئاسانكاری چاپكردنی تێكڕای بەرگەكانیم بۆ بكات بە منەت وبەخشندەی خۆی.

مێژووی دەستپێكردنی ئەم كتێبەش دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە دە سالی ڕابردوو، كاتێك پشتم بەست بە نوسخەیەكی ((الشمائل)) ی چاپكراو بە پیتی گەورە لەسەر بەردو لە وەلاتی مصر بە بۆچوونی خۆم، وە بە هۆی گواستنەوەم لە خانوویەكەوە بۆ یەكیكی تر بەشێكم وون كردو، ئیتر هیممەت لاواز بوو بۆ بەدواداچونی كارەكە، تا لە سەرەتای ڕەمەزانی سالی ڕابردوودا (١٤٠٠)ك كۆچم كرد لە دیمەشقەوە بۆ عەممان و، هێشتا گواستنەوەی كتێبخانە تایبەتیەكەم بۆ ئێرە

سانا نەبوو بوو بۆیە سەر لە نوێ گەڕان بە دوای ئەوەی لێم وون ببوو، بەڵام خـوای گەورە لە جیاتی کتێبخانەکەم _ تاڕادەیەك _ بە کتێبخانـەی بـرام مامۆسـتا أحمـد عطیە لە ماڵە ئاوەدانەکەیدا لە (جبل هملان) قەرەبووی کردمـەوە _ خـوای گـەورە پاداشتی بداتەوە _ ئاسانکاری چونە ژوورەوەی کتێبخانەکەی بـۆ دەکـردم چ کـات ئارەزووم بوایە، ئیتر بە زۆری ئامشۆم دەکرد وەکو ئەوەی کتێبخانـە تایبەتیەکـەی خـۆم بێـت و، کاتژمێرگـەلێکی درێـژ تیایـدا دادەنیشـتم بـە خـۆ ێندنـەوەو گـەران‌و لێکۆڵینەوەو پـەراوێز نوسـین، ئـەوەش تـا ڕادەیـەکی زۆر غـەریبی بـیر بردمـەوە و، هەستم کرد لە وەلاتی خۆمداو لـە نێـو کەسـوکارو براکانمـدا دەژیـم، کەچـی ڕۆژێـك کتێبم دەخوێندەوە لە پڕ چاپێکی نوێی (الشمائل)م دۆزیەوە _چاپی سـوریا _ بـە لێکۆلینەوەوو ڕاڤەکردن‌و (تخریج) کردنـی مامۆسـتا عـزت عبیـد الـدعاس لـە چـاپی دووەمیدا ساڵی ١٣٩٦ك، منیش بـێ ئیشـی خـۆم‌و دوورکەوتنـەوەم لـە کتێبخانـەی (الظاهریة)ی ئاوەدانم بە هەلی گونجاو زانی، بە تایبەتی تریش پاش دوورکەوتنەوەم لە کتێبخانەکەم‌و زۆربەی پرۆژەکانم کە خۆم بۆ تەرخان کردبوو، لەوانـە (تصـحیح) کردنـــی تاقیکردنـــەوەکانی بـــەرگی ســـێیەمی ((الصـــحیحة)) بـــوو[1] لەگـــەڵ سەرپەرشـتیکردنی لـە چـاپدانی (صـحیح الترغیـب والترهیـب)و (ضـعیف الترغیـب والترهیب)[2] لەبەر ئەوە دەمتبینی سوور بووم لەسەر دەستپێکردنی کورتکردنـەوەی (الشمائل) جارێکی تـر، ئـیتر ئـەو هەلـەم قۆسـتەوەو کارەکـەم دەسـت پێکـردەوە. ئەوەشی زیاتر پاڵی پێوەنام ئەوەبوو بینیم مامۆستا دەعاس لە کارێکی زۆر ڕزگاری کـردوین بـە هـۆی گرنگیـدانی زۆری بـە (تخـریج) کردنـی کتێبەکـەو ڕوونکردنـەوەو پـەراوێز نووسـینی ئەگەرچـی پاشـان بـۆم دەرکـەوت (تخـریج)ەکـەی تێکـڕای فەرموودەکانی کتێبەکەی لە خۆ نـەگرتوە، بـە تایبـەت ئـەو فەرموودانـەی بوونیـان

---

[1] _ لە کۆتایدا ئاگام لێبوو چاپکراوە بە بێ ئەوەی سەرپەرشتیارەکە توانای ناردنی نامیلکەکانی تری کتێبەکەی هەبێـت بۆ ( تصحیح )و، پێرستێـکیشی بۆ دانابوو بە پێـی زانینی خۆی.

[2] _ بەرگی یەکەمی (الصحیح) تەواو بووەو ئامادەشم کردوە بۆ چاپکردن لەسەر نۆفسێـت‌و لـە بەیروتیش خستومەتە بەر دەست بۆ چاپ، کـاتێ ناچـاری سـەفەرکردنیی بـوم پێـــشی چـەند مانگێك. داواکارم پەروەردگار سانایی تەواوکردنیم بۆ بکات.

نییە لە یەكێك لە (الكتب الستة)دا لەگەڵ هەندێك هەڵەی دانەپاڵو ڕاڤەكردن، لە هەمان كاتیشدا وورد نەبووە، چونكە بۆم دەركەوت هەندێ فەرموودەی هەندێك لە هاوەڵانی داوەتە پاڵ هەندێ پێشەوا ئەوان لە هاوەڵێكی ترەوە دەیگێڕنەوە، یا بە بێژەیەكی كورتر، دروست نی یە بدرێتە پاڵیان بە بێ روونكردنەوەو دەرخستن، وەكو ئەوەی ئاماژەم پێداوە لە میانەی ڕاڤەكردنی زیاتر لە یەك فەرموودەدا لەم كارەشدا نیازی سەرتاپاگیریم نەبوو، چونكە كاتێكی زۆری دەویست، پێدەچێت دەستپێكردنی (تخریج)ەكە ساناتر بوایە، بۆیە ئەوە بوو بە مەبەستی سەرەكیم لەم ((كورتەیەدا)) بۆ نموونەش بڕوانە تێبینی پەراوێزی فەرموودەی (٢٢٢) سەرەڕای ئەوەی بە هیچ شێوەیەك ڕووی لەجیاكردنەوەی ((صحیح))و (ضعیف)ی فەرموودەكانی كتێبەكە نەكردووە، هە روەكو بەشێكی زۆری دووانبێژان (المعلقین)و لێكۆڵەرەوان لە دكتۆرەكانو كەسانی تریش لەسەری ڕاهاتووان، بەڵكو لە ئەوانیش زیاتری خستۆتە سەر، كاتێك فەرمایشتەكانی ئیمامی ترمزی لە (سنن)ەكەیدا لەسەر فەرموودەكان بە ((تصحیح))و ((تضعیف) فەرامۆش كردووە، لەگەڵ ئەوەی ((تصحیح))و ((تضعیف) ئامانجی هەرە بەرزی هونەری (تخریج)ە، هەروەكو لای زانایانی ئەم زانستە مەزنە شاراوە نییە بەڵام پشتم پێ بەستو بە بنچینەم دانا بۆ ساخكردنەوەو تحقیق ولێكوڵینەوەی دەقەكانی كتێبەكەو بەراوردكردنی نوسخەكانی هەندێكیان بەهەندێكی تر. ئەم كارەش پێویستی بەكاتی زۆرترو ئامادەبوونی تایبەتە لەبەر ئەوە ناچار بە كردنی نابم لەم پرۆژەمدا، هەرچەند نموونە گەلێكی زۆرم دەستكەوت دەریانخست مامۆستا دەعاس ساخكردنەوە (تحقیق) ولێكوڵینەوەی شایستەی بە كتێبەكە نەبەخشیوە، باشترین بەڵگەش ئەوەیە كە لە پاش فەرموودەی داهاتوی ژمارە (١٨٩) هاتوە كە لە كتێبە بنچینەكەدا لە لاپەڕە (١١١) دایە بە ژمارە (٢٢١) ەو دەقەكەشی دەڵێت:ئەبو عیسا فەرمویەتی: بۆ حەنان بە دەر لەم فەرموودەیە ناناسین. عبدالرحمانی كوڕی ئەبی حاتم لە (كتاب الجرح والتعدیل) دا فەرموویەتی: حنان الاسدی.... هتد ئەم گێڕانەوەو باسكردنە لە ئیبنو ئەبی حاتەمەوە زۆر بە دوور دادەنرێت ئیمامی ترمزی فەرمویێتی، چۆن ئەوە دەبێت ئەگەر ئیمامی ترمزی ساڵی (٢٧٩) ك مرد بێت و،

ئیبنو ئەبی حاتەمیش ساڵی (٣٢٧)ك مردبێت، واتە پاش مردنی ئیمامی ترمزی بە چل‌و هەشت ساڵ، لە دایك بوونیشی ساڵی (٢٤٠) ك كەواتە تەمەنی سی ونۆ ساڵان بووە ساڵی مردنی ئیمامی ترمزی لەبەر ئەوە ڕێتێچونی هەڵسانی بە دانانی (كتاب الجرح) پێش ئەو تەمەنەو بلاْوبونەوەو ئاشكەرابوونی تاوەكو ئاستی كەوتنە زاری زانایان‌و بوار ڕەخسابێت بۆ ئیمامی ترمزی لێی بگێڕێتەوە ئەوا ئیحتماڵێكی دوورە. گومانی تێدا نی یە ئەو گێڕانەوەو باسكردنە لە ڕاستیدا لە لایەن هەندێك زاناوە بووە كە لە دوای ئیبنو ئەبی حاتەمەوە هاتوون‌و گوتەكەی ئیبنو ئەبی حاتەمیان لە پەراوێزی كتیبەكەدا نووسیوەتەوەو پاشان هەندێك كەسانی لەبەرگرەوە (نساخ) بە هەڵەدا چون‌و خستویانەتە ناوەڕۆك‌و دەقی شمائیلەوە، هیچ سەرسوڕمانێكیشم لا دروست نابێت مامۆستا دەعاس ئەم حەقیقەتەی لێتێپەڕیبێت، چونكە لە پیاوانی ئەم زانستە نییە، بەڵام سەرسوڕمان لەوەدایە لە ڕاڤەكارانی (الشمائل) وەكو القاری والمناوی‌و زانایانی تری بە ناوبانگ ئەم حەقیقەتە تێپەڕیبێت.

## مەنهەجم لەم كورتكردنەوەیدا :

١. ڕشتەی گێڕەرەوانی (سند) دانەرم (المؤلف) لە هەموو فەرموودەیەكدا لابردووە بەدەر لەوەی بە یادهێنانەوەی ناچاریە بە تایبەت لە سەرەوە وەكو هاوەڵەكان و، لەوانیش بە خوارتر جار بە جار.

٢. فەرمودەی دووبارەوە بووم لابردووە ئەگەر لە یەك هاوەڵەوە بێت‌و، ئەگەر لە نێوان هەردوو گێڕانەوەكەیدا جیاوازی لەماناد‌ا هەبێت هەردووكیانم جێگیر كردووەو نووسیوەتەوە، وەكو ئەوەی دەڵێم: (لە ڕیوایەتێكدا: ئاوەهاو ئاوەها))و ئەگەر (ڕیوایە)تەكەش لە ڕێگەكەیەكی ترەوە بێت جیاواز لە ڕێگەی یەكەم دەڵێم:((لە ڕێگەیەكەوە: ئاوەهاو ئاوەها)) ئەمەش ئاماژەیە بۆ بەهێزكردنی فەرموودەكە بە ڕێگەیەكی ترو ئەگەر فەرموودەكە زیادەیەكیشی تێدا بێت دەیخەمە پاڵ فەرموودەی یەكەم‌و لە نێوان دوو چەماوەدا ﴿ ﴾ دایدەنێم.

٣. لێدوان و ڕوونكردنەوەكانی دانەرم لەسەر فەرموودەكان لابردووە ئەگەر ((تصحیح)) یا ((تضعیف)) یا كەڵك و سودێكی زۆری تێدا نەبێت.

٤. بە زۆری پارێزگاریم لە (تخریج) ەكانی مامۆستا دەعاس بۆ فەرموودەكانی (الشمائل) كردووە چونكە كۆششێكی سوپاسكراوە، لەگەڵ شتێك لە كورتكردنەوەو دەستكاریكردن لە ڕستەدا دەستكاریكردنێك تیایدا مەبەستی سەرەكی پارێزراو بێت، لە هەندێكیشیدا بە دوایدا دواوم (تعقبتە) بە نواندنی چەندین تێبینی و، زیادكردنی چەندین سوودی گرنگ، بە دیدم پێویستی بە ئاگاداركردنەوە*نییە، جگە لەوانەی بە دوای (تخریج)ەكانی مامۆستا دەعاسەوەیەو زیادەكەش دەكەمەوەو دەڵێم: (گوتم...).

٥. لەوانەیە هەندێ ڕستەشی ڕاست كەمەوە دیسان بە بێ نوسینی هیچ تێبینیی و ئاگاداركردنەوەیەك بە تایبەت ئەوەی لە بنەڕەتی (متن) كتێبەكەدایە و، ئەوەشی لە نێوان دوو چەماوەدایە ﴿﴾ زیادەیەكە لە خۆمەوە دامناوەو كە تەحقیقە عیلمیەكە وا گەرەكیەتیو وا دەخوازێت.

٦. پێم داگرتووە لەسەر دەرخستنی پلەی (مرتبة) فەرموودە، چونكە مەبەستی هەرە بەرزی هونەری (تخریج) ە وەكو لەپێشەوە ئاماژەی بۆ كرا، بە زۆری درێژەشم بەوە نەداوە مەگەر ڕشتەی گێرەرەوانی (اسناد) دانەر ((ضعیف)) بێت و، ولە لایەكی دیكەشەوە بە دواداچون و ڕێگاكان (متابعات طرق) هەبێت رایگرێتو بە هێزی بكات، بە دیدم لەم بارەدا بە یادهێنانەوەو نوسینەوەی پێویستە ئەگەر بە كورتیش بێت ئەوجا هەڵساوم بە (تخریج) كردنیو درێژەپێدانی لێدوانی سەر فەرموودەكانیشم گەڕاندۆتەوە بۆ هەندێك لە كتێبەكانم وەكو هەردوو زنجیرەی ((الصحیحة))و ((الضعیفة))و كتێبەكەی تریشم (إرواء الغلیل فی تخریج أحادیث منار السبیل) وەی تریش.

٧. وە بەم ڕێگا زانستيەی ئاماژەم بۆ كرد بە پشكنين‌و لێ وردبوونەوەی ڕێگاو بەدواداچـوونەكان (الطـرق والمتابعـات) _ بـە فـەزڵی خـوای گـەورەو سەرخستنی _ بە توانابووم لە ڕزگاركردنی زۆربەی فەرموودەكانی كتێبەكە لـەو لاوازيـەی بـە ڕشتـەی گێڕەرەوانيەكەيـەوە (سـند) نوسـابوو بـۆ پلـەی ((حسن))، بـەڵكو بـۆ پلـەی ((صـحيح))يش جاربـەجار، ئـەوەبوو ژمـارەی فـەرموودەكانی كتێبەكـە پـێش كورتكردنـەوە نزيكـەی (٤٠٠) چـوار سـەد فەرمووده بوو، دووای كورتكردنەوەش بـوو بـە (٣٥٢) سـێ سـەدو پـەنجاو دوو فەرموودە، كە سەدو هەندێك لە لاوازی ڕشتە گێڕەرەوانيەكـەيم (سـند) بۆ ڕوون بوويەوە، لێرەدا بۆ پاراستن‌و بە جێهێنـانی ئەمانـەتی زانسـتی بـە گونجاوم دانا هەڵسم بە پشـكنين‌و لێوردبوونـەوەی ڕێگـاو شـاهيدەكانی لـە هەر شەش كتێبی فەرموودەكەو هی ديكەشدا، بۆ ئەوەی چەند لـە توانامـدا بێـت لاوازی زۆرتـرين فـەرموودەكانی لادەم، سـوپاس‌و سـتايش بـۆ خـوا، ئەوەبوو بە توانـا بـووم نيـوەی بـە هێـز بكـەم‌و، بـەرزی بكەمـەوە بـۆ پلـە جێگيريەكەی، وەكـو ئـەوەی لەپێشـدا ڕوونم كـردەوە، هـەمان ڕێگەشـم بـە كارهێناوە لە (تخريج أحاديث الحلال)دا وەكو لە پێشـەكيەكەيدا لـە لاپـەڕە (١٠_١١)دا نوسيومەتەوە، (وذلك منفضل الله علينا وعلى الناس ولكـن اكثـر الناس لايعلمون).

**لێردا ئاماژەكردن بە ژمارەكانيان بە كەڵكە:**

(٤ و٩و ١٠و ٢٨و ٣٨و ٤٢و ٤٥و ٤٦و ٥٥و ٥٨و ٦٥و ٦٧و ٨٩و ٩٢و ٩٤و ٩٧و ٩٩و ١٠١و ١٠٣و ١١٦ و١٣٣ و١٣٤و ١٣٩و ١٤٢و ١٤٣و ١٤٦ و١٥٥و ١٦١و ١٧٥ و١٨٣و ١٨٤و ١٨٨و ٢٠٠و ٢٠٥و ٢٠٦و ٢١١و ٢١٢و ٢١٦و ٢٤٥و ٢٤٩و ٢٥١و ٢٥٩ و٢٦٦ و٢٧٠و ٢٧٨ و٢٨٠و ٢٩٣و ٣١٢و ٣٢٥ ٣٢٦و ٣٣٨).

٨. هەڵسـاوم بـە سـەرنج ڕاكێشـان‌و بيرخسـتنەوەی هەنـدێك لـە هەڵـەكانی لـە (تخريج) دا يا نەرمی نوانـدن تيايـدا وەكـو فـەرموودەكانی (٣٧و ٤٣و ٥٧و ٧٦و ٩٠و ١٠١و ١٠٣و ١١٣و ١١٥و ١٢٦و ١٤٠و ١٤٩و ١٥٢و ١٥٣و ١٥٦و

١٧٤و ١٧٩ و٢٢٢و ٢٢٣و ٢٢٤و ٢٣٠و ٢٣٢و ٢٣٣و ٢٤٢و ٢٦٤و ٢٦٥و ٢٧١و ٢٨٥و ٢٨٨و ٢٩٣و ٢٩٥و ٢٩٩و ٣١٧و ٣٢١و ٣٤٩).

٩. خۆێنەری وشیار تەماشا دەكات زۆربەی فەرموودەكان وشەی ((صحیح)) یا ((حسن)) بەرامبەر بە ژمارەی فەرموودەكە دانراوەو، هەندێكیشیان بەرامبەر بە سەرەتای بنەڕەتی (متن) فەرموودەكە، كەواتە بزانە یەكەم ئاماژە دەكات بۆ ڕشتەی گێڕەرەوانی (سند)، واتە فەرموودەیەكی ((صحیح لذاته))یە یا ((حسن))و ئەویتریش ئاماژە بە (ضعیف) ی ڕشتەی گێرەرەوانی (سند) دەكاتو بەلأم بنەرەتی (متن) فەرموودەكە ((صحیح لغیره)) یە یا ((حسن))ە، هەروەها كاتێك ڕشتەی گێرەرەوانی (سند) فەرموودەكە (ضعیف) بێت و، هەندیك لە بنەڕتی (متن) فەرموودەكە لە ڕێگەیەكی ترەوە هاتبێت لێرەدا وشەی ((صحیح)) یا ((حسن)) لە تەنیشتی بنەڕەتەكەدا (متن) دادەنریت، لە لایەكی دیكەشەوە پێدەچێت ڕشتەی گێڕەرەوانی ((سند) ((حسن)) بێت و، فەرموودەكە لە ڕێگەیەكی تریشەوە هاتبێت ئەوجا فەرموودەكە دەبێت بە ((صحیح))و لە تەنیشت بنەڕەتەكەیدا (متن) وشەی ((صحیح)) دادەنرێت و، لە تەنیشتی ژمارەی فەرموودەكەدا وشەی ((حسن)) دادەنرێت.

١٠. بۆ تەواوكردنی سوودو ڕێگە ساناكردن لە پێش خوێنەری بەڕێزدا، بە یارمەتی خوا هەستاوم بە دانانی پێنج پێڕست بۆ ئەم كتێبە موبارەكە:

١. پێرستی بەشو توێژینەوەكان.

٢. پێڕستی فەرموودەكان ریزكراون بە پێی پیتەكان.

٣. پێڕستی ئەوانەی هەستاون بە دانەپاڵی فەرموودەكان (أسندوا الأحایث) لە هاوەڵانو كەسانی تر لەگەڵ نووسینی ژمارەی ئەو فەرموودانە.

٤. پێڕستی ئەو فەرموودەگێڕانەی ژیاننامەیان نووسراوە.

٥. پێڕستی وشە نامۆكانی نێو فەرموودەكان.

١١. لە كۆتایدا دەڵێم:

بە دڵسۆزیەوە هیوادارم ئەم كتێبە ڕێنیشاندەری تێكڕای موسڵمانان بێت بۆ شارەزابوون لەو ڕەوشتە بەرزەی پێغەمبەرمان لە سەری دەچوو، ئەو خووە پیرۆزەی لە كەسایەتیدا بەرجەستە بووبوو، هۆكارێكی ماندەریشیان بێت بۆ گرتنەبەری ڕێگە ڕاستەكەی، خووگرتن بە خوو ڕەفتارەكانی و لێوەرگرتنی نورو ڕوناكیەكەی، لە زەمەنێكدا خەریكە زۆرێك لە موسڵمانان ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوای پەروەردگاریان بیرچێتەوە ﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُوا اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴾ الأحزاب: ٢١. واتە سوێند بە خوا بە ڕاستی لە پێغەمبەری خودا چاكترین نموونەی تەواو ڕێكو پێك هەیە تا چاوی لێبكەن‌و شوێنی بكەون؛ بە تایبەت بۆ ئەو كەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفەرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشەو بەردەوام یادی خوا بە زۆری ئەنجام دەدەن‌و زمانیان پاراوە بە یادی ئەو. لە نێوان موسڵمانانیشدا هەندێك لە ڕێزدارو پلەدارانی وەكو بانگەوازخوازانیان تێدایە، وازیان هێناوە لە پەیرەوكردنی پێغەمبەر ﷺ لە زۆرێك لە ڕینمایی خوو ڕفتارو ئادابەكانی، وەكو خاكی بوونی لە پۆشاك‌و، ڕینمایەكانی تریشی وەكو خواردن‌و خواردنەوەو نوستن‌و نوێژو پەرستنەكانی تردا، بەڵكو كەسانێكیان تێدا بە دیكراوە وازیان بە شوێنكەوتوانی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ هێناوە كاتێك شوێنی كەوتون لە هەندێك لەو سوننەتانەدا، وەكو خواردن خواردنەوە بە دانیشتنەوەو، كورتكردنەوەی پۆشاك بۆ سەرەوەی قاپەكانی پێ، چونكە ئەوە بە توندوتیژی‌و هۆكاری سڵێكردنەوەی ناموسڵمانان لە ئیسلام دادەنێن، بۆ نمونە لەو هێندەش كەسانێك بەدی دەكرێت زۆر لایان ئاساییە پۆشاكەكەیان بە سەر زەویدا ڕاكێشن بە بیانوی ئەوەی بە خۆباییبوونەوە ئەو كارە ئەنجام نادەن، خۆیان دڵخۆش دەكەن بە فەرمایشتەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە ئەبو بەكر: ((تۆ لەو كەسانە نیت بۆ لەخۆباییبوون (خُيَلاء) ئەو كارە بكەیت) بێئاگابون لەو جیاوازیە ئاشكەرایەی لە نێوان ئەبوبەكر (ڕەزای خوای لێبێت)و لە نێوان ئەواندا هەیە، چونكە بە قەستەوە ئەوەی نەدەكرد، هەروەكو لە فەرمایشتەكەیدا دەردەكەوێت: ((لایەكی ئیزارەكەم خاو دەبێتەوە)) (فەرموودەی

(٩٠)ی غاية المرام) بەلام ئەوان بەئەنقەست خاوی دەكەنەوەو، نەفامن یا فەرامۆشی ئەوەی سەبارەت بە سیفەتی ئیزاری پێغەمبەری خوا ﷺهاتووە دەكەن (بڕوانە بەشی:١٧)، هەروەها فەرمایشتی داهاتوی بە ژمارە (٩٩) ی سەبارەت بە ئیزار: ((ئەمە (مەبەستی ناوەڕستی قاچە) جێگەی ئیزارە))، ئەگەر بە دڵت نەبوو ئەوجا خوارتر، ئەگەر بە دڵت نەبوو ئەوا مافی ئیزار نی یە قاپەكانی پێ داپۆشیت)). وله فەرموودەیكی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خوارتر لە هەردوو قاپەكانی پێ لە ئاگردایە)) (مشكاه ٤٣١٤و ٤٣٣١). لە فەرموودەیەكی تریشدا ئیمامی موسلیم لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((بە لای پێغەمبەری خوادا ﷺتێپەڕبووم‌و خاوبوونەوەیەك لە ئیزارەكەمدا بوو ئەوەبوو فەرمووی: ((ئەی عەبدوڵا ئیزارەكەت بەرزكەرەوە)) منیش بەرزم كردەوە، پاشان فەرمووی: ((زیاتر بەرزیكەرەوە)) منیش زیاتر بەرزم كردەوە، ئیتر بەردەوام بە دوای بەرزكردنەوەیدا دەگەڕام، تا كەسانێكی نێو خەڵكەكە گوتیان: تا كوێ بەرزی دەكەیتەوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺفەرمووی: تا نیوەی قاچەكانی.

دەڵێم: ئەگەر ئیبنو عومەر كە یەكێكە لە هاوەڵانی هەرە چاكەكارو لە خوا ترسەكان كەچی پێغەمبەری خوا ﷺبێدەنگ نەبووە سەبارەت بە خاوبوونەوەی ئیزارەكەی، بەڵكو فەرمانی بەرزكردنەوەی پێداوە، ئایا ئەمە نەیسەلماندووە ئەم ئەدەبە هیچ پەیوەندیەكی بە مەبەستی خۆبایبوونەوە (خُيَلاء) نەبێت، بە دڵنیایی ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺئەو بانگەوازخوازانەی بەدیكردایە كە جوبەكانیان یا شەرواڵەكانیان درێژدەكەنەوە نكوڵیی لێدەكردن‌و، ئەوانیش بێتوانا دەبوون بەرامبەر بە بەرپەرچدانەوەی نكوڵیكردنەكەی كە گوایە بۆ خۆبایبوون (خُيَلاء) ئەنجامیان نەداوە، كە بە قەستیشەوە ئەنجامی دەدەن وەك لە پێشەوە ئاماژەی پێدرا، چونكە ئیبنو عومەری دونیا نەویست زۆر لە ئەوان ڕاستگۆترە كە بۆ خۆبایبوون (خُيَلاء) ئەنجامی نەدەدا وەكو ئەوەی خاوبوونەوەی نێو فەرموودەكەی خۆی بۆی دەرخستین، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ وسلم نكوڵی لێكرد، ئەوەبوو ئیبنو عومەر ڕەزای خوای لێبێت یەكسەر وەڵامی دایەوەو قبوڵیی بوو،

ئەی ئەمڕۆ كەسانی قایلو بە دەنگەوەهاتوو هەیە؟ ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴾ ق: ٣٧. واتە بە ڕاستی ئالەم بە سەرهاتانەدا یادەوەری هەیە بۆ كەسێك دڵێكی زیندووی هەبێت یا گوێ بۆ قورئان ڕادێرێت. ئەگەر ئەوانەی باسكران لە تایبەتمەندانی خەڵك نەبوایەن كەوا پێویست بوو پێشەنگی كروەو كۆمەڵ بن لە خە یرو چاكەدا، ئاماژەم بەو كەمتەرخەمیە نەدەكرد سەبارەت بە وازهێنانو دەستبەردابوونی شوێنكەوتنی سوننەتو پەیڕەكردنی، لەبەر زۆری سەرپێچیكارانی سوننەت لە بوارگەلێكی زۆر لەوانە گەورەتر.

١٢. ئەمەو پێدەچێت خوێنەری بەڕێز لەم كورتكردنەوەیەدا هەندێك هەڵەو كەمتەرخی بەدی بكات، هۆكاری یەكەمیش وەكو ئاشكەرایە لە سروشتی مرۆڤە، كە لە سەری نوسراوە پارێزراو نەبێت. سەرەڕای ئەوەی كاری ئەم كورتكرنەوەیەم بە جێهێناوە بە دوور لە كتێبو سەرچاوەكانم، خوازیارم هەركەس شتێكی ئەو هەڵانەی بۆ ڕوون بویەوە ڕاستی بكاتەوە یا ئەگەر گونجا ئاگادارمان بكاتەوە، (والله فی عون العبد ما كان العبد فی عون اخیه) واتە: پەروەردگار لە یارمەتیدانی بەندەكەیدایە چەند بەندە لە یارمەتیدانی براكەیدا بێت.

داواكارم لە خوای پەروەردگار ئەمەم لێ قبوڵ بكات، بە پاكو بێگەردی لەبەر خاتری خۆیو بیكات بە وەسیلەك بۆ ئەوەی تكاكاری پێغەمبەرم پێ دەسكەوێت ﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ۝٨٨ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴾ الشعراء: ٨٨ – ٨٩.

واتە ئەو ڕۆژەی كە نە ماڵ سوود دەبەخشێتو نە نەوە، مەگەر كەسێك بە دڵو دەروونی پاكو بێگەردو پڕ لە ئیمان، بە خزمەت پەروەردگار گەشتبێت

عەممان /١٣ شەعبانی ١٤٠٢كۆچی

بسم الله الرحمن الرحيم

زانای بە ناوبانگ ئەبو عیسا محمد کوڕی عیسا کوڕی سەورەی ترمذی[١] فەرموویەتی:

## ١_ بەشی ئەوەی سەبارەت بە ڕوخساری دەرەوەی[٢] پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ١ _عن انس بن مالك أنه سمعه يقول: (كان رسولُ الله صلى الله عليه و سلم ليس بالطويل البائن[٣] ولا بالقصير، ولا بالأبيض الامْهَق، ولا بالآدمِ[٤] ولا بالجَعْد القَطط ولا بالسَّبِط[٥] بعثه الله على رأس أربعين سنة، فأقام بمكة عشر سنين،[٦] و بالمدينة عشرسنين، وتوفاه الله على رأس ستين سنة[٧] و ليس في رأسه ولحيته عشرون شعرة بيضاء).

---

١ تِرمِذ : ناوی شارێکی دێرینە لەسەر ڕووباری (بلخ) باکوری ئێران، وهي بكسر التاء والميم، ويجوز ضمهما.

٢_ الخَلْق : بفتح الخاء وسكون اللام، مەبەستی شێوەی مرۆڤـە وەکو سپێتیو درێژی بەلام (الخُلُق) بضمتين : مەبەستی شێوەی ناوەکیەتی وەکو میهرەبانیو زانین ،(الشمائل) کۆی وشەی (شَمال)ە واتە سروشتو خووو ڕەوشت.

١_ أخرجه البخاري في ((صفة النبي صلى الله عليه وسلم)) وفي ((اللباس)) ومسلم في ((الفضائل)) والمؤلف في ((اللباس))و ((المناقب)) من ((سننه)) ومالك في ((الجامع)). (قلت : وقال المؤلف : ((حديث حسن صحيح))، وهو في الموضع الأول منه بنحوه دون قوله : ((بعثه الله...)) وهو الآتي عقبه، ورواه البغوي أيضاً في ((شرح السنة)) ٣٦٣٥).

٣ _ البائن:ئاشکەرا، دیار.

٤ _الأمهق : بەهێز، زۆر.و (الأدم) : گەنمی، ئەسمەر.

٥ _ الجعد : بفتح وسكون على الأشهر و(القَطَط) بفتحتين: پرچێك چەمانەوەو گرژبوونی زۆری تێدا بێت، زۆر لول، و(السَبِط) بفتح فكسر : پرچی خاو.

٦_ لە (ڕیوایە )تێکدا سیازدە ساڵ تێدا مایەوە، ( ڕیوایە )تی دەش هەڵگیراوەتەسەر ئەوەی کەسی فەرمودەگێڕ کەرتی زیادەی لە دەیان لابردوە.

٧ _ لە (ڕیوایە )تێکدا: لە تەمەنی شەستو سێ ساڵی بوو، کە ئەمەش بە ناوبانگترو ڕاسترە، (ڕیوایە ) تی= شەصتیش دیسان هەڵگیراوەتە سەر ئەوەی کەسی فەرموودەگێڕ زیادەی لە دەیان لابردووە .

لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە كە گوێی لێبوو دەیفەرموو:(پێغەمبەری خوا ﷺ بالاّ بەرزێكی ئاشكەرا نەبوو، زۆر سپی نەبوو، گەنم ڕەنگ (أسمر) نەبوو، قژی لوولیەكی بەهێزی تێدا نەبوو خاویش نەبوو، لە سەرەتای چل ساڵیدا خوای گەورە ناردی، دە ساڵ لەمەكەدا مایەوەو، دە ساڵیش لە مەدینە، لە سەرەتای شەست ساڵیدا گیانی سپاردو، لە سەری‌و ڕیشیدا بیست تاڵی مووی سپی نەبوو).

صحيح ٢_: وعنة قال:((كان رسول الله صلى الله عليه وسلم رَبْعَة ً،[8] ليس بالطويل ولا بالقصير، حسن الجسم، وكان شعرُه ليس بِجَعْد ولا سَبط، اسمَر اللون، إذا مشى يتكفّأ)).[9]

٢_ لە هەمان هاوەڵەوە فەرموویەتی: (پێغەمبەری خوا ﷺ بالاّ مامناوەند بوو، نە درێژبوو نە كورت،چاك‌و جوان جەستە بوو، گەنم ڕەنگ (اسمر) بوو، لە ڕۆیشتندا دەچەمایەوە بۆ پێش).

صحيح ٣ _عن البراء بن عازب يقول: ((كان رسول الله صلى عليه وسلم رَجِلاً مربوعا، بُعَيدَ ما بين المنكبين، عظيم الجُمّة[10] إلى شحمة أذنيه، عليه حُلّة حمراء[11] ما رأيت شيأ قط أحسن منه)).

---

[7] _ أخرجه البخاري في ((صفة النبي صلى الله عليه وسلم))، وفي ((الباس)). ومسلم في ((الفضائل / باب : صفة شعر النبي صلى الله عليهء سلم)) ح ٢٣٣٨، والمؤلف في ((اللباس)) رقم ١٧٥٤ و((المناقب)) ٣٦٢٧ والنسائي في ((الزينة)) ومالك في ((الجامع)).

[8] _ رَبْعةً: بفتح الراء وسكون الباء : واتە بالاّ مامناوەند بوو لە نێوان درێژی‌و كورتیدا.

٩ _ يتكفأ : گوتم : واتە دەچەمایەوە بۆ پێش هاوشێوەی كەشتی لە ڕۆیشتنیداو، لە فەرموودەكەی (علی) داهاتووشدا بە ژمارە (٤) ئەم زیادەیەی تێدایە : ((هەروەكو لە لێژیەك بچێتە خوارەوە)).

[3] _ والحديث أخرجه البخاري ومسلم في ((الفضائل)) برقم ٢٣٣٧ وأبوداود في ((اللباس)) برقم ٤٠٧٢ والنسائي وابن ماجة برقم ٣٦٩٩ والمؤلف في ((اللباس)) برقم ١٧٢٤.

[10] _ (رَجِلاً) بكسر الجيم : وەسفێكە بۆ پرچ. (بُعَيد) بضم الباء : واتە دوور (الجُمّة) بضم الجيم وتشديد الميم : بریتیە لەو پرچەی بەر دەبێتەوەو دەگاتە هەردوو شان.

وفي رواية عنه قال:((ما رأيت من ذي لِمَّةٍ في حلة حمراء أحسن من رسول الله صلى الله عليه وسلم، له شعر يَضربُ منكبيه، بُعَيد ما بين المنكبين، لم يكن بالقصير ولا بالطويل)).

٣ _ بەرائى كورى عازب دەفەرموويت:((پێغەمبەرى خوا ﷺ پرچێكى نەخاوو نەلولى هەبو، بالا مامناوەند، نێوان هەردوو شانى پان بوو، پرچێكى زلى هەبوو تا نەرمەى گوێى، دوو پۆشاكى سوورى پۆشیبوو هەرگیز شتێكى چاكترو جوانترم هاوشێوەى نەبینیووە)).

لە(ریوایە)تێكى دیكەشدا فەرموویەتى:((هیچ خاوەن پرچێكى درێژم نەبینیوە لە نەرمەى گوێى تێپەڕ بووبێت دوو پۆشاكى سوورى پۆشیبێت جوانتر لە پێغەمبەرى خوا ﷺ پرچێكى هەبوو دەیدا لە هەردوو شانىو نێوان هەردو شانى پان بوو، نەكورت بوو نەدرێژ)).

صحيح ٤ _ عن علي بن ابي طالب قال: ((لم يكن النبي صلى الله عليه وسلم بالطويل ولا بالقصير، شَثْنُ[١٢] الكفَّين والقدمين، ضَخمُ الرأس، ضخمُ الكراديس،[١٣] طويل المَسْرُبة،[١٤] إذا مشى تكفّأ تكفُّؤا كأنما ينحَطّ من صَبَب،[١٥] لم أر قبله ولا بعده مثله صلى الله عليه وسلم)).

---

(اللمة) : ئەو پرچەیە لە نەرمەى گوێ تێپەڕ بوبێتو، (الوفرة)شى پێدەگوترێت.

[١١] _ الحُلة : دوو پۆشاكە، ئیزارو سەرجل (إزار ورداء).

[٤] _ وأخرجه المؤلف في ((المناقب)) برقم ٣٦٤١.

(قلت : وقال : ((حديث حسن صحيح))، وصححه الحاكم أيضاً(٢/٦٠٦) ووافقه الذهبي، وسنده ضعيف، لكن له طرق أخرى يتقوى بها عند أحمد (٨٩/١ و٩٦ و١٠١ و١١٦ و١١٧ و١٢٧ و١٣٤ و١٥١) وأبن سعد في ((الطبقات))

(٤١٠/١_٤١٢) وجملة ((شثن الكفين والقدمين)) مع الجملة الأخيرة منه في (صحيح البخاري) (كتاب اللباس)) من حديث أنس).

[١٢] _ شَثْـن : واتە پەنجەكانىو بەر لەپى زبر بوون.

[١٣] _ الكراديس : بریتیە لە سەرى ئێسكەكان.

[١٤] _ المَسرُبة : ئەو مووە وردەیە كە لە سنگەوە دەست پێدەكاتو بەناوك كۆتاى دێت.

٤ _ لە علی کوڕی ئەبی تاڵیبەوە دەفەرمووێت:((پێغەمبەری خوا ﷺ نەدرێژ بووو نەکورت، هەردوو دەستیو هەردوو پێی زبر بوون، سەری گەورەبوو، سەر ئێسکەکانی گەورەبوون، موو سینەی بۆ سەر ناوکی درێژ بوو، ئەگەر ڕێی بکردبا دەچەمایەوە بۆ پێش چەمانەوەیەك هەروەکو لە لیژیەك بچێتە خوارەوە، نە لە پێشیو نە لە پاشیدا هاوشێوەیم نەبینیوە)).

ضعيف [٥] _ أبراهيم بن محمد[١٦] من ولد علي بن أبي طالب رضي الله عنه قال: كان علي إذا وصف رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لم يكن رسولُ الله صلى الله عليه وسلم بالطويل المُمَغَّط،[١٧] ولا بالقصير المتَرَدِّد، وكان رَبعة من القوم، لم يكن بالجعد القطط، ولا بالسَّبِط كان جعدا رجِلا، ولم يكن بالمُطَهَّم، ولا بالمكلثم، وكان في وجهه تَدْوير، ابيضَ، مُشربُ، أدْعَجُ العينين، أهدب الاشفار، جليلُ المُشاش وألكَتد، أجردُ ذو مَسْرُبَة، شَثْن الكفين والقدمين، إذا مشى تقلّع كأنما ينحط من صَبَب، واذا التفت التفت معا، بين كتفيه خاتم النبوة، وهو خاتم النبيين، أجود الناس صدرا، واصدق الناس لهجة وألينهم عريكة، وأكرمُهم عِشرة،[١٨] مَن رآه بديهة هابه، ومن خالطه معرفة أحبه

---

(گوتم : هەمان وشە لە ڕاڤەکردنی فەرموودەکەی (علی) دا بەم نزیکانە دێتە پێشەوە ).

[١٥] _ الصبب : هەر بەشێکە لە زەوی نزم بێتەوە و بچێتە خوارەوە، واتە: لێژی.

[٥] _ رواه المؤلف في ((المناقب)) برقم ٣٦٤٢.

(قلت : وقال : ((حديث حسن غريب، ليس إسناده بمتصل))).

قلت : فلا وجه إذن لتحسين إسناده مع إنقطاعه، فكيف وفيه عمر بن عبدالله مولى غفرة وهو ضعيف كما في ((التقريب)) ومن طريقه أخرجه إبن سعد ٤١٠/١).

[١٦] _ کوڕی محمدی کوڕی ئەلحەنەفیە، (ئەلحەنەفیە ) ش کەنیزەیەکی (أمة) علی بوو لە دیلکراوەکانی بەنی حەنیفە، ناوی خەولەیە و کچی جەعفەری کوڕی قەیسی ئەلحەنەفیە .

(الولد) بفتحتين إسم جنس، أو بضم وسكون إسم جمع، لكن الأول هو الرواية.

[١٧] _ المُمَغَّط " بضم الميم الأول وفتح الميم الثاني، وفتح الغين المشددة.

[١٨] _ لە نو سخەیەکدا (عشيرة)یە .

(گوتم : ڕاست یەکەمە چونکە پێشەوا ئەلئەصمەعی لە ڕاڤەکردنی ئەم فەرموودەیەدا ئاماژەی بۆ دەکات ) .

٥ _ ئیبراهیمی كوڕی محمد لە كوڕانی عەلی كوڕی ئەبی طالب ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: هەركات عەلی كوڕی ئەبی طالب وەسفی پێغەمبەری خوای ﷺ بكردایە دەیفەرموو: (پێغەمبەری خوا ﷺ بالاّ بەرزێكی كشاو نەبوو، كورتە بالاّیەكی بچوكیش نەبوو، بالاّ مامناوەندی كەسانی دەوروبەری بوو، پرچی زۆر لول نەبوو، خاویش نەبوو، بەلاّم لوول بوو بە چەمانەوەیەكی كەم، قەلّەوێكی گۆشتن نەبوو، گوپن نەبوو، خڕیەك لە ڕوویدا بوو سپی تێكەلّ بە سوورایی، چاوەكانی ڕەشی گەش بوون، برژانگی لێوار پێێلّوەكانی چاوی درێژ بوون، سەر ئێسكەكانی هەردوو شانیو نێوان هەردوو شانی گەورە بوون، جەستەی بێتووك بوو جگە لە توكێكی ورد لەسەر سینەوە بۆ ناوك، هەردوو دەستیو هەردوو پێی زبر بوون، بە هێز ڕێی دەكرد هەروەكو لە لێژیەك بچێتە خوارەوە، ئەگەر ئاوڕی بدابایەوە پێكەوە ئاوڕی دەدایەوە، مۆری پێغەمبەرایەتی لە نێوان هەردوو شانیدا بوو، كە دوایین پێغەمبەرانە، چاكترینو فراوانترینی خەلّك بوو لە سنگەوە، ڕاستگۆترینی خەلّك بوو لە زمانەوە، نەرمونیانترینیان بوو لە خووڕەشتەوە، ڕێزلێناترینیان بوو لە هاوڕیەتیدا، هەر كەس لەپڕ تەماشای بكردبا بە گەورەو شكۆمەندی دادەناو، هەركەس بە ناسیاوی تێكەلّی بكردبا خۆشی دەویستت.

یقول ناعِتُـه[١٩]: لم أرَ قبلـه ولا بعده مثـله (صلى الله عليه وسلم).

---

[١٩] _ ناعِتُـه : واتە وەسفكاری.

ئەبو عیسا دەفەرمێت : گوێبیستی ئەبا جەعفەری محمدی كوڕی حسین بووم دەیگوت : گوێبیستی ئەلئەصمەعی بووم لە ڕاڤەكردنی سیفەتی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دەیفەرمو: (الممغط): واتە بالاّ بەرزێكی كشاو، گوێبیستی كەسێكی بیاباننشین بووم لە قسەكانیدا دەیگوت : تمغط في نشابته: واتە تیرەكەی درێژكردەوە بە درێژیەكی زۆر .

(المتردد) : واتە چوبێتە نێویەكەوە لە بچوكیدا، زۆر كورت.

(القطط) : واتە زۆر لول.

(الرجِـل) : واتە ئەو كەسەی لە پرچیدا چەمانەوە هەیە، واتە نوشتانەوەیەكی كەم.

(المطهم) : واتە قەلّەوێكی گۆشتن.

(المكلثم) : واتە ڕووخڕ.

(المشرب) : واتە سپی تێكەلّ بە سورا.

(الأدعج) : واتە چاوی ڕەش، ڕەشی گەش.

وەسفکاری دەڵێت: نە لە پێشیو نە لە پاشیدا هاوشێوەی ئەوم نەبینیوە ﷺ.

ضعيف جدا [٦] _ عن الحسن بن علي رضى الله عنهما قال: سألت خالي هندَ بنَ أبي هالة،[٢٠] وكان وصّافا عن حلية النبي صلى الله عليه وسلم، وأنا أشتهي أن يصف لي شيئا أتعلق به فقال: ((كان رسول الله صلى الله عليه وسلم فَخْماً مفخَّما، يتلألأ وجهه تلألوء القمر ليلة البدر، أطولَ من المربوع، وأقصرَ من المُشَذَّب، عظيمَ الهامة، رجِلَ الشعر، إن أنفرقت عقيقت[٢١] فَرَقَـها، وإلا فلا يجاوز شعره شحمة أذنيه إذا هو وفره، أزهَر اللون، واسع الجبين، أزجَّ[٢٢] الحواجب سوابغَ في غير قرن،[٢٣] بينهما

---

(الأهداب) :واتە برژانگ لێوار پێلوەکانی چاوی درێژ بوو، برژانگ درێژە .

(الكتد) : واتە کۆبونەوەی هەردوو شان کە نێوان هەردوو شانە.

(المسربة) : مەسروبە توکێکی ووردە وەکو توڵ درێژ دەبێتەوە لەسەر سینەوە بۆ ناوك .

(الشـثـن) : زبری پەنجەکانی دەستو پێ.

(الـتـقـلـع) : واتە بە گورجوگۆڵی، بەهێز ڕێبکات.

(الصبب) : واتە لێژی.

وقوله : (جليل المشاش) : يريد رؤوس المناكب.

واتە مەبەستی سەر ئێسکەکانی هەردوو شانە. (العشيرة) : واتە هاوڕێیەتی. (العشير) : واتە هاوڕێ.

البديهة : المفاجأة : يقال : بدهته أمر أي فجأته : واتە کوتوپڕ، لە پڕ دەگوترێت ؛ لە پڕدا شتێکم بۆ بە ئەنجام گەیاند واتە لە پڕدا.

[٦] _ تـفـرد بە المؤلف ورواه الطبراني والبيهقي. (قـلـت إسناده ضعيف جداً)، وله علـتـان بينتهما في ((الصحيحة)) (٢٠٥٣)، وقد أخرجت فيه شاهداً لطرفه الأول، وقد رواه البيهقي في ((الدلائل)) من طريق أخرى، لكن فيه علي بن جعفر بن محمد، سكت عنه في ((الـكاشف))، وقال في ((الميزان)) : ((ما رأيت أحداً لـيـَّـنهُ، نعم ولا من وثـقـه)). قـلـت : وساق له حديثاً آخر في فضل أهل البيت استـنـكره جدا، ولذلك خرجته في ((الضعيفة)) ٢١٢٢).

٢٠ _ لە ڕاستیدا هند خاڵی حەسەن بوو چونکە برای دایکی بوو لە دایکەوە، چونکە هند کوڕی خەدیجە بوو کە دایکی فاطمەیەو دایکی هندیشە، ئەم هندە لە جەنگی (الجمل) لەگەڵ ئیمامی عەلیدا بوو کوژرا.

[٢١] _ لێرەدا مەبەست بە (عـقـيقة):ئەو پرچەیە کە بە پێشی سەرەوەیە، واتە دەیکرد بە دوو بەشەوەو دایدەهێنا بەملاو بەولادا.(گوتم: لە (ڕیوایە )تێکدا بە (عفيصتـە) بالصاد المهملة بدل القاف الثانية، هاتووە، کە بریتیە لە پارچەیەك پرچ ئەگەر بچەمێنرێتەوەو بهۆنرێتەوە. مەبەست پرچی کورتکراوەیەتی. گوتراوە ئەم (ڕیوایە )تە شیاوترە. پێشەوا القاري باسیکردوە ) .

[٢٢] _ أزج : واتە برۆ کەوانە.

عرق يُدِرُّه الغضبُ،[٢٤] أقنى ألعِرْنَيْن،[٢٥] لَهُ نور يعلوهُ، يحسبه من لم يتأمله أشمّ، كَثَّ اللحية، سهلَ الخدين

٦ _ لە حەسەنی کوڕی عەلیەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: لە هیندی ئەبی هالەی خاڵم پرسی، کە وەسفکارێکی باشی دیمەنی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ، منیش خوازیاری وەسفکردنی شتێکی بووم پێوەی پەیوەندبم ئەوەبوو فەرمووی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ شکۆدارو ڕێزلێنراو بوو، ڕووی دەدروشایەوە وەك دروشانەوەی مانگ لە شەوی چواردەدا، درێژتر بوو لە بالاّ مامناوەند، کورتر لە درێژ (المشذب)، سەری گەورە بوو، پرچی نەزۆر لول بووو نەخاویش بوو، ئەگەر پەرچەمی جیابکردایەوە دایدەهێنا بەملاو بەولادا، ئەگینا پرچی نەرمەی گوێی تێنەدەپەڕاند هەرکات درێژی بکردایە، سپی ڕوو ڕۆشن، تەوێڵ پان، برۆ کەوانەی تەواو بەبێ بەیەك گەیشتن، خوێنبەرێك لە نیوانیاندا بوو تووڕەبوون پڕی دەکرد، لووت درێژی قەراخ وورد، ڕوناکیەکی بەسەردا بەرز ببۆوە، بەبێ بیرلێکردنەوە بەوردی هەموو کەسێك وای دادەنا بەرزبوونەوەیەکە لە کۆڵەکەی لوتیداو ڕێکی سەرەوەیدا، ڕیش چڕ، ڕوومەت تەخت.

ضليعَ الفم[٢٦] مفلجَ الأسنان،[٢٧] دقيق ألمَسرُبة،[٢٨] كأن عنقه جِيد دُمية، في صفاء الفضة،[٢٩] معتدَل الخلق، بادن متماسك،[٣٠] سواءُ البطن والصدر، عريضُ الصدر،

---

[٢٣] _ سوابغ : واتە تەواو، (القَرَن) بالتحريك : واتە جووت بوونی هەردوو برۆ بە جۆرێك قەراخەکانی بگەن بەیەك.

[٢٤] _ يدره الغضب : واتە تورەیی پڕی دەکرد.

[٢٥] _ أقنى العرنين : واتە لوت درێژ لەگەڵ ووردی قەراخەکانیدا. (العرنين) بكسر العين، گوتراوە : بەشە ڕەقەکەی لوتەو گوتراویشە : سەراپای لوتە.

[٢٦] _ واتە فراوان، ئەوەش بەلای عەرەبەوە ستایشکراوە چونکە فراوانیەکەی بەڵگەی زمان پاراویە.

[٢٧] _ الفلج : کەلەبەریەکە لە نێوان ددانەکاندا، ددان شاش.

[٢٨] _ المسربة : تووکێکی ووردە لە سینەوە بۆ ناوك.

[٢٩] _ الجيد : واتە گەردەن مل، (دمية): شێوەیەکی دروستکراوە لە (عاج) یا شتیتر، مەبستیش بەوە ڕاستیو جوانی دیمەنو تەواویو ڕوناکیەتی.

بعيدُ ما بين المنكبين، ضخم الكراديس، أنور المتجَرَّد،[٣١] موصول ما بين اللبَّة والسرة بشعر يجري كالخَط، عاري الثديين والبطن مما سوى ذلك، أشعر الذراعين والمنكبين واعالي الصدر، طويل الزندين، رَحب الراحة، شَثْن الكفين والقدمين، سائل الاطراف، أو قال: شائل الاطراف،[٣٢] خُمصان الاخمصَين،[٣٣] مسيح القدمين[٣٤] ينبو عنهما الماء، إذا زال زال قلعاً، يخطو تكفيا[٣٥] ويمشي هونا، ذريع[٣٦] المشية، إذا مشى كأنما ينحط من صبب، وإذا التفت التفت جميعا، خافض الطرف، نظره إلى الارض أطول من نظره إلى السماء، جلُّ نظره الملاحظة، يسوق اصحابه،[٣٧] ويبدر[٣٨] من لقي بالسلام.

زار فراوان، ددان شاش، تووكى ووردى لەسەر سینەوە بۆ ناوك وورد بوون، گەردەنى وەكو ملى بووكە شوشە وابوو، لە ڕوونى زيودا، پێكهاتە مامناوەند، قەڵەو يەككگرتوو، سكۆ سينەى يەكسان بوون، سينە پان، نێوان هەردوو شانى پان بوو، سەر ئێسكەكانى هەردوو شانى گەورە بوون، ئەندامى بێتووك يا بێبەرگ دەدرەوشايەوە، نێوان كەلێنى سينەو ناوكى بەتوكێك بە يەك دەگەشت هاوچەشنى هێـڵێكى دەكرد، بەدەر لەوە هەردوو مەمكىو سكى ڕووت بوون، بەڵام هەردوو

---

[٣٠] _ البادن : واتە قەڵەو بە قەڵەوييەكى مامناوەند بە بەڵـگەى ئەوەى دەڵـێت : (لم يكن بالمطهم) واتە قەڵەوێكى گۆشتن نەبوو.

[٣١] _ أنور المتجرد : واتە ئەندامى ڕووتى بێتووكى يا بێ پۆشاكى ڕوناك بوو.

(اللـُبة) بفتح الام : جێگەى بۆشايى سەرەوەى سـنـگە خوارووى ملو نێوان هەردوو چەڵەمە.

[٣٢] _ گومانێكە لە كەسى فەرموودەگێڕەوە. (السائل) : واتە درێژ. (الشائل)يش هەمان ماناى هەيە .

[٣٣] _ أخمص القدم : ئەو شوێنەيە كە بەر زەوى ناكەوێ لە كاتى پێ پێناناندا (عند الوطء)و لە ناوەڕاستى پێدايە. (خمصان) لەسەر كێشى عوسمان. مەبەستيش بەوە زۆرى دووركەوتنەوەيەتى لە زەوى.

[٣٤] _ مسيح القدمين : واتە لوسترينيانو تەخترينيان. (ينبو عنهما الماء) واتە ئەگەر ئاو برژێت بە سەرياندا بە خێرايى تێدەپەڕێت لە سافو لوسياندا.

[٣٥] _ واتە ئەگەر ڕێى بكردايە بەهێز پێكانى بەرز دەكردەوەو، لە نوسخەيەكيشدا بە (تـكـفؤاً) هاتووە كە سەلماندنى ئەوەى پێشەوەيەتى.

[٣٦] _ ذريع : واتە هەنـگاو فراوان. (الصبب) هەر زەوييەكە ليژبێت .

[٣٧] _ يسوق أصحابه : واتە هاوەڵانى پێش دەخستو، خۆى لە دوايانەوە ڕێى دەكرد.

[٣٨] _ يبدر: في نسخة يبدأ.(قلت : ولعلها الصواب، فإنه كذلك وقع في ((البداية)) من رواية يعقوب بن سفيان.

قۆڵـیو شانیو بەرزایەكانی سینەی تووكن بوون، هەردوو بازوو درێژ، بەر لەپ فراوان، هەردوو دەستو پێ زبر، چوار لا درێژ (سائل الأطراف)، بن هەردوو پێ قوڵ، هەردوو پێی تەختو لووس بوون ئاوی بەسەركراویان لێ دوور دەكەوتەوە، لە رێـــكردندا گورجوگۆڵ بوو، بەهێز پێی بەرز دەكردەوە، بە هێمنیو مەندی رێی دەكرد، هەنگاوی فراوان بوو، ئەگەر رێی بكردبا هەروەكو ئەوە بوو لە لێژیەك بچێتە خوارەوە، ئەگەر ئاوڕی بدابایەوە پێكەوە ئاوڕی دەدایەوە، چاونزمكار، تەماشاكردنی بۆ زەوی درێژتر بوو لە تەماشاكردنی بۆ ئاسمان، بەشی زۆری تەماشاكردنی چاودێریكردن بوو، هاوەڵانی پێشدەخستو خۆی لە دوایانەوە رێیدەكرد، چاوی بە هەركەس بكەوتایە دەستـپـێـشـخەری دەكرد لە سەلامكردندا.

﴿قال: فقلت: صف لي منطق رسول الله صلى الله عليه وسلم قال:((كان رسولُ الله صلى الله عليه وسلم متواصلَ الأحزان، دائمَ الفكرة، ليست له راحة، طويل السّكت، لايتكلم في غير حاجة، يفتح الكلامَ ويختمه باسم الله تعالى،[٣٩] ويتكلم بجوامع الكَلِم، كلامه فَصْلٌ، لا فضول ولا تقصير.ليس بالجافي ولا المهين، يعظم النعمة وإن دقت، لا يذم منها شيئا، غير أنه لم يكن يذم ذَواقا[٤٠] ولا يمدحه. ولا تغضبه الدنيا ولا ما كان لها، فإذا تـُعُدّي الحقُّ لم يقم لغضبه شيء حتى ينتصر له، ولا يغضب لنفسه، ولا ينتصر له.وإذا أشار أشار بكفه كلها، وإذا تعجب قـَلـَبَها، وإذا تحدث اتصل بها،[٤١] وضرب براحته اليمنى بطن إبهامه اليسرى. وإذ غضب أعرض وأشاح، وإذا فرح غض طرفه. جلّ ضحكه التبسم، يُفتر عن مثل حب الغمام))﴾.[٤٢]

﴿ فەرمووی: گوتم: وەسفێكم سەبارەت بە ئاخاوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بكە فەرمووی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە پەژارەدار بوو، بەردەوام لە

---

[٣٩] _ في نسخة : ((ويختمه بـأشداقـه)) وهي رواية للطبراني.

[٤٠] _ الذواق : الـمأكل والمشرب : واتە خواردنو خواردنەوە.

[٤١] _ واتە بەدەستی، بەمانای فەرمایشتەكانی جووتی جوڵاندنی دەستی دەكردو ئەوەشی بەگوفتاری (وضرب...) روون كردۆتەوە .

[٤٢] _ الغمام : واتە هەور، (حب الغمام) واتە تەرزە كە دانە سپیەكانی پێچواندوە.

تێڕاماندا بوو، سرەوتنی نەبوو کەم دوو بوو، بەبێ پێویستی قسەی نەدەکرد، بە ناوی خواوە دەستی بە قسەکردن دەکردو کۆتایی پێدەهێنا بە ناوی خوای گەورە، بە قسەی کورتو پڕمانا دەدوا، قسەکردنی یەکلاکەرەوە بوو، نە بێسوودو نە خۆتێهەڵقورتێنو نە کەمتەرخەم.نەفەرامۆشکارو نەڕیسواکاریش بوو، ڕێزی نیعمەتی دەگرت ئەگەر بچوکیش بوایە، زەمی هیچ شتێکی لێنەدەکرد، بەڵام نەزەمی خۆراکو خواردنەوەی دەکردو نەستایشی (مدح) دەکرد. نەدونیاو نەئەوەشی بۆ دونیا بوو توڕەی نەدەکرد، هەرکات هەق پێشێل بکرایە هیچ شتێك توڕەبونەکەی دانەدەمرکاندەوە تا دەچوو بە هانایەوەو یارمەتی دەداو سەری دەخست، بەڵام بۆ خودی خۆی نەتوڕە دەبوو، نەخۆشی زاڵ دەکرد. ئەگەر ئاماژەی بکردایە بە هەموو دەستی ئاماژەی دەکردو، ئەگەر سەری سوڕ بمابا دەستی هەڵدەگێڕایەوەو، بۆ ئاخاوتنیش پەیوەندی بەدەستیەوە دەکردو، بەرلەپی ڕاستێ دەکێشا بە سکی پەنجە گەورەیدا. هەرکات توڕە بوایە ڕووی وەردەگێڕاو خۆی لادەداو، کە دڵخۆشیش دەبوو چاوەکانی دادەنواند. بەشی زۆری پێکەنینی زەردەخەنە بوو، ددانەکانی هاوشێوەی دەنکە تەرزە دەردەکەوتن)) ﴾.

﴿ قال الحسن: فكتمتها الحسينَ زمانا ثم حدّثتُه فوجدته قد سبقني إليه فسأله عما سألته عنه ووجدته قد سأل أباه عن مَدخله ومَخرجه وشَكله فلم يدع منه شيئا. قال الحسين: فسألت أبي عن دخول رسول الله صلى الله عليه وسلم فقال:((كان إذا أوى إلى منزله جَـزّأ دخوله ثلاثة أجزاء جزأ لله وجزأ لأهله وجزأ لنفسه ثم جَزّأ جُزأه بينه وبين الناس فيرد ذلك بالخاصة على العامة[٤٣] ولا يدخر عنهم شيئا. وكان من سيرته في جزء الأمة إيثارُ أهل الفضل بإذنه وقَسمه على قدر فضلهم في الدين فمنهم ذوالحاجة ومنهم ذو الحاجتين ومنهم ذو الحوائج فيتشاغل بهم ويشغلهم فيما يصلحهم والامة من مسائلتهم عنه وإخبارهم بالذي ينبغي لهم

---

[٤٣] _ مەبەست بە (الخاصة) ئەو هاوەڵانە بوون کە زۆر دەچوونە ژورەوە بۆ لای وەکو چوار جێنشینەکە بەڵام مەبەست بە (العامة) ئەوانە بوون کە ڕانەهاتبوون بچنە ژوورەوە بۆ لای.

لێرەدا (خواص) لێوەی فێردەبوونو ڕاگەیەندکاریشی بوون بۆ ئەوەی دەمایەوە لە جەماوەری خەڵك.

ويقول:((ليبلغ الشاهد منكم الغائب وأبلغوني حاجة من لا يستطيع إبلاغها فإنه من أبلغ سلطانا حاجة من لا يستطيع إبلاغها ثبّت الله قدميه يوم القيامة))[+] لا يذكر عنده إلا ذلك ولا يقبل من أحد غيره يدخلون رُوّادا[٤٤] ولا يفترقون إلا عن ذَواق[٤٥] ويخرجون أدلة[٤٦] يعني على الخير.

﴿ حەسەن فەرمووی: ماوەیەك ڕازپارێزیم لە حوسێن كردو، پاشان بۆم گێڕایەوە، بینیم لێیپرسیبوو هاوشێوەی ئەوەی من لێم پرسیبوو، لە بابی پرسیبوو سەبارەت بە چۆنیەتی چوونە ژوورەوەو هاتنە دەرەوەو ڕوخساریو، هیچ شتێكی بیر نەچووبوو. حوسێن فەرمووی: لە بابم پرسی سەبارەت بە چۆنیەتی چوونە ژوورەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بوو فەرمووی: ((ئەگەر چووبایەتەوە بۆ ماڵەكەی خۆی چوونەوەكەی بەش بەش دەكرد بۆ سێ بەش، بەشێكی بۆ خواو، بەشێكی بۆ خێزانەكانیو، بەشێكیشی بۆ خۆی، پاشان بەشەكەی خۆی كەرت دەكرد لە نێوان خۆیو خەڵكداو، بەوەش هاوەڵـە نزیكەكانی لێوەی فێردەبوونو بە خەڵكی ئاسایان ڕادەگەیاندو، هیچ شتێكی لێ پەنهانی نەدەكردن، لە بەشی ئومەتدا ڕەفتاری بریتی بوو لە پەسەندتر كردنی (إیثار) خاوەن چاكەكان بوو بە ئیزنو مۆڵەتی خۆی، هەڵسەنگاندنو تێڕوانینی بۆ كاركردن لە نێوانیاندا لەسەر ئاستی چاكەو ڕێزداریان بوو لە ئایندا، چونكە تیایاندا خاوەن پێداویستیەك بوو، تیایاندا خاوەن دوو پێداویستی بوو، تیایاندا خاوەن چەندین پێداویستی بوو، خۆی بەكارەكانیانەوە سەر قاڵ دەكردو، خەریكیشی دەكردن بەوەی لەبەرژەوەندیان دایە، وێڕای بە هاناوەچوونی پێداویستیەكانی تری ئوممەتو ئامۆژگاریشی دەكردن بەوەی پێویستیان پێی بوو دەیفەرموو: ((با ئامادەبوو بیگەیەنێت بە نەهاتوو،

---

+ _ من قوله : ((أبلغوني...)) إلى هنا طريق أخرى عن علي، لكن إسناده ضعيف جداً، ولذلك أوردته في ((الضعيفة)) ١٥٩٤.

٤٤_ الرواد : جمع رائد، لە بنچینەدا ئەو كەسەیە كە پێشی كۆمەڵەكەی دەكەوێتو چاو دەگێڕێت بۆ دۆزینەوەی لەوەرگاو جێكەوتی ئاو، لێرەدا مەبەست گەورە هاوەڵانی پێغەمبەرە ﷺ.

٤٥ _ واتا زۆر لای دەمانەوەو نەدەڕۆیشتن تا زانستێكی زۆری لێ فێر دەبوون.

٤٦ _ واتە ڕێنـماكار بۆ خەڵك .

پێداویستی ئەو کەسانەم پێـڕاگەیەنن کە خۆیان توانای گەیاندنیان نییە، دڵـنیابن ئەو کەسەی پێداویستی یەکێك بگەیەنێت بە فەرمانڕەوایەك کە خۆی توانای گەیاندنی نەبێت خوای تعالی پێیەکانی جێگیر دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا)).

جگە لەوە باسێکی تر نەدەکرا، بەدەر لەوەش لە کەس هیچی تری قبوڵ نەبوو، پێـشەنـگان (هاوەڵە بەرزەکان) دەچونە ژوورەوەو جیانەدەبوونەوە تا دوای وەرگرتنی زانستیکی زۆر، ئەوجا ڕێنماکاری خەڵکیش دەردەچون بۆ خەیرو چاکەکاری.

قال: فسألته عن مخرجه كيف يصنع فيه؟ قال: كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يَخزِنُ([٤٧]) لسانَه إلا فيما يعنيه، ويؤلِّـفهم ولا ينفّرهم،([٤٨]) ويكرم كريمَ كلِّ قوم ويوليه عليهم، ويحذر الناس ويحترس منهم من غير أن يطوي عن أحد منهم بِـشرَه وخُلُقه.ويتـفقد أصحابه، ويسأل الناسَ عمّا في الناس، ويحسّن الحسن ويقويه، ويقبّح القبيح ويوهيه.معتدل الامر غير مختلف، لا يغفل مخافة أن يغفلوا أو يميلوا، لكل حالٍ عنده عتاد، لايقصر عن الحق ولا يجاوزه.﴿ الذين ﴾ يلونه من الناس خيارهم، أفضلهم عنده أعمهم نصيحة، وأعظمهم عنده منزلة أحسنهم مواساة ومؤازرة.قال: فسألته عن مجلسه، فقال:كان رسول الله صلى الله عليه وسلم لا يقوم ولا يجلس إلا على ذكر، وإذا انتهى إلى قوم جلس حيث ينتهي به المجلس، ويأمر بذلك.يعطي كل جلسائه بنصيبه، لا يحسب جليسه أن أحدا أكرمُ عليه منه، مَن جالسه أو فاوضه في حاجة صابرهُ حتى يكون هو المنصرف عنه، ومن سأله حاجة لم يردّه إلا بها، أو بميسور من القول، قد وسع الناس بسطه وخُلُـقه، فصار لهم أبا، وصاروا عنده في الحق سواء.

---

٤٧ _ يحزن : واتە دەیگرت. قەدەغەی دەکرد .

٤٨ _ خوای تعالی وەسفی دەکات بە گوفتاری: ((ولو كنت فظاً غليظ القلب لانفضوا من حولك)). آل عمران /١٥٩.

واتە : ئەگەر توڕەو قسەڕەقو بێ بەزەیی بویتایە، ئەوە هەموویان لە دەورت بڵاویان دەکرد. تەفسیری ئاسان .

گوتی: پرسیارێکم ئاراستەکرد سەبارەت بە چوونە دەرەوەی کەچی تێدا ئەنجام دەدا؟ فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم زمانی دەگرت مەگەر پەیوەندی بەوەوە بوایە، رێکیدەخستن‌و پەرتەوازەی نەدەکردن، رێزی لەبەرێزی هەر قەومێك دەناو دەیکرد بە دەستەلاتداریان، خەلکی ئاگادار دەکردەوەو خۆی لێ دەپاراستن بەبێ ئەوەی شادی‌و میهرەبانی‌و زانستی خۆی لە کەسێکیان بشارێتەوە. دیدەنی هاوەلانی دەکرد، لە خەلکی دەپرسی سەبارەت بەوەی لە خەلکدایە، چاکی چاك دەکردو بەهێزی دەکرد، خراپیشی ناشرین دەکردو سووکی دەکرد. لە کاروباریدا مامناوەند بوو جیاواز نەبوو، فەرامۆشی نەدەکردن نەوەك بێئاگابن یا دوورکەونەوە، بۆ هەر بارودۆخێك کەرەستەی هەبوو، کەمتەرخەمی لە هەق نەدەکردو بە سەریشیا تێپەڕ نەدەبوو.

﴿ئەوانەی﴾ پشتگیریان دەکردو شوێنی دەکەوتن چاکەکانیان بوون، چاکترینیان بەلایەوە سەرتاپاگیرترینیان بوو لە ئامۆژگاریدا، پلەوپایەدارترینیان (منزلە) بە لایەوە چاکترینیان بوو لە دلنەوای‌و یارمەتیداندا. گوتی: سەبارەت بە چۆنیەتی دانشتنی لێم پرسی، فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ رانەدەوەستاو دانەدەنیشت بەدەر لە یادی (ذکر) خوای تعالى، ئەگەر بگەیشتایە بە کۆمەلێك دادەنیشت لە هەر کوێ کۆتای پێ بهێنابایە شوێنی دانیشتنەکەو بەوەش فەرمانی دەکرد. هەموو ئەوانەی لەگەلیدا دادەنیشتن بەشی خۆیانی دەدانێ، ئەوەشی لەگەلیدا دادەنیشت وای دانەدەنا یەکێکی تر هەبێ بەلایەوە بەرێزدارتر بێت جگە لە خۆی، هەرکەس لەگەلیدا دادەنیشت یا گفتوگۆی دەکرد لە پێداویستیەکدا لەو بە ئارامتر دەبوو تا ئەو دەستی لێ هەلدەگرت‌و دەرۆیشت، هەرکەس پرسیاری پێداویستیەکی لێبکردایە نەیدەگەڕاندەوە بەبێ ئەو پێداویستیە، یا بە قسەگەلێکی خۆش‌و ئاسان بەرێی دەکرد، دلپاکی‌و ئاسانی‌و خوڕەوشتی بە فراوانی تێکرای خەلکی دەگرتەوە، ببوە بابیان‌و لە هەقدا هەموویان بەلایەوە یەکسان بوون.

مجلسه مجلس علم وحلم وحياء وأمانة وصبر، لا تُرفع فيه الاصوات، ولا تُؤْبَنُ[49] فيه الحرم، ولا تُثنى فلتاته،[50] متعادلين، بل كانوا يتفاضلون فيه بالتقوى، متواضعين، يوقرون فيه الكبير، ويرحمون فيه الصغير، ويؤثرون ذا الحاجة، ويحفظون الغريب))، قال الحسين: سالت أبي عن سيرة النبي صلى الله عليه وسلم في جلسائه؟ فقال: كان رسول الله صلى الله عليه وسلم دائم البِشْر،[51] سهل الخُلُق، لين الجانب، ليس بفظ ولا غليظ، ولا صخّاب، ولا فحّاش، ولا عيّاب، ولا مُشَاحٍ.[52] يتغافل عما لا يشتهي، ولا يُؤيِسُ منه راجيه،[53] ولا يخيّب فيه.

قد ترك نفسه من ثلاث: المِراء،[54] والإكثار،[55] ومالا يعنيه[56]

نیشتگەکەی (مجلس) کۆڕی زانستو میهرەبانی (حلم)و ئەمانەتو ئارامگرتن بوو، دەنگی تێدا بەرزنەدەکرایەوە، پیرۆزەکانی تێدا بە خراپە باس نەدەکرا، ڕازو قسەکانی بڵاونەدەکرانەوە، یەکسانبوون، بەڵکو پێشخستن وپەسەندێتیان (تفاضل) بە خواپەرستی بوو، خاکی بوون، تیایدا ڕێزیان لە

[49] _ (لا تُؤْبَنُ) : واتە عەیبدار نەدەکرا چونکە لە وشەی (الأبن)ەوە هاتووە کە بە مانای عەیب دێت .

[50] _ ولا تثنى فلتاته : واتە بلاونەدەکرایەوەو ڕانەدەگەینرا، وەکو ئەوەی لە (النهاية)دا هاتووە.

[51] _ البِشْر، بكسر الباء وسكون الشين : واتە ڕوخۆشی ودڵخۆشیو گەشانەوە لەگەڵ خەڵکدا

[52] _ مشاح أسم فاعل من باب المفاعلة من الشح وهو البخل. وفي نسخة بدله : ((ولا مداح)). مشاح : واتە دەستقوچاوی.

[53] _ ولا يؤيس منه راجيه : واتە لە چاکەی خۆی کەسی بێئومێد نەدەکرد .

[54] _ المِراء : واتە مشتومڕ، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم فەرموویەتی : ((من ترك المراء وهو محق بنى الله له بيتاً في ربض الجنة)) واتە هەرکەس دەست هەڵبگرێت لە مشتومڕ ئەگەرچی لەسەر هەقیش بێت خوای تعالی ماڵێکی لە سەرەتای بەهەشتدا بۆ دروست دەکات .

[55] _ الإكثار، بالمثلثة : واتە زۆر قسەکردن یا زۆرکردنی ماڵ. لە نوسخەیەکیشدا بە (الإكبار) هاتووە واتە خۆ بەزل دانان لە ڕۆیشتنو دانیشتنو هیدیکەشدا.

[56] _ ما لا يعنيه : لە فەرموودە یەکی تریشدا هاتووە : ((من حسن إسلام المرء تركه ما لا يعنيه)) واتە لە چاکێتی موسڵمان بوونی مرۆ ڤـ دەستهەڵگرتنێتی لە ئەوانەی پەیوەندی بەوەوە نی یە. هەروەها خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت : ((والذين هم عن اللغو معرضون)). المؤمنون: ٣. واتە ئەوانەش کە لە گوفتاری بێسودو کرداری نابەجێو بێهودە دورەپەرێزن. پوختەی تەفسیر.

بەتەمەن دەناو، بەبەزیش بوون بەرامبەر بە بچوکەکان، خاوەن پێداویستیان پێش دەخستو رێزی لێدەنراو، غەریبەشیان دەپاراست))﴾، ﴿حوسێن فەرمووی: سەبارەت بە رەفتاری پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاودانشتانیدا (جلسائە) لە بابم پرسی؟ ئەوە بوو فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام رووخۆش بوو، رەوشتی بەرزو جوان بوو، نەرمو هۆگر بوو، پیاوێکی وشك نەبوو توندو تیژیش نەبوو، دەنگ زلو بە هاتو هاوار نەبوو، بەدرەوشت نەبوو، عەیبكار نەبوو، چروكیش نەبوو.

خۆی بێئاگا دەكرد بەرامبەر بەوەی ئارەزووی لێ نەبوو، لە چاكەی خۆی كەسی بێ ئومێد نەدەكرد، هیوابرپیشی نەدەكردو سەری دەخست.

خۆی دورخستبۆوە لە سێ شت: مشتومڕ، زۆر قسەكردن یا زۆركردنی ماڵ، ئەوەش پەیوەندی بەوەوە نەبوایە.

وترك الناس من ثلاث: كان لا يذم أحدا، ولا يعيبه، ولا يطلب عورته،([57]) ولا يتكلم إلا فيما رجا ثوابه

وإذا تكلم أطرق جلساؤه كأنما على رؤسهم الطير،([58]) فإذا سكت تكلموا، لا يتنازعون عنده الحديث، ومن تكلم عنده أنصتوا له حتى يفرغ، حديثهم عنده حديث أولهم.

يضحك مما يضحكون منه، ويتعجب مما يتعجبون منه، ويصبر للغريب على الجفوة ([59]) في منطقه ومسائلته، حتى إن كان أصحابه ليستجلبونهم،([60]) ويقول:((إذا

---

[57] _ واتە دلوای عەورەتی كەسی نەدەكرد، لێرەدا عەورەت هەر كارێكی شەرمڵێكراوە ئەگەر دەركەوت، واتە خۆی دەرنەدەخست بۆ داواكردنی ئەوەی كەسێك دەیەوێت دایپۆشێتو بیشا رێتەوە.

[58] _ كأنما على رؤسهم الطير : واتە نەدەجوڵانەوە لەبەر ئەوەی بەلایانەوە بەرێزو شكۆدار بوو لەم بارەدا سیفەتیان سیفەتی كەسێك بوو باڵندەیەك بەسەر سەریەوە بێتو بیەوێت راوی بكات، ئیتر ئەو كەسە دەترسێت بجوڵێتەوە.

[59] _ الجفوة :واتە لەسەر دڵرەقیو توندو تیژی كە دەردەچوو لە هەندێ كەسانی كەللە رەقەوە . (ریوایەتكراوە (ذوالخویصرة) چووە لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیەو سلم لەو كاتەدا كە سەرقاڵی قەپلاندنو تێوردبونەوەی بەشو بەركەوتەكان بوو لەو سامانەی مابۆوەو گوتی؛ ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیەو سلم دادگەربە! ئەویش فەرمووی ؛ تیابچیت، كێ دادگەر دەبێت ئەگەر من دادگەر نەبم، دۆڕاوو شكست خواردووم ئەگەر دادگەر نەبم)).

رأيتم طالبَ حاجةٍ يطلبها فأرفدوه)).([61])ولا يقبل الثناء إلا من مكافيء،([62]) ولا يقطع على أحد حديثه حتى يجوز،([63]) فيقطعه بنهي أو قيام)) ﴾ ([64]).

لە سێ شتدا وازی لە خەڵك هێنابوو: بەدگۆی کەسی نەدەکردو، عەیباری نەدەکردو، ئارەزووی لە غەیبەتکردنی کەس نەبوو، قسەشی نەدەکرد بەدەر لەوەی نەبوایەو پاداشتێکی لێ دەست نەکەوتبا.

ئەگەر قسەی بکردبا هاوەڵانی بێدەنگ دەبوون وەکو ئەوەی باڵندە بەسەر سەریانەوە بێت، ئەگەر بێدەنگ بوایە ئەوجا قسەیان دەکرد، لە لایدا گفتوگۆیان نەدەکرد، هەرکەس لە لایدا قسەی بکردایە گوێبیستی دەبوون تا تەواو دەبوو، قسەکردنیان لە لایدا قسەی یەکەمیان بوو.

پێدەکەنی سەبارەت بەوەی پێی پێدەکەنین، سەری سوڕدەما لەوەی هاوەڵانی سەریان لێسوردەما، بە ئارام دەبوو بەرامبەر بە وشکیو توندو تیژی غەریبان لە قسەو داخوازیاندا، تا رادەیەك هاوەڵان قایلیان دەکردنو بانگیان دەکردن بۆ نیشتگەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ،و دەیفەرموو: ((ئەگەر خوازیاری پێداویستیەکتان بینیو داوای دەکرد یارمەتیدەن)).

مامناوەند بوو لە ستایشکردندا (مدح) سنووری شیاوی تێنەدەپەڕاند، قەسەشی بە کەسێك نەدەبڕی تا سنوری هەق دەبەزاندو سەر پێچی دەکرد، ئەوجا یان بێدەنگی دەکرد یا نیشتگەکەی بە جێدەهێلا.

---

[60] _ واتە هاوەڵانی ئاواتە خوازبوون بێگانان بێنە نیشتگەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم، بۆ ئەوەی بەهۆی پرسیارەکانیانەوە سوودمەند بن چونکە بە نەهاتنیان ئەو سوودەیان لە کیس دەچوو، چونکە خۆیان لە پرسیارکردنی سڵیان دەکردەوە.

[61] _ فأرفدوه : واتە یارمەتی بدەن بۆ دەستکەوتنی ئەو شتەی داوای دەکات.

[62] _ واتە مامناوەند بوو لە ستایشکردندا سنوری شیاوی تێنەدەپەڕاند.

[63] _ واتە سنووری هەق ببەزێنێتو سەرپێچی بکات.

[64] _ واتە ئەو نیشتگەیەی بەجێدەهێلا.

تێبینیەك:

بزانە فەرموودەكە لە بنچینەدا پەرش‌و بڵاوبوو لە چەند بەشێكداو بەیەك سەنەد، بەڵام لێرەدا كۆمكردەوە بەیەك گێرانەوە، بە (اجتهاد) یك لە خۆمەوە، پاشان بینیم هاودەقی گێڕانەوەكەی پێشەوا یەعقوبی كوڕی سوفیانی ئەلفەسەویە، كە هەڵساوە بەگێڕانەوەی بە كۆكراوەیی‌و بەڕیز، وەك ئەوەی (إبن كثير) لە ((البداية)) دا باسی كردووە. پاشان فەرموویەتی: ئەم فەرموودەیە بە تەواوی پێشەوا ئەبو عیسای ترمذي (خوا لێی ڕازی بێت) لە كتێبی (الشمائل)دا گێڕاویەتیەوە لە سوفیانی كوڕی وەكیعەوە.... بەبێ ئەوەی ئاماژە بكات كە بەپەرش‌و بڵاوی تێیدا دەیگێڕێتەوە، پاشانیش بینیم پێشەوا (ئەبی نعیم) بە ڕیز فەرموودەكە دەگێڕێتەوە.

صحيح ٧ _ جابر بن سمرة يقول:((كان رسولُ الله صلى الله عليه وسلم ضَليعَ الفَم ِ، أشكلَ العين، منهوسَ العَقِب)). قال شعبة: قلت لسماك: ما ((ضليعَ الفم))؟ قال: عظيم الفم.قلت: ما ((أشكلَ العين))؟ قال: طويل شق العين. قلت: ما ((منهوسَ العقب))؟ قال: قليل لحم العقب.

٧_ لە جابری كوڕی سەمرەوە دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ (ضلیع) زاربوو، (اشكل) چاوبوو، (منهوس) پاژنە بوو)). شوعبە دەڵێت: بە سەماكم گوت: مانای (ضلیع) زار چی یە؟ گوتی: زاری گەورەبوو. گوتم: مانای (اشكل) چاو چی یە؟ گوتی: كەلێنی چاوی درێژبوو. گوتم: مانای (منهوس) پاژنە چی یە؟ گوتی: گۆشتی پاژنەی كەم بوو.

---

[٧] _ الحديث أخرجه مسلم في ((الفضائل)) برقم ٢٣٣٩ والمؤلف في ((المناقب)) برقم ٣٦٤٩. (قلت : وكذا الطيالسي (٢٤٠٨ _ ترتيبه) وأحمد ٥/٨٨ و٩٧ / ١٠٣).

## ٩ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە سۆڵی (خُفّ) پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ٥٨ _ عن عبدالله بن بُرَيدة عن أبيه: ((أن النَّجاشيَّ(٩٨) أهدى النَّبيَّ صلى الله عليه وسلم خُفَّين أسْودَيْنِ ساذَجَيْنِ،(٩٩) فَلَبِسَهما، ثم توضأ ومَسَحَ عليهما)).

٥٨ _ لە عەبدوڵای كوڕی بوریدەوە لە باببیەوە: ((نەجاشی جوتێ سۆڵی ڕەشی سادەی بەخشیە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش لە پێیكردن و، پاشان دەستنوێژی گرت و (مسح) ی بەسەراكردن)).

---

[٥٨] _ أخرجه أبوداود في ((الطهارة)) برقم ١٥٥ والمؤلف في ((الأدب)) برقم ٢٨٢١ وابن ماجة في ((الطهارة)) وفي ((اللباس)) ٣٦٢٠. (قلت: وقال المؤلف: (حديث حسن، إنما نعرفه من حديث دلهم))). (قلت: وفيه ضعف، لكن له شاهد، ذكرته من أجله في ((صحيح أبي داود)) (١٤٤) ثم وجدت له متابعا في ((أخلاق النبي صلى الله عليه وسلم)) (ص١٣٣) عقب هذا من طريق محمد بن مرداس الأنصاري: ثنا يحيى بن كثير: ثنا الجريري عن عبدالله بن بريدة به. ويحيى هذا إن كان العنبري فهو ثقة، وإن كان صاحب البصري فهو ضعيف) گرنگترین سوودەكانی فەرموودەكەش لەوەدایە كە دیاری (ئەهلی كتاب) قبوڵ دەكرێت و بنچینەش لە شتەكاندا پاكێتیە (الأصل في الأشياء الطهارة) سوودێكی گرنگی تری فەرموودەكەش بریتیە لە شیاوێتی (مسح)كردن لە سەر سۆڵ (خُف).

[٩٨] _ النجاشي، بفتح النون وكسرها: نازناوی پادشایانی حەبەشە بوو ناوی (أصحمة)یە، یەكێك بوو لەو پادشایانەی كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم بانگی كردن بۆ ئیسلام بە كیتابێك لەگەڵ عەمری كوڕی ئومەیەی زومەریدا ناردی، ساڵی شەشەمی كۆچی موسڵمان بووە بە پێی ڕای زۆربەی زانایان، ساڵی نۆیەمی كۆچیش مردووە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خەبەری مردنی نەجاشی بە هاوەڵانی ڕاگەیاندو نوێژی مردووی (غائب)ی بۆ كرد، لە سەرەتای ئیسلامدا موسلمانان بۆ لای نەجاشی كۆچیان كردو ئەویش ڕێزی هاتنی گرتن‌و، شاندەكەی قورەیشی بە نائومێدی گەڕاندەوە كە پێكهاتبوون لە (عەمری كوڕی عاص) و دوو هاوڕێكەی بەبێ ئەوەی زیان بە موسڵمانان بگەیەنێت.

[٩٩] _ (ساذَجَيْنِ) بفتح الذال وكسرها: واتە ڕەشی سادە.

صحيح ٥٩ _ عن أبي إسحاق عن الشعبي قال: قال المغيرة بن شعبة: ((أهدى دحية(١٠٠) للنبي صلى الله عليه وسلم خُفَّين فَلَبِسَهما)). وقال جابر بن عامر:(+) ضعيف ((وجُبَّةً فَلَبِسَهُما حتى تَخَرَّقَا، لا يدري النبي صلى الله عليه وسلم أذ كِيٌّ(١٠١) هما أم لا)).

٥٩ _ لە ئەبی ئیسحاقەوە لە شەعبیەوە فەرموویەتی: موغیرەی کوڕی شوعبە دەفەرموێت: ((دیحیە جووتێ سۆڵی بە دیاری پێشکەش بە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و ئەویش لە پێیکردن.

جابری کوری عامر دەڵێت: ((وە جوبەیەکیش کە هەردوکیانی دەپۆشی تا دڕان، پێغەمبەر ﷺ ئاگادار نەبوو هی ئاژەڵێکی سەربڕاوی شەرعیە یا نەء )).

---

[٥٩] _ وأخرجه المؤلف في ((كتاب اللباس)) برقم ١٧٦٦. (قلت: وقال: ((حديث حسن غريب)). وأقول: هو من طريق أبي إسحاق _ وهو الشيباني: سليمان _ صحيح، وعن جابر وهو الجعفي ضعيف، ومن طريقه أخرجه
أبو الشيخ ص ١٠٥.

[١٠٠] _ دحية بن خليفة الكلبي: هاوەڵێکی بەرێزە و جبريل زۆرجار لە سەر شێوەی ئەو دادەبەزی.

(+) هو الشعبي نفسه وهو عامر بن شراحيل، وجابر هو ابن زيد الجعفي، ضعيف.

[١٠١] _ واتە ئایا سەربڕاوە بە سەربڕینێکی شەرعییانە، واتە ئاگادار نەبوو ئەم جووتە سۆڵە دروستکراوە لە پێستەی ئاژەڵێکی تۆپیوی دەباخکراو یا دەباخنەکراو، سوودی فەرموودەکەش لەوەدایە کە بنچینە لە شتە نەزانراوەکاندا پاکێتیە (الأصل في الأشياء المجهولة الطهارة).

## ١٠ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە نەعلی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ٦٠ _ عن قتادة قال: قلت لأنس بن مالك: كيف كان نعل رسول الله صلى الله عليه وسلم؟ قال: ((لهما قيبالان)).

٦٠ _ لە قەتادەوە دەفەرموێت: بە ئەنەسی كوڕی مالیكم گووت: چۆن بوو نەعلەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((دوو قیبالی هەبوو)).

صحيح ٦١ _ عن أبن عباس قال:((كان لنعل رسول الله صلى الله عليه وسلم قِـبالان مَـثْـنـيٌ (١٠٢) شِراكُهما)).

٦١ _ لە ئیبنوعەباسەوە فەرموویەتی: ((نەعلەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ جوتێ قیبالی هەبوو قەیتانەكانی دووتا كرابوونەوە)).

صحيح ٦٢ _ عيسى بن طَهمان قال:((أخرج إلينا أنس بن مالك نعلين جَرْداوَيْـن،(١٠٣) لهما قِـبالان)).قال: فحدثـني ثابت _ بَـعدُ _ عن أنس: ((أنهما كانتا نعلي النبي صلى الله عليه وسلم)).

---

[٦٠] _ أخرجه المؤلف أيضاً في ((اللباس)) برقم ١٧٧٣ وأبوداود فيه برقم ٤١٣٣ ومسلم والنسائي، وعند البخاري في ((كتاب اللباس / باب قبالان في نعل النبي صلى الله عليه وسلم)). (القبالان) تـثـنية قِـبال بكسر القاف: بە (شسع)یش ناودەبرێت، كەیەكێكە لە ڕایەڵەكان بۆ ڕاگرتنی نەعل بە پەنجەكانی پێوەو پارچە بڕاوێكی لاكێشەیە لە چەرم، كەواتە قیبال تاڵێكی لاكێشەی گرێبەستەو دەكەوێتە نێوان پەنجەی ناوەڕاستو پەنجەكانی ترەوە.

[٦١] _ وأخرجه ابن ماجة في ((اللباس)) حديث رقم ٣٦١٤. (قلت: وإسناده صحيح على شرط الشيخين، وقواه الحافظ في ((الفتح))، ((كتاب اللباس)) ورواه ابن سعد (٤٧٨/١) مرسلا بلفظ: ((لهما زمامان شراكهما مثني في العقدة).

[١٠٢] _ مَـثْـنـيٌ بفتح الميم وسكون الثـاء من التـثـنية: واتە بەدوانەكردنی شتێـك. (الشراك): قەیتانێـكی یا تاڵـێـكی گرێـبەستی نەعلە.

٦٢ _ عیسای كوڕی طەهمان دەفەرموێت:((ئەنەسی كوڕی مالك جووتێ نەعلی ڕووتی بۆ دەرهێنایین، دوو (قبال)ی هەبوو)). دەفەرموێت: _ پاشان _ ثابت لە ئەنەسەوە بۆی باسكردم: ((ئەوانە نەعلی پێغەمبەری خوابوون ﷺ)).

صحيح ٦٣ _ عن عُبَيد بن جُريج أنه قال لأبن عمر: رأيتك تلبس النعالَ السِّبْتيَّةَ(١٠٤) قال: ((إني رأيت رسول الله صلى الله عليه وسلم يَلبَس النعال التي ليس فيها شَعر، ويتوضأ فيها،(١٠٥) فأنا أحب أن ألبِسَها)).

صحيح ٦٣ _ لە عوبەیدی كوڕی جورەیجەوە كە بە ئیبنو عومەری گوتبوو: بینیتم نەعلی پێستیـن لەپێدەكەی فەرمووی: ((بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ نەعلانێك لەپێ دەكات مووی تێدا نەبوو دەستنوێژی پێوە دەگرت، منیش ئارەزووی لەپێكـردنی دەكەم)).

صحيح ٦٤ _ عن أبي هريرة قال:((كان لنعل رسول الله صلى الله عليه وسلم قِـبالان)).

---

[٦٢] _ أنظر تخريج الحديث السابق. لەم فەرموودەیەدا هاوەڵی بەڕێز ئەنەسی كوڕی مالك سوورە لە سەر پیرۆزی (تبرك) كردن بە ئاسەواری پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه و سلم. وأقول: لاطائل في الإحالة على الحديث السابق فإنه حديث آخر، هذا عن أنس، وذاك عن ابن عباس. وفاته أنه عند البخاري في ((صحيحه)) أول ((الخمس)) من طريق أخرى عن عيسى بن طهمان به.

[١٠٣] _ جَرْداوێن: واتە تووكیان بە سەرەوە نەبوو، ووشەی (جرداء)یش لە زمانی عەرەبیدا لە زەویەكی ڕووتی بێ ڕووەكەوە خوازراوە (أستعير من أرض جرداء).

[٦٣] _ البخاري في ((اللباس / باب النعال السبتية)) والنسائي. (قلت: وكذا أبوداود (١٧٧٢) وسائر أصحاب السنن إلا المؤلف. ورواه أحمد أيضاً (١٧/٢و٦٦و١١٠) وابن سعد (٤٧٣/١) وأبوالشيخ(١٣٦) وهو مخرج في ((صحيح أبوداود)) ١٥٥٤).

[١٠٤] _ السبْتيَّة: واتە مووی بە سەرەوە نەبوو، وشەكەش دەگەڕێتەوە بۆ (سِبت) بكسر السين: كە بریتیە لە پێستی مانگای دەباخكراو چونكە مووی پێستەكە بە دەباخكردن لاچووە و كەوتووە، مەبەستی كەسی پرسیاركاریش ئەوەبوو بزانێ دانایی ئیبنوعومەر لە هەڵبژاردن و لەپێكردنی ئەو نەعلانەدا چی یە ؟

[١٠٥] _ يتوضأ فيها: واتە دەستنوێـژی دەگرت و نەعلەكانی لە پێ دەكرد.

[٦٤] _ قلت: حديث صحيح يشهد له حديث أنس وغيره في الباب.

٦٤ _ لە ئەبی هوریرەوە دەفەرموێت: ((نەعلەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو (قِـبال) ی هەبوو)).

٦٥ _ عمرو بن حريث يقول: صحيح ((رأيت رسول الله صلى الله عليه وسلم يصلي في نعلين مَخْـصُـوفَـتَـينْ)).(١٠٦).

٦٥ _ عەمری كوڕی حەریث دەفەرموێت: ((بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ بە جووتێ نەعلی دڕاوەوە نوێژ دەكات)).

صحيح ٦٦ _ عن أبي هريرة أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: ((لا يَـمْشِيَـنَّ أحدُكم في نعلٍ واحدةٍ، لِيَنْعَلهُما جميعاً، أو لِيُحفِـهم جميعاً)).

٦٦ _ لە ئەبی هوریرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((با یەكێكتان بە تاكێك نەعلەوە ڕێـنەكات، با هەردووكیان بە یەكەوە لەپێـكات، یا هەردووكیان بە یەكەوە دابكەنێـت)).

---

[٦٥] _ (قلت: حديث صحيح، رجاله ثقات غير أن تابعيه لم يسم، وكذا رواه أحمد (٤/ ٣٠٧ و٦/٥) وابن سعد (١/ ٤٧٩) وأبو الشيخ (١٣٥) لكن له طريق أخرى عن مطرف بن الشخير قال: أخبرني أعرابي لنا قال: رأيت نعل نبيكم صلى الله عليه وسلم مخصوفة. أخرجه أحمد (٥/٦ و٢٨ و٣٦٣) وابن سعد وسنده صحيح، وأبو الشيخ إلا أنه قال: عن مطرف بن عبدالله عن أبيه قال: فذكره. وله عنده شاهد من حديث أبي ذر).

[١٠٦] _ النعلان المخصوفتان: واتە جووتێ نەعلی كۆن بوو، دڕاو، یا پینـەكراو.فەرموودەكەش شیاوێـتی نوێـژكردن بە نەعلەوە بە دەردەخات.

[٦٦] _ وأخرجه البخاري ومسلم وأبوداود في ((اللباس)). (قلت: وكذا المؤلف في ((السنن)) (١٧٧٥) وصححه ابن ماجة (٣٦١٧) ومالك في ((الموطأ)) والنسائي في ((الزينة)) وأحمد (٢/٢٥٦ و٢٨٣ و٣١٤ و٤٠٩ و٤٢٤ و٤٣٠ و٤٤٣ و٤٧٧ و٤٨٠ و٤٩٧ و٥٢٨) من طرق عديدة عن أبي هريرة). (لينعلهما): واتە با هەردوكیان لە پێبكات، (ليحفهما): أي ليخلعهما جميعاً: واتە با هەردووكیان بەیەكەوە دابكەنێت. وفي رواية ليخلعهما. دانایش لەمەدا قەدەغەكردنی خۆ چواندنە بە شەیتانەوە، چونكە لە هەندێ ڕێگەی تری فەرموودەكەوە بە (صحيح)ی هاتووە: ((كە شەیتان بە تاكێك نەعلەوە ڕێدەكات)) وهو مخرج في ((الصحيحة)) (٣٤٨).

صحيح ٦٧ _ عن جابر:((أن النبي صلى الله عليه وسلم نهى أن يأكلَ _ يعني _ الرجل بشماله، أو يمشي في نعل واحدة)).

٦٧ _ لە جابرەوە: ((پێغەمبەری خوا ﷺ یاساغی کردووە بخوات _ واتە _ پیاو بە دەستی چەپی، یا بە تاکێك نەعلەوە ڕێبکات)).

صحيح ٦٨ _ عن أبي هريرة أن النبي صلى الله عليه وسلم قال:((إذا انْـتَـعَلَ أحدُكم فَـلْيَبْـدَأْ باليمين، وإذا نَـزَعَ فليبدأ بالشِّمال فلتكن أولَـهما تُـنْـعَـل، وآخرَهما تُـنزع)).

٦٨ _ لە ئەبی هورەیرەوە دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەرکات یەکێکتان نەعلی لەپێکـرد با بەپێ ی ڕاستە یان بەڕاستە دەستپـێـبکات و، ئەگەر داشـیکەند با بە چەپی دەستـپێـبکات با یەکەمیان بێت لە پێـبکرێت و، دواهەمیشیان بێت دابکەنرێـت)).

صحيح ٦٩ - عن عائشة قالت:((كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يحب التَّـيَـمُّـنَ ما استطاع، في تَـرَجُّلِـه وتنعُّـلِـه وطهوره)).

---

[٦٧] _ مسلم في ((اللباس)) رقم ٢٠٩٩ وأبوداود فيه برقم ٤١٣٧ بـأطول مما هنا والنسائي في ((الزينة)). (قـلـت: وأحمد (٣/٢٩٣ و٣٢٢و٣٢٧و٣٤٤و٣٥٧و٣٦٢و٣٦٧) ومالك أيضاً وعنه تـلـقاء المؤلف وغيره، وصرح أبوالزبير بسماعه عن جابر في رواية لأحمد).

[٦٨] _ وأخرجه البخاري في ((اللباس / باب ينزع نعل اليسرى)) ومسلم وأبوداود في ((اللباس)) برقم ٤١٣٩ وابن ماجة بنحوه برقم ٣٦١٦ والمؤلف فيه برقم ١٧٨٠. (قـلـت: وقال: ((حديث حسن صحيح)). ورواه أحمد (٢/٢٣٣و٢٤٥و٤٠٩و٤٣٠و٤٦٥و٤٧٧و٤٩٧) من طرق عن أبي هريرة).

[٦٩] _ وأخرجه البخاري في ((اللباس / باب يبدأ بالنعل اليمنى)) ومسلم في ((الطهارة)) برقم ٢٦٨ وأبوداود في ((اللباس)) برقم ٤١٤٠ والمؤلف والنسائي وابن ماجة بنحوه. (قـلـت: وقال المؤلف (٦٠٨): ((حديث حسن صحيح)) وأحمد (٦/ ٩٤ و١٣٠و١٤٧و١٧٨و١٨٨و٢٠٢و٢١٠) وابن سعد ١/ ٣٨٦).

٦٩ _ لە عائیشەوە دەفەرمێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ دەستپێکردنی لە ڕاستەوە خۆشدەویست چەند لە توانایدا بوایە، لەپرچ داهێنان و نەعل لەپێـکردن و خۆپاککردنەوەیدا)).

ضعيف ٧٠ _ عن أبي هريرة قال:((كان لِنَعْل رسول الله صلى الله عليه وسلم قِبالان، وأبي بكر وعمر رضي الله تعالى عنهما، وأولُ من عقد عقداً واحداً عثمان رضي الله عنه)).

٧٠ _ لە ئەبی هورەیرەوە فەرموویەتی: ((نەعلەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو (قِبال) ی هەبوو، هەروەها ئەبوبەکرو عومەریش رەزای خوایان لێبێت، یەکەم کەسێکیش بەستبێتی بە یەك بەستن عوسمان بوو رەزای خوای لێبێت)).

[70] _ قلت: في إسناده عبد الرحمن بن قيس أبو معاوية، وهو متروك كذبه أبو زرعة وغيره كما في ((التقريب))، لكن أخرجه الطبراني في ((المعجم الصغير)) من طريق أخرى: عن صالح مولى التوأمة عن أبي هريرة به. وصالح هذا فيه ضعف كما بينته في ((الروض النضير)) (١١٢٢).

## ١١ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە باسكردنی ئەمووستیلەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ٧١ _ عن أنس بن مالك قال: ((كان خاتم النبي صلى الله عليه وسلم من وَرِقٍ (١٠٧) وكان فَصُّه (١٠٨) حَبَشِيّاً)).

٧١ _ لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە فەرموویەتی: ((ئەمووستیلەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە زیو بوو نقێمەكەشی حەبەشی بوو)).

صحيح ٧٢ _ عن ابن عمر: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم اتخذ خاتما من فِضة، فكان يَختِم به ولا يلبسه)).

---

[٧١] _ وأخرجه البخاري في ((كتاب اللباس / باب قول النبي صلى الله عليه وسلم لا ينقش على نقشه خاتمه)) بلفظ: ((اتخذ خاتماً من فضة)) واتە ئیمامی بوخاری فەرموودەكە بەم بێژەیە دەگێڕێتەوە: ((ئەمووستیلەیەكی لە زیو هەڵبژارد)).

وأخرجه مسلم في ((اللباس)) برقم ٢٠٩٤، وابن ماجة فيه برقم ٣٦٤١، وأبوداود في ((كتاب الخاتم / باب في اتخاذ الخاتم)) ح ٤٢١٦، والنسائي في ((اللباس / باب في صفة خاتم النبي صلى الله عليه وسلم)) ولفظه: ((اتخذ خاتما من ورق وفصه حبشي، ونقشه محمد رسول الله)). واتە ئیمامی نەسائی فەرموودەكە بەم بێژەیە دەگێڕێتەوە: ((ئەموستیلەیەكی لە زیو هەڵبژارد نقێمەكەی حەبەشی بوو (محمد رسول الله)ی لە سەر هەڵكەندرابوو)). وأخرجه المؤلف في ((اللباس)) برقم ١٧٣٧. (قلت: وقال: ((حديث حسن صحيح غريب))، ورواه أحمد أيضاً ٣/٩٩و٢٠٩و٢٢٥).

[١٠٧] _ الورق: واتە زیو.

[١٠٨] _ فَصُّه: بالفتح والضم: بریتیە لەو بەشەی كە ناوی خاوەنەكەی لێـهەڵـدەكەنرێت، لە ڕاستیدا بە حەبەشی ناودەبرا چونكە كانزاكەی لە حەبەشە بوو، كە لە جۆرێـكی تایبەت بوو پێـی دەگوترا (سلیمانی)و بریتی بوو لە نقێمێك ڕەنگەكانی سپی و ڕەشی تێدا بوو، یا لە شیلان بوو كانزاكەی لە حەبەشە بوو.

[٧٢] _ قلت: إسناده صحيح على شرط الشيخين، وقد أخرجه أحمد (٦٨/٢) وأبوالشيخ (ص ١٣٠) بأتم منه دون قوله: ((ولا يلبسه))، بل هذا شاذ عندي. لأن الحديث في ((الصحيحين)) وغيرها من طرق أخرى عن نافع عن ابن عمر بلفظ: ((اتخذ خاتما من ورق فكان في يده، ثم كان في يد أبي بكر...))واتە لە ((الصحيحين))دا ئیبو عومەر فەرموودەكە بەم بێژەیە دەگێڕێتەوە:

٧٢ _ لە ئیبنو عومەرەوە: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمووستیلەیەکی لە زیـــوو هەڵــبژارد، مۆری پێدەکردو نەیدەکردە دەستی)).

صحيح ٧٣ _ عن أنس بن مالك قال:((كان خاتم النبي صلى الله عليه وسلم من فضة، فَصُّـه منه)).(١٠٩)

٧٣ _ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە فەرموویەتی: ((ئەمووستیلەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە زیوو بوو، نقێمەکەشی هەندێ بەشی خۆی بوو)).

صحيح ٧٤ _ عن أنس بن مالك قال:((كان نقش خاتم رسول الله صلى الله عليه وسلم (محمد) سطر، و(رسول) سطر، و(الله) سطر)).

---

ئەمووستیلەیەکیْ لە زیو هەڵبژارد لە دەستیدا بوو، پاشان لە دەستی ئەبو بەکردا بوو.٠٠٠)) الحديث. ويأتي في الكتاب قريبا برقم (٧٦).

[٧٣] _ (قلت: وأخرجه البخاري في ((اللباس)) وأبوداود (٤٢١٧) والمؤلف (١٧٤٠) وصححه وأحمد(٣/٢٦٦) وابن سعد (١/٤٧٢) وأبوالشيخ ١٣٠).

[١٠٩] _ ڕاناو لە وشەی (منه)دا دەگەڕێـتەوە بۆ (خاتم) ووشەی (من)یش لە زمانی عەرەبیدا بۆ بەهەندکردن بەکاردێـت، لێـرەدا ڕوون دەبێـتەوە کە نقێـمەکە هەندێ بەشی ئەمووستیلەکە بوو، لەوانەشە ئەمووستیلەکە چوار گۆشە بێت، چونکە ئەمە ئاسانترە بۆ هەڵـکەندن لە سەری. گوتم: لێرەدا ئەم فەرموودەیە جیاواز دەبێت لەگەڵ فەرموودەکەی پێـشودا کە دەفەرمێت: ((نقێـمەکەی حەبەشی بوو)). بەڵام پێشەوا (الحافظ) وەڵامی ئەمە دەداتەوەو هەڵیـگرتۆتە سەر هەمە جۆری ئەمووستیلەکانی، یا ڕەنگی حەبەشیەکان. والله أعلم.

[٧٤] _ أخرجه المؤلف في ((اللباس)) برقم ١٧٤٧ والبخاري في ((اللباس / باب هل يجعل نقش الخاتم ثلاثة أسطر))، وأخرجه مسلم في ((اللباس)) حديث رقم ٢٠٩٢ عن أنسقال: ((اتخذ رسول الله صلى الله عليه وسلم خاتما من فضة ونقش فيه محمد رسول الله)). واتە ئیمامی موسلیم فەرموودەکە لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم ئەمووستیلەیەکی لە زیو هەڵبژارد (محمد رسول الله)ی لە سەر هەڵکەندبوو)). وأبوداود في ((الخاتم)) برقم ٤٢١٤ والنسائي في ((اللباس/ باب صفة خاتم النبي صلى الله عليه وسلم ونقشه)): ((اتخذ النبي صلى الله عليه وسلم خاتما من ورق، ونقشه محمد رسول الله)). واتە ئیمامی نەسائی فەرموودەکە بەم بێژەیە دەگێڕێتەوە: ((پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم ئەمووستیلەیەکی لە زیو هەڵبژارد (محمد رسول الله)ی لە سەر هەڵــکەندرابوو)). (قلت: وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح غريب)) وابن سعد (١/٤٧٤ و٤٧٥) وأبو الشيخ ١٣٢).

وفي طريق أخرى عنه: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم ﴿ أراد أن /٨٥ ﴾ يَكْتُبَ إلى كسرى وقيصر والنجاشي، فقيل له: إنهم لا يقبلون كتاباً إلا بخاتم، فصاغ رسول الله صلى الله عليه وسلم خاتماً حَلْقَتُه فضة، ونقش فيه محمد رسول الله، ﴿ فكأني أنظر إلى بياضه في كفه ﴾)).

٧٤ _ له ئەنەسی كوڕی مالیكەوە فەرموویەتی: ((نقێمی ئەموستیلەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵكەندرابوو بە (محمد) لە دێڕێكداو (رسول) لە دێڕیكدا و، (الله) لە دێڕێكدا)). لە ڕ ێگەیەكی ترەوە و لە هەمان هاوەڵەوە دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ﴿ ویستی / ٨٥ ﴾ بنوسێت بۆ كیسریو قەیسەرو نەجاشی، كەچی پێی گووترا: ئەوان هیچ كیتابێكیان قبووڵ نییە مەگەر مۆركراوبێ، ئەوجا پێغەمبەری خوا ﷺ مۆرێكی دارشت ئەڵقەكەی زیوو بوو، لەسەری (محمد رسول الله) هەڵكەندرا بوو، ﴿ هەروەكو ئەوەی تەماشای سپیەتیەكەی دەكەم لە دەستیدا ﴾)).

ضعيف ٧٥ _ عن أنس: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم كان إذا دخل الخلاء نزع خاتمه)).

---

* ومن الطريق الأخرى: البخاري في ((اللباس / باب اتخاذ الخاتم يختم به الشيء أو ليكتب به الى أهل الكتاب وغيرهم)) ومسلم في ((اللباس)) برقم ٢٠٧٢ ((باب اتخاذ النبي صلى الله عليه وسلم خاتما لما أراد أن يكتب الى العجم)) وأبوداود في ((كتاب الخاتم)) رقم ٤٢١٤ بنحوه. (قلت: وأحمد أيضا (١٦٩/٣ و١٧٠و١٨٠و١٨٧و١٩٨و٢٢٣و٢٧٥) وابن سعد (٤٧١/١) وأبوالشيخ ١٣١).

[٧٥] _ أخرجه المؤلف في ((اللباس)) رقم ١٧٤٦ وأبوداود في ((الطهارة)) رقم ١٩ وابن ماجة في ((الطهارة / باب ذكر الله على الخلاء والخاتم في الخلاء)) رقم ٣٠٣. والنسائي وابن حبان والحاكم. (قلت: وقال أبوداود: ((حديث منكر))، ولقد صدق، وإن صححه المؤلف وغيره كما هو مقرر في كتب التخريج، وبينته في ((الإرواء)) (٤٨) و((ضعيف أبي داود)) (٤). وقد روى ابن سعد(٤٧٥/١) بسند صحيح: لە حەسەنی بەصریان پرسی سەبارەت بە پیاوێك ئەموستیلەكەی ناوێك لە ناوەكانی خوای تێدا نوسرابێت و پێوە بچێتە ئاو دەستەوە ؟ فەرمووی: ئایا ئەموستیلەكەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم ئایەتێكی كتێبەكەی خوای تێدا نەبوو ؟ مەبەستی محمد رسول الله بوو.

٧٥ _ لە ئەنەسەوە: ((پێغەمبەری خوا ﷺ هەركات چووبایەتە ئاودەستەوە ئەمووستیلەكەی دادەكەنی)).

صحيح ٧٦ _ عن ابن عمر قال:((اتخذ رسول الله صلى الله عليه وسلم خاتماً من وَرِقٍ ، فكان في يده، ثم كان في يد أبي بكر ويد عمر، ثم كان في يد عثمان حتى وقع في بئر أرِيس،(١١٠) نقشه: محمد رسول الله)).

٧٦ _ لە ئیبنو عومەرەوە دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمووستیلەیەكی لە زیو هەڵبژارد، لە دەستیدا بوو، پاشان لە دەستی ئەبو بكر و لە دەستی عومەردا بوو، پاشانیش لە دەستی عوسماندا بوو تا كەوتە بیری ئەریسەوەو، (محمد رسول الله)ی لە سەر هەڵكەندرابوو)).

---

[٧٦] _ وأخرجه البخاري في ((اللباس)) برقم ٥٤ والنسائي وأبوداود في ((كتاب الخاتم)) برقم ٤٢١٨ والمؤلف. (قلت: ليس عند المؤلف (١٧٤١) والنسائي في ((الزينة)) قوله: ((ثم كان في يد أبي بكر...)) بل هو عندهما حديث أخر، والحديث رواه مسلم أيضاً في ((اللباس))، وهو مخرج في الإرواء ٨١٨).

[١١٠] _ أريس: بفتح الهمزة وكسرالراء / بوزن أمير بالصرف وعدمه: بیرێك بوو لە نێو باخچەیەكی نزیك بە مزگەوتی قووبا، دەگەڕایەوە بۆ پیاوێكی جولەكە بە ناوی (أریس) ئەریسیش مانای جوتیارە بە شێوە زاری خەڵكی شام.

## ١٢ _ بەشێك سەبارەت بەوەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمووستیلەكەی دەكردە دەستی ڕاستی:

صحيح ٧٧ _ عن علي بن أبي طالب:((أن النبي صلى الله عليه وسلم كان يلبَس خاتمه في يمينه)).

٧٧ _ لە عەلی كوڕی ئەبی تالبەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمووستیلەكەی دەكردە دەستی ڕاستی)).

صحيح ٧٨ _ عن حماد بن سلمة قال رأيت ابن أبي رافع يتختم في يمينه، فسألته عن ذلك؟ فقال: رأيت عبدَالله بنَ جعفرٍ يتختم في يمينه، وقال عبدالله بن جعفر: ((كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يتختم في يمينه)).

٧٨ _ لە حەمادی كوڕی سەلەمەوە دەڵێت: كوڕەكەی ئەبی ڕافعم بینی ئەمووستیلەكەی دەكردە ڕاستیو سەبارەت بەو كارەی لێم پرسی، گووتی: عەبدولای كوڕی جەعفەرم بینی ئەمووستیلەكەی دەكردە دەستی ڕاستی، عەبدولای كوڕی جەعفەر دەیگووت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمووستیلەكەی دەكردە دەستی ڕاستی)).

صحيح ٧٩ _ عن جابر بن عبد الله: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم كان يتختم في يمينه)).

---

[٧٧] _ وأخرجه أبوداود في ((كتاب الخاتم)) برقم ٤٢٢٦ والنسائي. (قلت: وإسناده صحيح على شرط الشيخين، وهو مخرج في ((إرواء الغليل)) ٨٢٠).

[٧٨] _ وأخرجه المؤلف في ((اللباس)) برقم ١٧٤٤ وابن ماجة فيه برقم ٣٦٤٧ والنسائي في ((الزينة)). (گوتم: دانەر دەفەرمێت: ((محمدی كوری ئیسماعیل ((مەبەستی ئیمامی بوخاری)) ە دەفەرموێت: ئەمە ڕاسترین شتێكە لەم بەشەدا لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه و سلم (ڕیوایە)ت كرابێت)) وإسناده صحيح، مخرج هناك، وقد روى البخاري أوله في ((التاريخ الكبير)) ٩١٤).

٧٩ _ لە جابری کوڕی عەبدولاّوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمووستیلەکەی دەکردە دەستی ڕاستی)).

حسن ٨٠ _ عن الصلت بن عبدالله قال: كان ابن عباس يتختم في يمينه ولا إخاله (١١١) إلا قال: ((كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يتختم في يمينه)).

٨٠ – لە صەلـتی کوڕی عەبدولاّوە دەفەرموێت: ئیبنو عەباس ئەمووستیلەکەی دەکردە دەستی ڕاستی و هیچیشم بە بیردا نایەت بەدەر لەوەی فەرموویێتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمووستیلەکەی دەکردە دەستی ڕاستی)).

صحيح ٨١ _ عن ابن عمر: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم اتخذ خاتماً من فضة، وجعل فصَّه مما يلي كفِّه، ونقش فيه: محمد رسول الله، ونهى أن يَنقش أحدا عليه، وهو الذي سقط من مُعَيْقِيب(١١٢) في بئر أريس)).

---

[٧٩] _ (قلت: إسناده ضعيف جداً، ورواه أبو الشيخ (ص ١٢٤) بإسناد آخر مثله في الضعف، لكن المتن صحيح بما تقدم ويأتي).

[٨٠] _ أخرجه أبوداود في ((اللباس)) برقم ٤٢٢٩ والمؤلف في ((اللباس)) برقم ١٧٤٢. (قلت: وقال المؤلف: ((قال محمد بن إسماعيل (يعني البخاري): حديث حسن صحيح)). قلت: وذلك لأن فيه إسحاق، لكنه قد صرح بالتحديث عند أبي داود، وهو مخرج في ((الإرواء)) ٣/٣٠٣ و٣٠٤).

[١١١] _ إخاله: واتە واهات بە بیریا. کەسی بێـژەریش خودی (صلت) بوو.

[٨١] _ وأخرجه البخاري في ((اللباس / باب نقش الخاتم)). ومسلم في ((اللباس)) برقم ٢٠٩١، وأبوداود في ((الخاتم)) برقم ٤٢١٨، والمؤلف والنسائي بنحوه في ((الزينة)). وابن ماجة برقم ٣٦٤٥ القسم الأول منه ((اتخذ خاتما من فضة وجعل فصه مما يلي كفه)). واتە ئیمامی ئیبنو ماجە بەشی یەکەمی فەرموودەکە بەم بێژەیە دەگێڕێتەوە: ((ئەمووستیلەیەکی لە زیو هەڵبژارد و نقێمەکەشی بە دیوی بەر لەپیدا دانابوو)).(قلت: وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح))).

[١١٢] _ مُعَيقيب: بضم الميم وفتح العين: بچوکردنەوەی (معقاب)ە سەر کێشی (مفصال) هاوەڵـێـکی بەڕێـزە و لە کۆنەوە موسـڵـمان ببوو، ئامادەی جەنگی بەدر ببوو لەگەڵ موسـڵـمانانیشدا کۆچی کردبوو بۆ حەبەشە، پاراستنی ئەمووستیلە مۆرەکەی پێـغەمبەری خوای صلى الله عليه و سلم لە ئەستۆدا بوو، لە سەردەمی ئەبو بەکرو عومەرو عوسمانیشدا بەرپرسی (بيت المال) بوو.

٨١ _ لە ئیبنو عومەرەوە: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمووستیلەیەكی لە زیو هەڵبژارد، نقێمەكەشی بە دیوی بەر لەپیدا دانابوو، (محمد رسول الله)ی لە سەر هەڵكەند بوو،یاساخی كردبوو كەسێكی تر هاوشێوەی لەسەر ئەمووستیلەكەی هەڵكەنێت، ئەو ئەمووستیلە بوو كە لە دەستی موعەیقیب كەوتە بیری ئەریسەوە.

صحيح ٨٢ _ عن جعفر بن محمد عن أبيه قال:((كان الحسنُ والحسينُ يَتَخَتَّمان في يَسارِهما)).

---

[٨٢] _ وأخرجه المؤلف في ((اللباس)) برقم ١٧٤٣. وعن ابن عمر عند أبي داود برقم ٤٢٢٧ أن النبي صلى الله عليه وسلم كان يتختم في يساره، وكان فصه في باطن كفه. واتە ئیمامی ئەبو داود لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم ئەمووستیلەكەی دەكردە دەستی چەپی و، نقێمەكەشی بەدیوی بەر لەپیدا دانابوو)). كردارەكەی حەسەن و حوسێنیش لێرەدا پەیڕەوكردنی پێغەمبەری خوا بوو صلى الله عليه و سلم چونكە ئەنجامدانی ئەو كارەی لە كۆتایدا بوو. (گوتم: بەڵكو ڕاست شیاوێتی (جوان) هەردوو كردارەكەیە، چونكە هیچ بەڵگەیەك لەسەر هەڵوەشاندنەوە (نسخ) بوونی نییە، وە فەرموودەی: ((ئەمووستیلەكەی دەكردە دەستی ڕاستی و پاشان گواستیەوە بۆ دەستی چەپی)) (صحيح) نییە، بەڵـكو لە فەرموودە (ضعيف)ەكانی (ضعيف الجامع)ە هەروەها فەرموودە هاوشێوە دژكارەكەشی بە بێژەی: ((ئەمووستیلەكەی دەكردە دەستی ڕاستی و دەیفەرموو: ڕاست لە چەپ شایستەترە بەڕازاندنەوە)) دیسان (ضعيف)ە و لە ((الضعيفة))دا بە ژمارە (٥٤٠٨) هەڵساوم بە (تخريج)كردنی، لە لایەكی تریشەوە فەرمایشتەكەی: ((گیانی سپاردو ئەمووستیلەكەی لە دەستی ڕاستیدا بوو))، ((ضعيف جداً))ەو لەوێدا بە ژمارە (٥٤٠٩) هەڵساوم بە ڕوونكردنەوەی. لە لایەكەوە فەرموودەكەی ئیبنوعومەری ئاماژەپێكراوی سەرەوەش فەرموودەیەكی (شاذ)ە چونـكە دژ بە گێڕانەوەی متمانەكارانە (الثـقات) بە بێژەی: (يمينه) واتە دەستی ڕاستی، وەكو ئەوەی لە فەرموودەكەی دواوەیدا هاتووەو هەڵیشساوم بە ڕوونكردنەوەی لە ((الإرواء))دا بە ژمارە (٣/٢٠٩و٣٠١) ولە لایەكی دیكەشەوە ئەوە فەرموودەیەكەی (صحيح)و (موقوف)ە لە ئیبنو عومەرەوە، كەواتە ئەمە هاوشێوەی فەرموودەكەی حەسەنو حوسێنە لە بەشەكەداو، سەنەدەكەشی (صحيح)و (موقوف)ە. فەرموودە (موقوف)ەكەی ئەنەسیش شایەتی بۆ ئەو دوو فەرموودەیە دەدەن. كە ئیمامی موسلیم لە ثـابتەوە لە ئەنەسەوە دەیگێڕێتەوە. ولا يضره أن المؤلف ضعفه كما يأتي لأنه من طريق قـتادة، وهذا من طريق ثابت كما ترى، فـتـنبه).

٨٢ _ جەعفەری كوڕی محمد لە بابیەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ((حەسەن و حوسەین ئەمووستیلەكانیان دەكردە دەستی چەپیان)).

صحيح ٨٣ _ عن أنس بن مالك: ((أنه صلى الله عليه وسلم كان يَتَخَتَّمُ في يمينه)).

٨٣ _ لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمووستیلەكەی دەكردە دەستی ڕاستی)).

صحيح ٨٤ _ عن ابن عمر قال: ((اتَّخَذَ رسول الله صلى الله عليه وسلم خاتما من ذهب، فكان يَلْبَسه في يمينه، فاتَّخَذَ الناس خواتيم من ذهب، فَطَرَحَه صلى الله عليه وسلّم وقال: ((لا ألبَسه أبدا)). فطرح الناس خواتيمهم)).

[٨٣] _ قلت: إسناده صحيح، لكن أعله المؤلف بالاضطراب في متنه، كما ذكر في الأصل عقبه، وهو الذي كنت ملت إليه في ((الإرواء)). والآن فقد رجعت عنه الى ترجيح رواية اليسار لمتابعة ثابت لقتادة كما ذكرت آنفاً، ولذلك قال الدارقطني: إنها المحفوظة، ولم يكن تبين لي وجهه هناك في ((الإرواء)) (٢٩٨/٣ و٣٠٢) فلينقل هذا إليه.

[٨٤] _ وأخرجه البخاري في ((اللباس / باب خواتيم الذهب)) ومسلم في ((اللباس / باب تحريم خاتم الذهب على الرجال ونسخ ما كان من إباحته في أول الأسلام)) برقم ٢٠٩١، وأبوداود برقم ٤٢١٨. وروى ابن ماجة برقم ٣٦٤٣ عن ابن عمر أن النبي صلى الله عليه وسلم ((نهى عن خاتم الذهب)) والمؤلف برقم ١٧٤١.

ئەم فەرموودەیە حەرامكردنی ئەمووستیلەی زێڕ بۆ پیاوان و هەڵوەشاندنەوەی (نسخ) حەڵاڵكردنی بە دەردەخات. هەروەها فەرموودەكان ئەوەش دەردەخەن كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم بە زۆری ئەمووستیلەكەی دەكردە دەستی ڕاستی و ئەمەش شیاوێتی ئەمووستیلەكردنە دەستی چەپ قەدەغە ناكات وەكو ئەوەی لە هەندێ فەرموودەدا چەسپاوە. والله أعلم. (گوتم: ڕاستیش ئەمەیە، بە پێچەوانەی ئەوەی ئاماژەی بۆكرد لە پێشێكی نزیكدا كەوا لە كۆتایدا ئەمووستیلەكەی دەكردە دەستی چەپی و (ضعيف)یەكەش بۆت ڕوون بویەوە، پاشانیش ئیمامی بوخاری لە (ریوایە) تێكدا زیادەیەكی خستۆتە سەرو دەفەرموێت: ((پاشان ئەمووستیلەیەكی لە زیو هەڵبژاردو خەڵكانیش ئەمووستیلەیان لە زیو هەڵبژارد)). ئەمەش بەڵگەیە كە فەرموودەكەی ئیبنو عومەری پێشوو بە ژمارە (٨١) بە نیسبەت ئەمەوە لە پاشەوەترە.

٨٤ _ لە ئیبنو عومەرەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمووستیلەیەکی لە زێـــڕ هەڵبژارد و، دەیکردە دەستی ڕاستی، خەڵکانیش ئەمووستیلەیان لە زێـــڕ هەڵبژارد، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فڕێیداو فەرمووی: ((هەرگیز لە دەستی ناکەم)). خەڵکیش ئەمووستیلەکانیان فڕێدا)).

## ١٣ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە سیفەتی شمشێرەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ٨٥ _ عن أنس قال: ((كانت قَبِيعة سيف رسولِ الله صلى الله عليه وسلم من فِضّةٍ)).

٨٥ _ لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە فەرموویەتی: ((سەر دەسكی شمشیرەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە زیو بوو)).

٨٦ _ عن سعيد بن أبي حسن البصري(١١٣) قال:صحيح ((كانت قَبيعةُ سيف رسول الله صلى الله عليه وسلم من فِضة)).

٨٦ _ لە سەعیدی كوڕی ئەبی حەسەنی بەصریەوە فەرموویەتی: ((سەر دەسك شمشێرەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە زیو بوو)).

ضعيف ٨٧ _ عن هود _ وهو ابن عبدالله بن سعْد _ عن جَدِّه (١١٤) قال: ((دخل رسول الله صلى الله عليه وسلم مكةَ يومَ الفتح وعلى سيفه ذهب وفِضة)). قال طالب: فسألته عن الفضة. فقال: ((كانت قبيعة السيف فضة)).

---

[٨٥] _أخرجه المؤلف في ((الجهاد)) برقم ١٦٩١ وأبوداود برقم ٢٥٨٣ والنسائي في ((الزينة)) والدارمي.
قلت: وإسناده صحيح، وحسنه المؤلف، وأعله أبوداود وغيره بما لا يقدح، وقد بينت ذلك في ((الإرواء)) (٨٢٢) وفي ((صحيح أبي داود)) (٢٣٢٩). (القَبيعة) بفتح القاف: واتە ئەوەی بە سەر دەسكی شمشێرەكەوەیە لە زیو یا ئاسن یا هیتر.

[٨٦] _ الحديث مرسل ولكن يشهد له الحديث السابق وقد أشار إليه المؤلف في ((سننه)) بعد حديث رقم ١٦٩١، وأخرجه أبوداود في ((الجهاد)) برقم ٢٥٨٤.

[١١٣] _ ئەم سەعیدە برای حەسەنی بەصریە و باوەڕ پێكراوەو (ثقة) لە ناوەندەكانی (تابعین)ە.

[٨٧] _ أخرجه المؤلف برقم ١٦٩٠ وهو مما تفرد به. (قلت: وقال: ((حسن غريب)). وهذا من تساهله الذي عرف به، فإنه حديث منكر لتفرد هود به، وهو مجهول كما قال ابن القطان وغيره، ولذلك خرجته في ((الضعيفة)) ٥٤٠٦).

٨٧ _ لە هودەوە _ كە كوڕی عەبدولاّی كوڕی سەعدە _ لە بابـپیـــریەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ڕزگاركردندا (يوم الفتح) چووە مەككەوەو بەسەر شمشێرەكەیەوە زێڕ و زیو هەبوو)). طالب دەڵێت: سەبارەت بە زیوەكە لێم پرسی. فەرمووی: ((سەر دەسكی شمشێرەكە زیو بوو)).

ضعيف ٨٨ _ عن ابن سيرين قال: صَـنَـعْـت سيفي على سيفِ سَمُرةَ بن جُندب، وزعم سمرة ((أنه صنع سيفَــه على سيف رسول الله صلى الله عليه وسلم، وكان حَـنَـفِـيّـا *)).

٨٨ _ لە ئیبنو سیرینەوە فەرموویەتی: شمشێرەكەم هاوشێوەی شمشێرەكەی سەموورەی كوڕی جوندوب دروستكرد، سەموره وای ڕادەگەیاند ((كەوا شمشێرەكەی هاوشێوەی شمشێرەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ دروستكردوە كە حەنەفی بووە)).

[١١٤] _ باپیــرێـتی لە دایكەوە و ناوی (مَـزيد)ی كوڕی مالكی عەصری كوڕی عبدالقیسەو، هاوەڵـێـكی بەڕێــزە. گوتراویشە ناوی (مزيدة)یە لە سەر كێــشی (كبيرة).

[٨٨] _ وأخرجه المؤلف في ((الجهاد)) برقم ١٦٨٣.

(قــلـت: وضعفه بقوله: ((حديث غريب لا نعرفه إلا من هذا الوجه، وقد تكلم يحيى القـطان في عثمان بن سعيد الكاتب وضعفه من قـبَـل حفظه)). ولذلك ضعفها الحافظ في ((التـقريب))).

*(حـنـفيا): واتە هاوشێوەی شمشێرەكانی (بني حنيفة)، هۆزەكەی موسەیلەمەیە چونكە دروستكاری شمشێرەكە لەو هۆزە بوو، واتە كاردەكات هاوشێوەی كارەكانی ئەوان كە بە دروستكردنی شمشێری ڕەسەن ناسرابوون.

## ١٤ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە سیفەتی قەڵغانەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ٨٩ _ عن الزبير بن العوام قال: كان على النبي صلى الله عليه وسلم يومَ أُحدٍ درعان، فَنَهَضَ إلى الصخرة فلم يَستطع، فَأقعَدَ طلحة تحته، وَصعد النبي صلى الله عليه وسلم حتى استوى على الصخرة، قال: سمعت النبي صلى الله عليه وسلم يقول: ((أوْجَبَ طَلحَة))

((پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی ئوحدا جووتێ قەڵغانی پۆشیبوو، ڕاپەڕی بۆ سەر بەردەكە بەڵام لە توانایدا نەبوو، ئەوجا طەلحەی دانیشاند لە ژێر خۆیداو، پێغەمبەری خوا ﷺ سەركەوت تا ڕاست بۆوە سەر بەردەكە، ئەوسا فەرمووی: گوێبیستی پێغەمبەری خوابووم ﷺ دەیفەرموو: طەلحە بەهەشتی بۆ شایستە بوو.

_ عن الصائب بن يزيد: حسن ٩٠_((أن رسول الله صلى الله عليه وسلم كان عليه يوم أحدٍ درعان قد ظاهر بينهما)).

---

[٨٩] _ أخرجه المؤلف في ((الجهاد)) برقم ١٦٩٢ وفي ((المناقب)) برقم ٣٧٣٩.

(قلت: وقال في الموضع الأول: ((حديث حسن غريب لا نعرفه إلا من حديث محمد بن إسحاق)) وفي الموضع الأخر: ((حسن صحيح غريب)). فلعل لفظة (صحيح) مقحمة من بعض النساخ، فإن ابن إسحاق فيه خلاف معروف لا سيما إذا عنعن كما هنا، لكن قد صرح بالتحديث عند غيره كما في ((صحيح أبي داود ٢٣٣٢).

طلحة بن عبيدالله القرشي: تەڵحەی كوڕی عو بیدوڵای قورەشی یەكێكە لە مژدە پێداوانی بەهەشت ویەكێكیشە لە شەش كەسی خاوەن شوراو لە جەنگی جەمەل لە ساڵی ٣٦ كۆچی و لە تەمەنی ٦٤ ساڵیدا كوژرا. (أوجب طلحة): واتە بەهەشتی بۆ دەستەبەر بوو . (الدِرع)، بكسر الدال: جوبەیەكە لە ئاسن و، بە (زرد)یش ناودەبرێت و بە ئەڵقە دروست دەكرێت و یەكێكە لە جلوبەرگەكانی جە نگ.

[٩٠] _ وأخرجه أبوداود برقم ٢٥٩٠ عن رجل قد سماه، ولعله طلحة كما في البخاري.

٩٠ _ لە صائیبی کوڕی یەزیدەوە: ((پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەنگــی ئوحدا جووتێ قەڵغانی پۆشیبوو بە سەریەکدا)).

(قلت: هذا التخريج يوهم أن الحديث في البخاري، وليس كذلك، وأنه ليس عند أبي داود من رواية السائب، وليس كذلك أيضا، والصواب أن يقال: هو عنده عن السائب بن يزيد عن رجل قد سماه. أي أن الحديث عنده من مسند الرجل وليس من مسند السائب. وقد قيل: عنه عن الرجل عن طلحة، وقد بينت ذلك في ((صحيح أبي داود)) (٢٣٣٢). وأخرجه ابن ماجة في ((الجهاد / باب السلاح)) ك ٢٤ ب ١٨ ح ٢٨٠٦. (ظاهر بينهما): واتە کۆیکردبوونەوەو بەسەریەکدا پۆشیبوونی. وەکو ئەوەی یەکێکی کردبێت بە ڕووی دەرەوەی قەڵغانەکە و ئەوەی تریشیان بە بەری قەڵغانەکە، پۆشینی جووتێ قەڵغانیش بەڵگەی گرنگیدانی زیادە بە خۆپاراستن لە جەنگدا و بۆ ئەوەی یارمەتیدەریش بێت بۆ چوونە پێش و گوێنەدان بە دوژمن.

## ١٥ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە سیفەتی خوودەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح[٩١] _ عن أنس بن مالك: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم دخل مكة ﴿ عام الفتح / ١٠٦ ﴾ وعليه مِغفر،(١١٥) فـ ﴿ لَمّـا نزعه ﴾ قيل له: هذا ابن خَطَـلٍ متعلق بأستار الكعبة. فقال: اقتـلوه)).(١١٦) ﴿ قال ابن شهاب: وبلغني أن رسول الله صلى الله عليه وسلم لم يكن يومئذ مُحرِماً ﴾.

٩١ _ لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ﴿ لە ساڵی ڕزگاركردندا (عام الفتح) / ١٠٦ ﴾ چووە مەككەوەو خوودەیەكی بە سەرەوە بوو كە ﴿دایكەند﴾ پێی گوترا: ئەمە ئیبنو (خَطَل)ە خۆی هەڵواسیوە بە پەردەكانی كەعبەوە فەرمووی: بیكوژن)).﴿ ئیبنو شهاب فەرموویەتی: هەواڵم پێگەشت كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژە (إحرام)ی نەبەستبوو.

---

[٩١] _ وأخرجه البخاري في ((الحج)) و ((اللباس)) و ((الجهاد)) و ((المغازي)) ومسلم في ((المناسك)) رقم ١٣٥٧ (باب جواز دخول مكة بغير إحرام) وأبوداود في ((الجهاد)) والنسائي في ((الزينة)) وابن ماجة في ((الجهاد)) برقم ٢٨٠٥ والمؤلف في ((الجهاد)) برقم ١٦٩٣. (قلت: وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح غريب)).

[١١٥] _ المغفر: لەسەر كێشی (المبضع)ە قەڵغانێكە بە گوێرەی سەر دروست دەكرێت و لە ژێر كڵاوەوە لە سەر دەكرێت.

[١١٦] _ چو نكە (ابن خطل) لە ئیسلام هەڵگەڕابۆوەو (إرتد)، موسڵمانێكیشی كوشتبوو خزمەتی دەكرد.

## ١٦_ بەشى ئەوەى سەبارەت بە مێزەرەكەى (عمامة)ى پێغەمبەرى خوا ﷺ هاتووە:

صحيح[٩٢] _ عن جابر قال: ((دخل النبيّ صلى الله عليه وسلم مكةَ يومَ الفتحِ وعليه عِمامة سوداء)).

٩٢ _ لە جابرەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەرى خوا ﷺ لە ڕۆژى رزگاركردندا (يوم الفتح) چووە مەكەوە و مێزەرێكى ڕەشى بە سەرەوە بوو)).

صحيح ٩٣ _ عن عمروٍ بن حريث: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم خطب الناسَ وعليه عِمامةٌ سوداءُ)).

٩٣ _ لە عەمرى كوڕى حەديسەوە: ((پێغەمبەرى خوا ﷺ وتارى بۆ خەڵك دەدا و مێزەرێكى ڕەشى بە سەرەوە بوو)).

٩٤_ عن ابن عمر قال: صحيح ((كان النبي صلى الله عليه وسلم إذا اعتمَّ سَدَلَ عِمامته بين كتفيه)).

---

[٩٢] _ وأخرجه مسلم في ((المناسك)) وأبوداود في ((اللباس)) برقم ٤٠٧٦ وابن ماجة في ((اللباس)) برقم ٣٥٨٥. والمؤلف في ((الجهاد)) وفي ((اللباس)) برقم ١٧٣٥ والنسائي في ((الزينة)).
(قلت: وابن ماجة أيضاً (٢٨٢٢و٣٥٨٥) والدارمي (٨٤/٢) وأحمد (٣٦٣/٣و٣٨٧) وابن سعد (٤٥٥/١) وأبو الشيخ (١١٦) كلهم عن أبي الزبير. وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح)) وهو كما قال لولا عنعنة أبي الزبير عندهم جميعاً. لكن له شاهدان يتقوى بهما، أحدهما عن ابن عمر، رواه ابن ماجة.بوالآخر رواه أبو الشيخ عن أنس رضي الله عنهم. ويشهد له في الجملة الحديث الذي بعده).

[٩٣] _ وأخرجه ابن ماجة في ((اللباس)) برقم ٣٥٨٤ وزاد فيه ((يخطب على المنبر)) وأبو داود في ((اللباس)) برقم ٤٠٧٧ ولفظه ((رأيت النبي صلى الله عليه وسلم على المنبر وعليه عمامة سوداء قد أرخى طرفها بين كتفيه)) واتە ئیمامی ئەبو داود فەرموودەكە دەگێرێتەوە بەم بێژەیە: ((پێغەمبەرى خوام صلى الله عليه و سلم بە سەر مینبەرەوە بینی مێزەرێكى ڕەشى بە سەرەوە بوو لاكەى شۆڕ كردبۆوە نێوان هەردوو شانى)). وأخرجه مسلم في ((الحج / باب جواز دخول مكة بلا إحرام)) برقم ١٣٥٩ والنسائي.

قال نافع: وكان ابن عمر يفعل ذلك. قال عبيدالله: ورأيت القاسم بن محمد و سالم يفعلان ذلك.

٩٤ _ لە ئیبنو عومەرەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر مێزەری لە سەر بکردبا لایەکی مێزەرەکەی بەر دەدایەوە نێوان هەردوو شانی)).

نافع دەڵێت: ئیبنو عومەر ئەو کارەی ئەنجام دەدا. عوبیداللە دەڵێت: بینیم قاسمی کوڕی محمد و سالم ئەو کارەیان ئەنجام دەدا.

صحيح ٩٥ _ عن ابن عباس: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم خطب الناس وعليه عِمامةٌ دَسْماء)).

٩٥ _ لە ئیبنو عەباسەوە: ((پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ خەڵك دەداو مێزەرێکی چەوری بە سەرەوە بوو)).

---

[٩٤] _ وأخرجه المؤلف في ((اللباس)) برقم ١٧٣٦ وهو مما تفرد به.

(قلت: وقال: ((حسن غريب)). قلت: وقد خرجته، وذكرت له طرقاً وشواهد يتقوى بها في ((الصحيحة)) ٧١٦).

(أعتم): واتە مێزەری کردە سەر.

[٩٥] _ أصل هذا الحديث عند البخاري في ((كتاب المناقب، مناقب الأنصار)) عن ابن عباس قال: ((خرج رسول الله وعليه ملحفة متعطفا بها على منكبيه وعليه عصابة دسماء)).

واتە ئیمامی بوخاری لە ئیبن عەباسەوە فەرموودەکە دەگێڕێتەوەو دەفەرمێت: ((پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم چووە دەرەوە و داپۆشەرێکی دابوو بە سەر هەردوو شانیدا و مێزەرێکی چەوری بە سەرەوە بوو)) وزاد فضل الأنصار.

(قلت: ورواه أحمد (٢٣٣/١) مختصراً مثل رواية المؤلف).

(العمامة والعصابة): لە زمانی عەرەبیدا هەمان مانا دەبەخشن.

(الدسماء): واتە لەکەی گرتبوو بەو چەوریەی پرچی بۆن خۆش دەکرد.

## ١٧_ بەشی ئەوەی سەبارەت بە (إزار)ی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ٩٦_ عن أبي بُرْدَة عن أبيه(١١٧) قال: ((أخرجت إلينا عائشة رضي الله عنها كِساءً مُلَبَّداً، وإزاراً غَليظاً، فقالت: قُبِضَ رُوحُ رسولِ الله صلى الله عليه وسلم في هذين)).

٩٦_ لە ئەبی بوردەوە لە باببیەوە فەرموویەتی: ((عائیشە ڕەزای خوای لێبێت پۆشاکیکی پەستراوو، (إزار) ێکی زبرو ئەستوری بۆ دەرهێناین و، فەرمووی: لەم دوانەدا پێغەمبەری خوا ﷺ گیانی سپارد)).

٩٧ _ عن الأشعث بن سُلَيم قال: سمعت عمتي تُحَدِّثُ عن عمها(١١٨) قال: صحيح ((بينا(١١٩) أنا أمشي بالمدينة إذا إنسان خلفي يقول: ((ارفع إزارك" (١٢٠)

---

[٩٦] _ وأخرجه مسلم في ((اللباس)) حديث رقم ٢٠٨٠، وأبو داود في ((اللباس/ باب اللباس الغليظ)) ك ٣٦ ب ٨ ح ٤٠٣٦،وابن ماجة والمؤلف في ((اللباس)) برقم ١٧٣٣، وأخرجه البخاري في ((اللباس)) و((الخمس)).
(قلت: وكذا أحمد (٣٢/٦) وابن سعد (٤٥٣/١) وأبو الشيخ (١٠٧) وأستدركه الحاكم (٦٠٨/٢) على الشيخين فوهم، وتبعه عليه الذهبي!).

[١١٧] _ بابی (بوردە) (ئەبی موسای ئەشعەریە) و هاوەڵێکی بە ناوبانگە. (الملبدة): واتە پیناوی یا زبر و ڕەق کە وەکو پەستراوی لێهاتبوو. (الإزار) بكسر الهمزة: واتە داپۆشەر، مەبەستیش بە (إزار) ئەو شتەیە کە خوارووی جەستە دادەپۆشێت، بەڵام (الرداء) بریتیە لەوەی کە سەرەوەی جەستە داپۆشێت.

[٩٧] _ أخرجه أحمد والبيهقي ((الجامع الصغير)). (قلت: وأخرجه أبو الشيخ (ص ١٠٨) مختصراً من الوجه المذكور، وعمة الأشعث لا تُعرف، لكن للحديث شاهد يتقوى به من حديث الشريد بن سويد خرجته في ((الصحيحة)) ١٤٤١).

[١١٨] _ پوری (الأشعث) ناوی (رهم)ە، ناوی مامیشی عوبێدی کوڕی خالدی ئەلمحاربیە.

[١١٩] _ في نسخة (بينما) بأثبات الميم.

[١٢٠] _ واتە (إزار)ەکەت لە زەوی بەرزکەرەوە .

فإنه أتقى(١٢١) فإذا هو رسول الله صلى الله عليه وسلم، فقلت: يا رسول الله إنما هي بُردَةٌ مَلحاء،(١٢٢) قال:((أما لك فِيّ أسوةٌ)) ((فنظرت فإذا إزاره إلى نِصفِ ساقَيه)).

٩٧ _ له ئەشعەثى كوڕى سولەيمەوە فەرمووى: گوێبیستی پورم بووم لە مامیەوە دەیگێڕایەوەو دەیفەرموو: ((لە كاتێكدا لە مەدینە ڕێم دەكرد لە پڕ مرۆڤێك لە پشتمەوە فەرمووی: (إزار)ەكەت بەرزكەرەوە، چونكە پارێزترە، تەماشا دەكەم پێغەمبەری خوایە ﷺ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕاستیدا ئەمە كراسێكی میللداری ڕەش و سپییە، فەرمووی: ((ئایا من نموونەی پێشەنگێكی باش نیم لاسایم بكەیتەوە)). ئەوجا (إزار)ەكەیم تەماشا كرد تا نیوەی قاچەكانی بوو.

ضعيف[٩٨] ٩٨ _ عن سلمة َبن ِالأكوع قال: ((كان عثمان بنُ عفان يأتَـزِرُ إلى أنصاف ساقَيه)) وقال: صحيح ((هكذا كانت إزرةُ(١٢٣) صاحبي)). يعني النبي صلى الله عليه وسلم.

٩٨ _ لە سەلەمەی كوڕی ئەكوەعەوە فەرموویەتی: ((عوسمانی كوڕی عەفان تا نیوەی قاچەكانی (إزار)ی دەپۆشی)) و دەیفەرموو: ((بەم شێوە بوو (إزار) ی هاوەڵەكەم)). واتە پێغەمبەر ﷺ.

---

[١٢١] _ في نسخة (أنقى) بالنون: واتە پاكترە و پیس نابێت و، (أبقى): واتا جل ماوەیەكی زیاتر دەمێنێتەوە. (قلت: وهذه النسخة هي الصواب لمطابقتها لرواية الطيالسي (١٨٠٤_ ترتيبه) ومن طريقه أخرجه المؤلف، ولمسند أحمد أيضاً (٣٦٤/٥) وقد رواه من طريقين عن الأشعث بن سليم ولنقل ابن كثير عن المصنف هنا).

[١٢٢] _ مَلحاءُ: بفتح الميم تأنيث (أملح): واتا سپی تێدایە تێكەڵ بەڕەش، چونكە (مَلحاء) ئەوەیە كە خەتی سپی و ڕەشی تێدابێت.

[٩٨] _ حديث صحيح، في إسناده موسى بن عبيدة وهو ضعيف، لكن المرفوع منه له شواهد كثيرة بعضها في ((المشكاة)) (٤٣٣).

[١٢٣] _ إزْرة: بكسر الهمزة وسكون الزاى: ناوێكە بۆ ئەو شێوەیەی كە (إزار)ە كەی تێدا دروستە بە جۆری دانشتنێك لە دانشتنەكان و پۆشینێك لە پۆشینەكان.

صحيح ٩٩_عن حذيفة بن اليمان قال: أخذ رسول الله صلى الله عليه وسلم بعضلة ساقِي أو ساقِه، فقال: ((هذا موضع الإزار، فإن أبيتَ فأسفلُ، فإن أبيتَ فلا حق للإزار في الكعبين)).

٩٩ – لە حوذیفەی کوڕی یەمانەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ماسوولکەی لاقی گرتم یا لاقی خۆی گرت‌و، فەرمووی: ((ئەمە جێگەی (إزار)ە، ئەگەر نەتویست ئەوجا خوارتر، ئەگەر نەشتویست ئەوا مافی (إزار) نی یە قاپەکان داپۆشێت)).

[٩٩] _ وأخرجه المؤلف في ((اللباس)) برقم ١٧٨٤ وابن ماجة برقم ٣٥٧٢ والنسائي في ((الزينة)).
(قلت: وكذا الطيالسي (١٧٩٨) وإسناده صحيح لغيره كما بينته في ((الصحيحة)) ٢٣٦٦).
(فلا حق للأزار في الكعبين): واتە قاپەکان بە (إزار) دامەپۆشە.

## ١٨ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە چۆنیەتی ڕێکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

ضعيف ١٠٠ _ عن أبي هريرة قال: ((ما رأيت شيئاً أحسن من رسول الله صلى الله عليه وسلم، كأن الشمسَ تجري في وجهه، ولا رأيت أحداً أسرعَ في مِشيتِه من رسول الله صلى الله عليه وسلم، كأنما الارضُ تُطوى له، إنا لَنُجْهِدُ أنفُسَنا، وإنه لغيرُ مُكْتَرِثٍ)).

١٠٠ _ لە ئەبی هوڕیرەوە فەرموویەتی: ((هیچ شتێکم نەبینیوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ چاکتر و جوانتربێت، هەروەکو ئەوەی ڕۆژ بە ڕوویدا تێبپەڕێت، هیچ کەسێکیشم نەبینیوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ خێراتر بێت لە ڕێکردنیدا، هەروەکو ئەوەی زەوی بۆ نزیك بکرێتەوە و بهێنرێتە پێشەوە، ئێمە خۆمان ماندوو دەکردو، ئەویش گوێی بە ڕێکردن نەدەدا)).

---

[١٠٠] _ أخرجه المؤلف في ((مناقب النبي صلى الله عليه وسلم)) برقم ٣٦٥٠. (قلت: وقال: ((حديث غريب)). يعني لأن فيه ابن لهيعة وهو ضعيف لسوء حفظه، ومن طريقه أخرجه أحمد (٣٥٠/٢ و٣٨٠) وابن سعد (٤١٥/١) وأبو الشيخ ص ٢٤٨). (لنجهد) بضم النون وكسرها ويجوز فتحها.

## ١٩ _ باب ما جاء في تَـقَـنُّع رسول الله ﷺ :
(قلت: أسند فيه حديث أنس المتقدم برقم ٢٦)

## ٢٠ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە چۆنیەتی دانیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

ضعيف ١٠١ _ عن قَـيْـلَـةَ بنتِ مَـخْـرمَـةَ: ((أنها رأت رسول الله صلى الله عليه وسلم في المسجد وهو قاعد القُـرفُـصاء (١٢٤) قالت: فلما رأيت رسول الله صلى الله عليه وسلم المتـخشّـع في الجلسة، فـأُرْعِـدْ من الفـرَق)).(١٢٥)

١٠١ _ لە قەیلەی كچی مەخرەمەوە: ((كە بینیبووی پێغەمبەری خوا ﷺ بە هەڵتروشكانەوە (قرفصاء) لە مزگەوتدا دانیشتبوو قەیلە فەرمووی: كە بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ بەرێزو ملكەچیەوە دانیشتبوو، لە ترساندا لەرز دایگرتم)).

صحيح ١٠٢ _ عن عباد بن تميم عن عمه (١٢٦): ((أنه رأى النبي صلى الله عليه وسلم مستلقيا في المسجد، واضعا إحدى رِجليه على الأخرى)).

---

[١٠١] _ أخرجه أبوداود في ((الأدب / باب في جلوس الرجل)) رقم ٤٨٤٧. وأنظر الترمذي في حديث رقم ٢٨١٥. (قـلـت: الأولى أن يقال: انظر الحديث المتـقدم برقم (٥٣) فـإن إسناده إسناد هذا، وتـقدم عزوه هناك الى الترمذي بالرقم المذكور هنا، وتـكلمت على إسناده بما خلاصته أنه قريب من الحسن. وقد أخرجه البخاري في ((الأدب المفرد)) (١١٧٨). وله شاهد من حديث أبي أمامة الحارثي مرفوعا بلفظ: ((كان إذا جلس جلس القرفصاء)). واتە ئەبی ئومامەی حارپی دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ((هەركات دانیشتبا بە هەڵتروشكانەوە دادەنیشت)). أخرجه أبو الشيخ (٢٤٧) بسند لا بأس به في الشواهد).

[١٢٤] _ الـقُـرفُـصاء: بضم القاف والفاء: واتە دانیشتبوو بە دانیشتنێكی تایبەت بەوەی دابنیشێـت لەسەر سمتەكانیو ڕانیشی بلـكێـنێـت بە سكیەوەو بە دەستیشی لاقەكانی بگرێت.

[١٢٥] _ واتە ترس و لەرزو داچەڵـەكین چونكە شكۆداریەكی مەزنی پێـوە دیار بوو.

١٠٢ _ لە عەبادی كوڕی تەمیمەوە لە مامیەوە: ((كە بینیبووی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتدا ڕاكشابوو، پێیەكی خستبووە سەر ئەوی تر)).

صحيح ١٠٣ _ عن أبي سعيد الخدري قال: ((كان رسول الله صلى الله عليه وسلم إذا جلس في المسجد (١٢٧) احتَبى (١٢٨) بيديه)).

١٠٣ _ لە ئەبی سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: ((هەركات پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتدا دابنیشتایە پشتی و لا قەكانی بە دەستی كۆدەكردەوە (احتبى))).

---

[١٠٢] _ أخرجه البخاري في ((الصلاة)) و ((اللباس)) و ((الأستئذان))، ومسلم في ((اللباس)) برقم ٢١٠٠، وأبوداود في ((الأدب))، والنسائي ومالك في ((الصلاة))، والمؤلف في ((الأدب)) برقم ٢٧٦٦. (قلت: وقال: ((حديث حسن صحيح)).

[١٢٦] _ مامی (عەباد)، (عەبدوڵای كوڕی عاصی كوڕی محمد)ە، هاوەڵێكی بە ناوبانگەو، دەگوترێت ئەوە بووە كە (موسەیلەمەی درۆزنی) كوشتووە.

[١٠٣] _ أخرجه البيهقي في ((السنن)) وأبوداود في ((الأدب)) برقم ٤٨٤٦ والمؤلف. (قلت: لا معنى لذكر المؤلف هنا لأن المراد سننه، ولم يروه فيه، ولذلك لم يعزه إليه السيوطي في ((الجامع))، وإسناده ضعيف جداً، لكن له شواهد كثيرة تدل على أن له أصلا أصيلا، بعضها في ((مسلم))، وقد خرجتها في ((الصحيحة)) (٨٢٧) فراجعه إن شئت.

[١٢٧] _ في نسخة: ((في المجلس)).

[١٢٨] _ أحتبى الرجل: ئەگەر پشتی و هەردوو لاقی بە هەردوو دەستی كۆكردەوە، ئەمەجۆرە دانیشتنێكە جێگەی پاڵدانەوەی دیوار دەگرێتەوە .

## ٢١ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە پاڵدانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ١٠٤ _ عن جابر بن سمرة قال: ((رأيت رسول الله صلى الله عليه وسلم متكئاً على وسادة على يساره)).

١٠٤ _ لە جابری كوڕی سەمورەوە دەفەرمێت: ((بينيم پێغەمبەری خوا ﷺ پاڵی دابووە سەر باليفێك لە لای چەپيەوە)).

صحيح ١٠٥ _ عن عبد الرحمن بن أبي بكرة عن أبيه (١٢٩) قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:((ألا أحَدِّثُكُمْ (١٣٠) بأكبرِ الكبائر؟ قالوا: بلى يا رسول الله. قال: ((الإشراكُ بالله، وعقوقُ الوالدين)). قال: وجلس رسول الله صلى الله عليه وسلم وكان متكئاً قال: ((وشهادة الزور، أو قول الزور)). قال: ((فما زال رسول الله صلى الله عليه وسلم يقولها حتى قلنا: ليتَه سكت)).

١٠٥ _ عبدولرحمانی كوڕی ئەبی بەكرە لە بابيەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئايا دەتانەوێت گەورەترينی تاوانە

---

[١٠٤] _ المؤلف في ((الأدب)) برقم ٢٧٧١ وأبوداود في ((اللباس)) برقم ٣١٤٣. (قلت: وحسنه المؤلف، وهو على شرط مسلم، وأخرجه أحمد أيضاً (٨٦/٥و٨٧) وأبوالشيخ (٢٤٧). ولعل المؤلف لم يصححه، لأنه أعله في الأصل (رقم ١٢٦) بتفرد إسحاق بن منصور بقوله: ((على يساره)). وهذا بالنسبة الى ما بلغه، وإلا فقد تابعه عبدالرزاق عند أحمد (٨٦/٥و٨٧) وفيه عنده قصة. وهي عند مسلم (١٦٩٢) وأبي داود (٤٤٢٢) وأحمد أيضاً (١٠٢/٥و١٠٣) من طرق أخرى دون الأتكاء، وهي مخرجة في ((الإرواء)) ٣٥٤/٧و٣٥٥).

[١٠٥] _ أخرجه المؤلف في ((البر)) برقم ١٩٠٢ و((التفسير)) و((الشهادات)) والبخاري في ((الشهادات)) وفي ((إستتابة المرتدين)) وفي ((الأستئذان)) وفي ((الأدب)) ومسلم في ((الإيمان)).

[١٢٩] _ بابی عبدالرحمن: (ئەبو بەكرە) يە و ناوی (نوفەيعی كوڕی حارپە) و هاوەڵێكە بە نازناوەكەيەوە ناسراوە چونكە لە (تائيف)ەوە دابەزی بە بەكرەيەكەوە و ئيتر پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم ئەو نازناوەی بۆ دانا و لوتكەش بوو لە بە جێهێنانی پەرستنەكاندا.

[١٣٠] _ في نسخة: أُخْبِرُكم.

گەورەكانتان بۆ باسبكەم؟ گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: ((هاوەڵ بۆ خوا پەیدا كردن‌و، بە گوێ نەكردنی دایك‌و باب)). گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پاش ئەوەی پاڵیدابۆوە دانیشت و فەرمووی: ((شایەتی بەدرۆ، یا ئاخاوتنی بە درۆ)). گوتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام دەیگوتەوە تا گوتمان: خۆزگە بێدەنگ دەبوو)).

صحيح ١٠٦ _ عن أبي جحيفة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:((أما أنا فلا آكل متكـئاً، ﴿ لا آكل متكئاً /١٢٥ ﴾)).

١٠٦ _ لە ئەبی جەحیفەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەڵام من هەرگیز خۆراك ناخۆم بە پاڵدانەوە، ﴿ خۆراك ناخۆم بە پاڵدانەوە: ١٢٥ ﴾)).

•

[١٠٦] _ أخرجه أبوداود في ((الأطعمة)) ح ٣٧٦٩، والبخاري في ((الأطعمة))، والمؤلف وابن ماجة فيه. (قلت: وقال المؤلف (١٨٣١): ((حديث حسن صحيح))، وهو مخرج في ((الإرواء)) (١٩٦٦).

## ٢٢_ بەشی ئەوەی سەبارەت بە خۆ بە سەردادانی (اتكاء) پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە[١٣١]

ضعيف [١٠٧] _ عن الفضل ابن عباس قال: ((دخلتُ على رسول الله صلى الله عليه وسلم في مرضه الذي توفي فيه، وعلى رأسه عِصابة صفراءُ. فسلمت عليه، فقال: ((يا فضل!)). فقلت: لبَّيك يا رسول الله. قال: ((اشدُدْ بهذه العِصابة رأسي)). قال: ففعلت، ثم قعد فوضع كفّه على منكبي، ثم قام فدخل في المسجد. وفي الحديث قصة)).

١٠٧ _ لە فەضلی کوڕی عەباسەوە فەرموویەتی: ((چوومە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی نەخۆشیەکەیدا کە تیایدا گیانی سپاردو، سەرپێچێکی زەردی بەسەرەوە بوو. سلاوم لێکرد، فەرمووی: ((ئەی فەضل!)). گوتم: فەرموو ئامادەم ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: ((بەم سەرپێچە بە توندی سەرم ببەستە)). گوتی: بەجێم گەیاند، پاشان دانیشتو دەستی خستە سەر شانم، پاشانیش هەستاو چووە مزگەوتەکەوە. لە فەرموودەکەشدا چیرۆکێك هەیە.

---

[١٣١] _ مەبەست بەم بەشە دەرخستنی خۆ بە سەردادانی پێغەمبەری خوایە بە سەر یەکێك لە هاوەڵانیدا لە باری ڕێکردندا و لە کاتی تووشبوونی بە نەخۆشی یا شتێکی لەو جۆرە، کەچی بەشی پێشووتر سەبارەت بە پاڵدانەوەی پێغەمبەری خوا بوو صلی الله علیه و سلم لە باری دانیشتندا.

[١٠٧] _ (قلت: إسناده ضعيف، ورجاله ثقات غير عطاء بن مسلم الخفاف، قال الحافظ في ((التقريب)): ((صدوق يخطيء كثيراً)) ومن طريقه أخرجه أبو يعلى في ((مسنده)) بتمامه، وقد ساقه الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (٩/ ٢٥و٢٦) من رواية الطبراني في ((الكبير)) و ((الأوسط)) وقال: ((وفي إسناد الطبراني من لم أعرفه)). وقال الذهبي: ((أخاف أن يكون كذباً مختلقاً)). انظر تخريجي على ((فقه السيرة)) الأستاذ الغزالي ص ٤٩٦ _ الطبعة الرابعة).

## ٢٣ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە گوزەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ١٠٨ _ عن محمد بن سِيرين قال: ((كنا عند أبي هريرة وعليه ثوبان مُمَشَّقَان(١٣٢) من كَتّان، فَتَمَخَّط في أحدهما فقال: بَخٍ ، بَخٍ ،(١٣٣) يَتَمَخَّطُ أبو هريرة في الكتان! لقد رأيتُني وإني لأخِرُّ فيما بين منبر رسول الله صلى الله عليه وسلم وحُجرةِ عائشةَ رضي الله عنهما مَغشياً عليَّ، (١٣٤) فيجيء الجائي فيضع رجله على عنقي، يرى أن بِي جنونا وما بي جنون، وما هو إلا الجوع)).

١٠٨ _ لە محمدی كوڕی سیرینەوە فەرموویەتی: ((لە خزمەتی ئەبو هورەیرەدا بووین و دوو پۆشاكی كەتانی بە گڵەسوور ڕەنگكراوی پۆشیبوو، بە یەكێكیان لووتی سڕی و ئەوجا فەرمووی: بەخ بەخ ئەبو هورەیرە بە كەتان لووت دەسڕێ! دڵنیا بە لە نێوان مینبەرەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ و ژوورەكەی عائیشەدا دەكەوتم و دەبورامەوە، كەسێ هاتوو دەهات و پێی دەنا بە ملمدا، وایدەزانی شێت بوومە و شێتیش نەبووم، جگە لە برسێتی هیچی تر نەبوو)).

---

[١٠٨] _ وأخرجه البخاري في ((كتاب الزهد)) حديث رقم ٢٣٦٨.(قلت: وقال: ((حديث حسن صحيح)).

[١٣٢] _ واتە رەنگكرابوو بە ( مشق ) كە گڵێكی سوورە. گوتراویشە بە ( المغرة) واتە خوومی سوور.

[١٣٣] بخْ بسكون الخاء فيهما، وبكسرها أيضا: وشەیەكە لە كاتی رەزابوون و سەرسوڕمان بە شتێك دەگوترێت و دەڵێیت: بخْ بخْ، بخٍ بخٍ.

[١٣٤] _ ئەبو هورەیرە سەروكاری ( أهل الصفة ) ی هەژارانی پێغەمبەری خوا بوو صلى الله عليه وسلم، بارودۆخی ئەبو هورەیرەش هەڵگێراوەتە سەر ئەو ماوەی كە لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم خواردن نەبوو هاوكاریان بكات. لە راستیدا ئیمامی ( الترمذي) لێرەدا ئەم فەرموودەیە باس دەكات بۆ ئەوەی تەنگی ژیانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم بخاتە ڕوو، چونكە ئەگەر خواردنی بوایە هاوەڵانی بە جێنەدەهێشت بەو شێوەیە.

١٠٩ _ عن مالك بن دينار قال: صحيح ((ما شَبِعَ رسولُ الله صلى الله عليه وسلم من خبزٍ قَطّ، ولا لحمٍ إلا على ضَفَفٍ)).(١٣٥)

قال مالك: سألت رجلاً من أهل البادية: ما الضفف؟ قال: أن يتناول مع الناس.(١٣٦)

١٠٩ _ لە مالیکی کوڕی دینارەوە فەرموویەتی: ((هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ تێر نەبوو لە نان و لە گۆشت جگە لەو کاتانەی میوانی دەهات)).

مالیك دەڵێت: لە پیاوێکی بیابان نشینم پرسی: (ضفف) چی یە؟ گوتی: واتە لە گەڵ خەڵکدا بخوات.

صحيح ١١٠ _ عن سِماك بن حَرب قال: سمعت النعمان بن بشير يقول: ((ألستم في طعام وشراب ما شئتم؟ لقد رأيتُ نَبيَّكم صلى الله عليه وسلم وما يجد من الدَّقَل (١٣٧) ما يملأ بَطنَه)).

١١٠ _ لە سیماکی کوڕی حەربەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: گوێبیستی نوعمانی کوڕی بەشیر بووم دەیفەرموو: ((ئایا چەند خوازیاربن لە خواردن و

---

[١٠٩] _ (قلت: إسناده مرسل صحيح، ومالك بن دينار تابعي صغير يروي عن أنس. وقد رواه قتادة عن أنس نحوه، وسيأتي في الكتاب برقم ١١٧).

[١٣٥] _ ضَفَف " بفتح الضاد والفاء: واتە هیچ کاتێك لە کاتەکان تێر نەدەبوو تا میوانی دەهات ئینجا لە بەر خەڵەفاندن و خەریککردنی میوان تێر دەبوو.

[١٣٦] _ واتە نان خواردن لە گەڵ کەسانی میوان کە لای دادەبەزین.

[١١٠] _ أخرجه مسلم في ((الزهد)) برقم ٢٩٧٧ والمؤلف فيه برقم ٢٣٧٣. (قلت: وقال: ((حديث حسن صحيح))، وأحمد (٤/٢٦٨) وابن سعد (١/٤٠٦) وأبو الشيخ (٢٧٥) من طرق عن سماك به. وخالفهم شعبة فقال: عن سماك سمعت النعمان يقول: سمعت عمر بن خطاب فذكر ما فتح على الناس فقال: فذكره، فجعله من مسند عمر. أخرجه ابن ماجة (٤١٤٦) والطيالسي (٢/ ١٢٦) وأحمد (١/ ٢٤) وابن سعد (١/٤٠٥و٤٠٦)، وهو رواية لمسلم ٢٩٧٨.

(١٣٧) _ الدقَل، بفتح القاف: واتە خراپترین جۆری خورما. و لە (ریوایە) یەتەکەی ئیمامی موسلیمیشدا بە ژمارە ٢٩٧٨: ((بە درێژی ڕۆژ دەتلایەوە و خراپترین جۆری خورمای دەست نەدەکەوت سکی تێربکات)).

خواردنەوەدا نین؟ دڵنیابن پێغەمبەرەکەتانم بینی خراپترین جۆری خورمای دەست نەدەکەوت سکی تێرکات)).

صحيح ١١١ _ عن عائشة قالت: ((إنْ كنّا آلَ محمدٍ نَمكثُ شهراً نَستَوْقِد بِنارٍ، إن هو إلا التمرُ والماءُ)).

١١١ _ لە خاتوو عائیشەوە فەرموویەتی: ((دڵنیابن ئێمەی خێزانەکانی محمد مانگێك دەماینەوەو ئاگرێكمان دانەدەگیرساند، جگە لە خورماو ئاو هیچی تر بەردەست نەبوو)).

ضعيف ١١٢ _ عن أبي طلحة قال: ((شَكَونا إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم الجوع، ورفعنا عن بطوننا حجَرٍحجَر، فرفع رسول الله صلى الله عليه وسلم عن بطنه عن حجرين)).

---

[١١١] _ أخرجه مسلم في ((الزهد)) برقم ٢٩٧٢ وزاد ((إلا أنه كان لرسول الله جيران من الأنصار، وكانت لهم منائح، فكانوا يرسلون الى رسول الله صلى الله عليه وسلم من ألبانها فيَسْقيناه)) واته ئیمامی موسلم

فەرموودەکە بەم زیادەوە دەگێڕێتەوە ((بەڵام پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم دراوسێگەلێکی لە پشتیوانان هەبوو ئاژەڵی خەڵاتیان (منيحة) هەبوو، لە بەرهەمە شیرەمەنیەکانیان بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم دەنارد و دەمانخواردەوە )) . (قلت: وكذلك رواه البخاري في ((الهبة)) و ((الرقاق)) وأحمد (٢٤٤/٦) وابن سعد (٤٠٢/١ و٤٠٣) وأبوالشيخ (٢٧٤) وله عنده وكذا أحمد (١٠٨/٦و١٨٢و٢٣٧) طرق أخرى عن عائشة. وشاهد عن أبي هريرة عند ابن سعد (٤٠١/١).(المنائح): بە مەڕی شیردار دەگوترێت، خاوەنەکەی دەیدات بە پیاوێك بەرهەمە شیرەمەنیەکەی دەخواتەوە و پاشان دەیداتەوە بە خاوەنەکەی.

[١١٢] _ أخرجه المؤلف في ((الزهد)) برقم ٢٣٧٢.

(قلت: وضعفه هناك وهنا بقوله: ((غريب...)). وعلته سيار وهو ابن حاتم وهو صدوق له أوهام كما في ((التقريب))، ومن طريقه أبو الشيخ ٢٦٥).

وفي وضعه صلى الله عليه وسلم الحجر من الجوع حديثان آخران خرجتهما مع حديث الباب في ((الصحيحة)) ١٦١٥).

قال أبو عيسى: ((هذا حديث غريب من حديث أبي طلحة لا نعرفه إلا من هذا الوجه، ومعنى قوله: ((ورفعنا عن بطوننا عن حجرحجر)) قال: كان أحدهم يشد في بطنه الحجر من الجهد والضعف الذي به من الجوع)).

١١٢ _ لە ئەبی طلحەوە فەرموویەتی: ((برسێتی خۆمان لای پێغەمبەری خوا ﷺ سکالاً کرد و، بەرد بەردمان لەسەر سکی خۆمان هەلگرت، ئەوجا پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بەردی لە سەر سکی هەلگرت)).

ئەبو عیسا فەرموویەتی: ئەمە فەرموودەیەکی (غریب) ە بە فەرمایشتی ئەبی طلحة و لەم ڕووە نەبێت نایناسین، مانای گوتنیشی: ((ورفعنا عن بطوننا حجر حجر)). گوتی: یەکێکیان بەردێکی دەبەستە سەر سکی لە ئەنجامی شەکەتی و ژیانگرانی و لاوازی کەتووشی دەبوو لە برسێتیدا.

صحيح ١١٣ _ عن أبي هريرة قال: خرج رسولُ الله صلى الله عليه وسلم في ساعة لا يخرج فيها ولا يلقاه فيها أحدُ، فأتاه أبو بكر فقال: ((ما جاء بك يا أبا بكر؟)) قال: خرجتُ ألقى رسولَ الله صلى الله عليه وسلم وأنظر في وجهه، والتسليم عليه. فلم يلبث أن جاء عمر، فقال: ((ما جاء بك يا عمر؟)) قال: الجوعُ يا رسول الله! قال صلى الله عليه وسلم: ((وأنا قد وجدت بعضَ ذلك)). فانْطَلَقوا إلى منزل أبي الهيثم بن التَّيهان (١٣٨) الأنصاري، وكان رجلاً كثيرَ النخلِ والشاء، ولم يكن

---

١١٣_ وأخرجه المؤلف في ((الزهد)) برقم ٢٣٧٠ وأصحاب السنن. (قلت: وقال المؤلف: ((حسن صحيح غريب))، وإطلاق عزوه لأصحاب السنن خطأ، فإنما روى منه أبوداود (٥١٢٨) وابن ماجة (٣٧٤٥) قوله: ((المستشار مؤتمن)) والنسائي في ((البيعة)) آخره: ((إن الله لم يبعث نبياً ولا...)) وهذا القدر منه علقه البخاري في ((الأحكام)) عن أبي سلمة عن أبي هريرة وحده. ثم وصله عنه عن أبي هريرة وأبي سعيد معا نحوه مختصراً، وهو مخرج في ((الصحيحة)) (١٦٤١). وأخرج طرفه الأول الى قوله: ((تسألون عنه يوم القيامة)) مسلم (٢٠٣٨) من طريق أبي حازم عن أبي هريرة، وأبو الشيخ (٢٧٠و٢٧١) من طريق أبي سلمة عنه.

١٣٨ _ ناوی ئەبی هەیسەم: مالکی کوڕی تەیهانە.

له خَـدَمٌ، فلم يجدوه، فقالوا لامرأته: أين صاحِبُـكِ؟ فقالت: انْـطَـلَـقَ يـسـتـعْـذب لنا الماء.

١١٣_ له ئەبی هوریرەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ چووە دەرەوە لە کاتێکدا ڕانەهاتبوو بچێتە دەرەوە و کەسیش دیدەنی نەدەکرد، ئەوەبوو ئەبو بەکری پێگەشت و ئەویش فەرمووی: ((ئەی ئەبو بەکر چ تۆی هێناوە؟)) گوتی: چوومەتە دەرەوە چاوم بکەوێتە پێغەمبەری خوا ﷺ و ڕووی تەماشا بکەم و، سڵاوی لێبکەم. زۆری پێنەچوو عومەریش تەشریفی هێنا، فەرمووی: ((چ هێناویتی ئەی عومەر؟)) گوتی: برسێتی ئەی پێغەمبەری خوا! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((منیش هەست بە هەندێ لەوە دەکەم)). ئیتر پێکەوە چوون بۆ ماڵی ئەبی هەیـثەم کوڕی تەیهانی ئەنصاری، پیاوێکی دەوڵەمەند بوو بە دارخورماو مەڕ، خزمەتکاری نەبوو، بەڵام لەوێ نەبوو، بە خێزانەکەیان فەرموو: هاوژینەکەت لە کوێیە؟ گوتی: چووە ئاوی خواردنەوەمان بۆ بێنێ.

فلم يلبثُوا أن جاء أبو الهيثم بِـقِـربةٍ يَـزْعَبُـها (١٣٩) فوضعها، ثم جاء يلتـزم (١٤٠) النبيَّ صلى الله عليه وسلم ويَـفديه بأبيه وأمه، ثم انطلق بهم إلى حد يقـته، فبسط لهم بِساطاً، ثم انطلق إلى نخلةٍ، فجاء بِـقِـنْـوٍ(١٤١) فوضعه، فقال النبي صلى الله عليه وسلم: ((أفلا تَـنَـقَّـيْتَ لنا من رُطَبِــه؟)) فقال: يا رسول الله إني أردت أن تختاروا أو تَـخَـيَّـروا من رُطبه وبُسْره(١٤٢) فأكلوا وشربوا من ذلك الماء،

---

(١٣٩) _ يَـزْعَبُـها: واتە ڕەتی دەدا لە قو رسیدا.

(١٤٠) _ يلتـزم: واتە دەست لە مل كردن. گوتم: لێرەدا شیاوێتی دەست لە ملکردن ڕوون دەبێتەوەو، پێدەچێت لە کاتی زاڵبوونی بیرکردندا (الشوق)بێت، ئەگینا شەرعی نی یە لە کاتی هەر چاو پێکەوتنێکدا چونکە قەدەغەکردنی چەسپاوە، وەکو ئەوەی لە ((الصحيحة)) (١٦٠)دا ڕوونکراوەتەوە .

(١٤١) _ قِـنْـو: واتە هێشووە خورمای پێنەگەیشتوو(البلح).

(١٤٢) _البسر: بەری دارە خو رمایە پێش ئەوەی پێبگات. بە تاکی (بسر)یش دەگوترێت (بسرة).

فقال صلى الله عليه وسلم: ((هذا والذي نفسي بيده من النعيم الذي تسألون عنه يوم القيامة " ضِلُ بَاردُ، ورُطَبُ طَيّبُ، وماء بَـاردُ)).

زۆری پێنەچوو ئەبوو هەیـثەم بە مەشكەیەكی پڕ ئاوەوە هاتەوە ڕەتی دەدا لە قورسیداو داینایە سەر زەوی، پاشان هات و دەسدەكاتە ملی پێغەمبەری خوا ﷺ و دایكیو بابی بە قوربانی دەكا، پاشان بردنی بۆ باخەكەی و، ڕاخەرێكی بۆ ڕاخستن، پاشان ڕاپەڕی بۆ دارخورمایەك و، هێشویەكی فەریكە خورمای هێناو داینا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەوە بۆ خورمای پێگەیشتوت بۆ هەڵنەبژاردوین؟)) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ویستم بە ئارەزووی خۆتان هەڵبژێرن یا لە لایەن منەوە ئازادبن لە هەڵبژاردنی گەییو نەگەیوەكەیدا (رطبه وبسره) ئیتر خواردیان و لە ئاوەكەشیان خواردەوە، ئەوجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەو زاتەی نەفسی منی بە دەستە ئەمە لەو نیعمەتانەیە كە لە ڕۆژی قیامتدا پرسیارتان لە بارەیەوە لێدەكرێت، سێبەرێكی فێنك، خورمای پێگەیشتوی خۆش، ئاوێكی سارد)).

فـانطلق أبوالهـيـثم ليصنع لهم طعاماً، فقال النبي صلى الله عليه وسلم:((لا تَذْبَحَنَّ لنا ذاتَ دَرّ))

فذبح لهم عَنَـاقاً أو جَدْياً، فأتاهم بها، فأكلوا، فقال صلى الله عليه وسلم: ((هل لك خادم؟)) قال: لا. قال: ((فإذا أتانا سَـبْـيُ فأتـنا)). فـأتـيَ صلى الله عليه وسلم برأسين ليس معهما ثالث. فـأتاه أبوالهيثم، فقال النبي صلى الله عليه وسلم: ((اختر منهما)). فقال: يا رسول الله اختـرْ لي. فقال النبي صلى الله عليه وسلم: ((إن المستـشارَ مؤتمن، خذ هذا، فإني رأيته يصلي، واستَوْصِ به معروفاً)). فانطلق أبوالهيثم إلى امرأته، فأخبرها بقول رسول الله صلى الله عليه وسلم، فقالت امرأته: ما أنت بِـبالِـغ حَقّ ما قال فيه النبي صلى الله عليه وسلم إلا بأن تَـعتـقَـه. قال: فهو عتيق، فقال صلى الله عليه وسلم: ((إن الله لم يبعـثْ نبيا ًولا خليفةً إلا وله

بطانتان: بطانة تأمره بالمعروف وتـنهاه عن المنكر،(١٤٣) وبطانة لا تـألوه خبالا ً،(١٤٤) ومن يُـوقَ بـطانةَ السوء فقد وُقـيَ)). (١٤٥)

دوای ئەوە ئەبو هەیثەم ڕاپەڕی خواردنێکیان بۆ دروست بکات، پێغەمبەری خوا ﷺفەرمووی: ((شیردارمان بۆ سەر مەبڕە)).

ئەوجا کاریلەیەك یا گیسکێکی بۆ سەربڕین و، بۆی هێنان و، پێکەوە خواردیان، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئایا خزمەتکارت هەیە؟)) گوتی: نەخێر. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:((هەرکات بەدیل گیراومان بۆ هات وەرە بۆ لامان)). پاشان پێغەمبەر ﷺ دوو سەریان بۆ هێنا سێیەمیان نەبوو. ئەمجا ئەبو هەیثەم هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و، ئەویش فەرمووی: ((هەڵبژێرە لەم دوانە)) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ بۆم هەڵبژێرە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ڕاوێژکار باوەڕپێکراوە، ئەمەیان بەرە، بینیم نوێژ دەکات، بە چاکە ئامۆژگاری و ڕەفتاری لە گەڵدا بکە)).

ئەبو هە یثەم ڕاپەڕی و چۆوە بۆ لای خێزانەکەی و، فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ پێڕاگەیاند، خێزانەکەی گوتی: تۆ ناگەی بە هەقی ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەو خزمەتکارە فەرموویەتی تەنها بە ئازادکردنی نەبێت. ئەبو هەیثەم گوتی: ئەو ئازادە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دلنیابن خوای تعالی هیچ پێغەمبەرێك یا جێنشینێکی نە ناردووە مەگەر دوو جۆر لە نزیکانی هەیە: نزیکانێك فرمانی پێدەکەن بە چاکە و خراپەی لێ قەدەغە دەکەن و،

---

(١٤٣) _ البطانة: نزیکانی پیاوە و بریتیە لەو کەسانەی فەرمانەکانی لە دڵدا جێگیر دەکەن و جێبەجێی دەکەن و، ئەویش تایبەتیان دەکات بە نزیکردنەوەیەکی زیاتر. بۆ تاك و کۆش هەمان وشە بە کاردەهێنرێت.

(١٤٤) _ واتە کەمتەرخەمی ناکات لە خراپکردن و تێکدانیدا چونکە (الخبال) واتە خراپکردن و تێکدان و، (الألو): واتە کەمتەرخەمی.

(١٤٥) _ وُقي: وا تە پا رێزراو دەبێت.

نزیكانێكیش كەمتەرخەمی ناكەن لە خراپكردن و تێكدانیدا و هەركەسێكیش خۆی پاراست لە نزیكانی خراپ پارێزراو دەبێت)).

صحيح ١١٤_ عن سعد بن أبي وقاص (١٤٦) يقول: ((إني لأول رجل ٍاهْـراق َ(١٤٧) دمـا ً في سبيل الله عزوجل، وإني لأول رجل ٍ رمى بسهم في سبيل الله، لقد رأيتُـني أغزو في العِـصابة من أصحاب محمد عليه الصلاة والسلام ما نأكل إلا ورق الشجر والـحُـبْـلة (١٤٨) حتى تَـقَـرَّحتْ أشداقُـنا، وإن أحدنا لـيَـضَـع كما تَـضَـع

---

١١٤ _ أخرجه المؤلف في ((الزهد)) برقم ٢٣٦٦ والبخاري في ((فضل سعد)) وفي ((الأطعمة)) وفي ((الرقاق)) ومسلم في ((الزهد)) برقم ٢٩٦٦ وابن ماجة في (المقدمة).

(قـلـت: وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح غريب من حديث بيان)).

قـلـت: وهو ابن بشر الأحمسي، وهو ثـقة ثـبت، لكن الراوي عنه إسماعيل بن مجالد بن سعيد فيه ضعف من قبل حفظه، لكن دونه ابنه عمر بن إسماعيل وهو متروك. لكن الحديث عند الشيخين من طرق أخرى عن قيس بن أبي حازم به دون قوله: ((حتى تـقرحت أشداقـنا)). وإنما جاء هذا في أحاديث أخرى منها الحديث التالي، فكأن ابن مجالد دخل عليه حديث في حديث. ثم إن ابن ماجة ليس له منه إلا قوله: ((إني لأول العرب رمى بسهم في سبيل الله)). ورواه أحمد (١٧٤/١و١٨١و١٨٦) بتمامه كالشيخين، وهو رواية للمؤلف ٢٣٦٧).

(١٤٦) _ سعد بن أبي وقاص: ناوی مالكی كوڕی ئوهەیبی كوڕی عەبد مەنافی كوڕی زوهرەیە لە هۆزی قورەیشە و لە تیرەی زوهرەیە یەكێكە لەو دە كەسەی مژدەی بەهەشتیان پێدراوەو یەكێكیشە لەو شەش كەسەی خاوەن (شوری)، نزاو دوعای گیرابوو، ساڵی ٥٨ كۆ چی مردووەو چەندین هەڵـوێستی بە ناوبانـگی هەیە یەكێكیان سەركردایەتی جەنگی قادسیە بوو.

(١٤٧) _ أهراق أي أراق بفتح الهاء وسكونها: واتە ڕشتی، ئەم خوێنەش لە ئەنجامی سەر شكانی بێباوەڕێكەوە بوو، ئیبنو ئیسحاق دەگێـڕێتەوە: كە هاوەڵان لە سەرەتای ئیسلامدا سوكایەتیان پێـدەكرا لە نوێـژەكانیاندا ئەوە بوو سەعد بە هاوڕێتی چەند كەسێكی هاوەڵانی خۆی لە ڕێـگو زەرێكدا نوێژیان دەكرد كە كۆمەڵـێـكی بێباوەڕیان پێـیـان زانین و گاڵـتەیان پێـكردن و ناكۆكی نێوانیان توند بوو تا بە گـژیەكدا چوون و سەعدیش بە ئێـسكی وشترێك كێـشای بە پیاوێـكـیاندا و سەری شكاند، ئەوە یەكەم خوێن بوو لە ئیسلامدا.(قـلـت: وهي رواية معضلة، لم يسندها إبن إسحاق).

(١٤٨) _ (الـحُـبْـلة) بضم الحاء وسكون الباء، وبضمها: گەڵایەكە لە لۆبیا دەچێت، گوتراویشە درختێكی دڕكدارە.

الشاة والبعير،(١٤٩) وأصبحَتْ بنو أسْد يُعَزِّرُونَنى (١٥٠) في الدِّين، لقد خِبْتُ وخسرتُ إذاً وضل عملي)).

١١٤ _ له سەعدی كوڕی ئەبی وەقاصەوە دەفەرموێت: ((دڵنیابن من یەكەم پیاو بووم خوێنم ڕشت لە پێناوی خوای گەورە، یەكەم پیاویش بووم تیری هاوێشتبێت لە پێناو خوادا، دەتبینیم لە نێو كۆمەڵێك لە هاوەڵانی محمدا دەجەنگام جگە لە گەڵای دارو دڕكەزێ هیچی ترمان نەدەخوارد تا شەوێلگمان بریندار بوو، یەكێكمان پشقلی ووشكی دادەنا هاوشێوەی دانانی مەڕو وشتر، پاشان دەركەوت (بەنو ئوسد) سەرزەنشتم دەكەن كەوا نوێژ بە باشی ناكەم، كەواتە دۆڕاو خەسارۆمەندم و ڕەنج بەبا بووم)).

ضعيف ١١٥_عن عمرو بن عيسى أبو نعامة العدوي قال: سمعت خالد بن عمير وشُويساً أبا الرقاد قالا: بعث عمر بن الخطاب عُتبةَ بنَ غَزوان، وقال: انطلق أنت ومن معك حتى إذا كنتم في أقصى بلاد العرب وأدنى بلاد العجم فَأقْبِلُوا، (١٥١) حتى إذا كانوا بالمِربَد(١٥٢) وجدوا هذا الكذَّان(١٥٣) فقالوا: ما هذه؟ قالوا: هذه البصرة، فساروا حتى بلغوا حِيال الجسر الصغير. فقالوا: ههنا

---

(١٤٩) _ واتە پشقلی وشك لە بەر كەمی خواردنی ئاسایی.

(١٥٠) _ واتە عەیباریان دەكردم كەوا نوێژ بە باشی ناكەم، (یعزروننی) لە (تعزیر)ەوە هاتووە واتە لۆمە و سەرزەنشتكردن.

[١١٥] _ أخرجه المؤلف في ((الزهد)) ومسلم وابن ماجة فيه. (قلت: ليس عندهم بهذا التمام، وإنما روى المؤلف منه قطعة في ((صفة جهنم)) (رقم ٢٥٧٨) وهي عند مسلم، ولعلها مما أختصره المؤلف هنا وأشار إليه بقوله: ((فذكروا الحديث بطوله)). وأما ابن ماجة فروى (٤١٥٦) منه قوله: ((لقد رأيتني...)) الى قوله: ((أشداقنا)) وفي سنده كالمؤلف صفوان بن عيسى أبو نعامة، ثقة مختلط، لكنه عند مسلم من غير طريقه أتم منه دون طرفه الأول الى قوله: ((فنزلوا))).

(١٥١) _ أقْبِلُوا: واتە ڕوویان تێكەن.

(١٥٢) _ مربد: جێگەیەكە لە بەصرە لە بنچینەدا شوێنی بەندكردنی مەڕو ووشتر بووە، یا خورمای ڕتابی تێدا كۆدەكرایەوە تا وشك دەبۆوە .

(١٥٣) _ الكذَّان: لە سەر كێشی (حسان)ە و بەردەلانێكی ملسی سپی یە .

(البصرة)ش دیسان بەردێكی ملسە و بەرە و سپی دەڕوانێت .

أمرتُمْ. فَنَزَ لوا. فذكروا الحديث بطوله، قال: فقال عُتبةُ بن غَزوان: صحيح ((لقد رأيتُني وإني لسابع سبعة مع رسول الله صلى الله عليه وسلم، ما لنا طعامُ إلا ورق الشجر حتى تَقَرَّحَتْ أشْداقُنا، فالتقطت بُردةً قسمتها بيني وبين سعد، فما منا من أولئك السبعة أحد إلا وهو أمير مصرٍ من الأمصار، وستجربون الأمراء بعدنا)).

١١٥_ عەمری كوڕی عیسا ئەبو نەعامەی العدوی دەڵێت: گوێبیستی خالدی كوڕی عومەیر و شویسی ئەبا ئەلرەقاد بووم دەیانفەرموو: عومەری كوڕی خەتاب عوتبەی كوڕی غەزوانی نارد و پێی فەرموو: تۆو ئەوانەی لە گەڵتدان بچن تا دەگەن بەو پەڕی وڵاتی عەرب و خواروی وەڵاتی عەجەم ڕوویان تێكەن، ئەوانیش بەڕێكەوتن تا چوونە (میربەد)بەردەلآنێكی سپی ملّیان بینی گوتیان: ئەمە چی یە؟ پێیان گوترا: ئەمە (بەصرە) یە، دوای بەڕێكەوتن تا گەیشتنە بەرامبەر پردە بچوكەكە. گوتیان: بە ئێرە فەرمانتان پێكراوە. ئەوجا دابەزین. فەرموودەكەشیان بە درێژی گێڕایەوە، گوتی: ئەمجا عوتبەی كوڕی غەزوان فەرمووی: ((دەتبینیم من حەوتەمی حەوت كەسان بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، خواردنمان نەبوو جگە لە گەڵای دار تا شەوێلگمان بریندار بوو، پۆشاكێكی میللداریشم (بردە) هەڵگرت و لە نێوان خۆمو سەعدا كەرتم كرد، لە ئێمەی ئەو حەوت كەسە یەكێكمان نەماوە ئەمیری شارێكی ناسراو نەبێت لە شارەكان، دوای ئێمەش ئەمیر گەلێك تاقی دەكەنەوە)).

١١٦_ عن أنس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: صحيح ((لقد أخفت في الله وما يُخاف أحدُ، ولقد أوذيت في الله وما يؤذى أحد، ولقد أتَتْ عليَّ

---

[١١٦] _ وأخرجه المؤلف في ((كتاب صفة القيامة)) برقم ٢٤٧٤. پێدەچێت ئەم بارە كاتی ئابلۆقەدانەكەی نێو (شـعبْ) ڕێگە و دەرەچەی نێوان دوو شاخەكەدا بێت لە گەڵ (بني هاشم).
(قلت: وصححه المؤلف، وفي إسناده روح بن أسلم وهو ضعيف. لكن تابعه وكيع بن الجراح _ وهو ثقة _ عند ابن ماجة (١٥١) وابن حبان (٢٥٢٨)، فصح الحديث والحمد لله).

ثلاثون من بين ليلة ويوم وما لي ولبلال طعامٌ يأكله ذو كَبِـدٍ إلا شيء يواريه إبط بلال)).

١١٦_ لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ترسێنراوم لە پێنا وی خوادا لە كاتێكدا كەسی تێدا نەدەترسێنرا و، ئازاریش دراوم لە كاتێكدا كەسی تێدا ئازار نەدەدرا، (سی) شەوو ڕۆژیش بەسەردا تێپەڕیووە نەبۆ خۆم و نەبۆ بیلال خواردنێك نەبوو خاوەن جەرگێك بیخوات جگە لە شتێكی كەم كە باخەڵی بیلال دەیشاردەوە)).

صحيح ١١٧_ وعنه: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم لم يجتمع عنده غَداءُ ولا عَشاء من خبز ولحم إلا على ضَفَفٍ))

قال عبد الله: (١٥٤) قال بعضهم: هو كثرة الأيدي.(١٥٥)

١١٧_ هەر لە هەمان هاوەڵەوە فەرموویەتی: ((بەدەر لە كاتی زۆربونی دەست و میوانداریدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە كاتی ژەمی نیوەڕۆ و ئێوارەدا نان و گۆشتی لا كۆنەبۆوە)).

عەبدوللا فەرموویەتی: هەندێكیان گوتویانە: (ضفف) واتە زۆربونی دەستەكان لە كاتی نان خواردندا.

---

[١١٧] _ قلت: إسناده صحيح على شرط الشيخين، وكذا قال ابن كثير، وأخرجه ابن حبان (٢٥٣٣) وأحمد (٣/٢٧٠)وابن سعد (١/٤٠٤) وأبو الشيخ (٢٧٨)، ومضى له طريق أخرى مرسلا برقم (١٠٩).

(١٥٤) _ عبدالله: كوڕی عبدالرحمانی شێخی ئیمامی ترمذیە.

(گوتم: ئەمە ڕوونكردنەوەیەكی كەم سوودە، ڕاستیش ئەوەیە بگوترێت ئەو پیاوە پێشەوا ئیبنو عەبدولرحمانی كوڕی فضلي ئەبو محمدی ئەلدارمی یە خاوەن كتێبی ((السنن)) ناسراو بە ((سنن الدارمي))، شێخی ئیمامی ترمـذیة لەم فەرموودەیەداو ساڵی ٢٥٥ مردووە .

(١٥٥) _ الضفف: دیسان لە ماناكانی خواردنە لە گەڵ خاوخێزاندا، هەروەها لە ماناكانیشی تەنگانە و نەبونیە

(قلت: المعنى الأول قد مضى في الحديث(١٠٩) بأوسع مماذكر).

ضعيف ١١٨ _ عن نوفل بن إياس الهذلي، قال: ((كان عبد الرحمن بن عوف (١٥٦) لنا جَليساً، وكان نِعمَ الجليس، وإنه انقلب (١٥٧) بنا ذات يوم، حتى إذا دَخلنا بيتَه دخل فاغتسل ثم خرج، وأتينا بصحفة فيها خبز و لَحم، فلما وضعتْ بكى عبد الرحمن. فقلت: يا أبا محمد! ما يُبكيك؟ فقال: هلك رسول الله صلى الله عليه وسلم ولم يشبع هو وأهل بيته من خبز الشعير، فلا أرانا أخِّرنا لما هو خير لنا)).

١١٨ _ لە نەوفەلی كوڕی ئیاسی هوذەلیەوە، فەرموویەتی: ((عبدالرحمانی كوڕی عەوف هاوڕێمان بوو، باشترین هاوڕێش بوو ڕۆژێك بانگی نان خواردنی كردین‌و لە گەڵماندا گەڕایەوە، كاتێ چووینە ماڵەوە چووە ژوورەوە خۆی شت‌و دەرچوو، پاشان قاپێكمان بۆ هێنرا نان‌و گۆشتی تێدا بوو، كە دانرا عبدالرحمان گریا. پێم گوت: ئەی باوكی محمد! چ دەتگرێنێت؟ فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ گیانی سپارد و خۆی و خێزانەكانی لە نانی جۆ تێر نەبوون، واتێناگەم دواخراین بۆ شتێكی چاكتر)).

---

[١١٨] _ قلت: إسناده ضعيف، رجاله ثقات غير نوفل هذا فإنه لا يعرف كما قال الذهبي في ((الميزان)). وأما ابن حبان فذكره في ((الثقات)) (٢٧٢/٣) على قاعدته في توثيق المجهولين. ومن طريقه أخرجه أبو الشيخ أيضا (ص ٢٦٥) وأبو نعيم في ((الحلية)) (٩٩/١ و١٠٠) ورواه البزار مختصراً كما في ((المجمع)) (٣١٢/١٠) وقال: (إسناده حسن). والظاهر أنه أعتمد على توثيق ابن حبان المذكور أنفاً وهو تساهل معروف منهما معاً.

(١٥٦) _ یەكێكە لە دەكەسی مژدە پێدراوانی بەهەشت.

(١٥٧) _ واتە لە بازارەوە یا شوێنێكی دیكەوە لە گەڵماندا گەڕایەوە .

(١٥٨) _ قاپێكە هاوشێوەی قەسعە.

## ٢٤ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە سیفەتی خواردنی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

ضعيف ١١٩ _ عن ابن لكعب بن مالك عن أبيه:(١٥٩) ((أن النبي صلى الله عليه وسلم كان يلعَق (١٦٠) أصابعه ثلاثاً))

قال أبوعيسى: وروى غير محمد بن بشار هذا الحديث قال: ((يلعق أصابعه الثلاث)).(١٦١).

١١٩_ كوڕێكی كەعبی كوڕی مالك لە بابیەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرمێت:(( پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار پەنجەكانی دەلستەوە )) .

ئەبو عیسی فەرموویەتی: جگە لە محمدی كوڕی بەشار كەسانی تریش ئەم فەرموودە یە دەگێڕنەوە و دەفەرمن: ((هەر سێ پەنجەكەی دەلستەوە)).

صحيح ١٢٠_ عن أنس قال: ((كان النبي صلى الله عليه وسلم إذا أكل طعاماً لَعِـقَ أصابعَه الثلاثَ))

١٢٠_ لە ئەنەسەوە فەرموویەتی: ((هەركات پێغەمبەری خوا ﷺ خۆراكی بخواردایە هەر سێ پەنجەكەی دەلستەوە)).

---

[119] _ (قلت: إسناد رجاله ثقات رجال الشيخين، لكن متنه شاذ لمخافته لرواية الثقات الآتية بعد حديث، وقد أشار الى ذلك المؤلف عقب هذا الحديث، وشرح ذلك لا يتسع له المجال، فإلى ((الضعيفة)) برقم ٥٤٠٧).

(١٥٩) _ كەعبی كوڕی مالك یەكێكی ئەو سیانەیە كە دواكەوتن لە جەنگی تەبووك و پەروەردگاریش لێی خۆش بوو.

(١٦٠) _ لعق أصابعه: واتە پەنجەكانی دەلستەوە.

(١٦١) _ قلت: وهو الصحيح المحفوظ عن كعب بن مالك كما سبقت الإشارة إليه أنفاً، ويشهد له حديث أنس الآتي بعده.

[120] _ وأخرجه المؤلف في ((الأطعمة)) برقم (١٨٠٤) ومسلم برقم (٢٠٣٤) وأبوداود في ((الأطعمة)) برقم (٣٨٤٥) والنسائي.

صحيح ١٢١ _ عن ابن لكعب بن مالك عن أبيه قال: ((كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يأكل بأصابعه الثلاث ويَـلْـعَـقُـهن)).

١٢١_ كوڕێكی كەعبی كوڕی مالك لە باببەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرمووێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ بە هەر سێ پەنجەكەی خۆراكی دەخوارد و پاشانیش دەیلستنەوە)).

صحيح ١٢٢_ أنس بن مالك يقول: ((أتي رسول الله صلى الله عليه وسلم بتمر، فرأيته يأكل وهو مُـقْـعٍ(١٦٢) من الجوع)).

١٢٢_ ئەنەسی كوڕی مالك دەفەرمێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ خورمای بۆ هێنرا، بينيم دەخواتو لە برسێتيان پاڵيداوەتەوە)).

[١٢١] _ وأخرجه أحمد ومسلم في ((الأطعمة)) برقم (٢٠٣٢) ولفظه عن كعب: ((رأيت النبي صلى الله عليه وسلم يلعق أصابعه الثلاث من الطعام). واتە ئيمامی ئەحمەد و موسليم لە كەعبەوە فەرموودەكە دەگێڕێتەوە بە بێژەی: ((بينيم پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم هەر سێ پەنجەكەی دەلستەوە لەو خۆراكەی پێوەوە بوو)) وفي رواية لمسلم: ((ويلعق يده قبل أن يمسحها)). واتە لە (ريوايە) تێكی تری ئيمامی مو سليمدا هاتووە:

((دەستی دەلستەوە پێش ئەوەی پاكی كاتە وە)). وأبوداود في ((الأطعمة)) برقم (٣٨٤٨).

[١٢٢] _ مسلم برقم (٢٠٤٤) وأبوداود برقم (٣٧٧١) والنسائي والمؤلف.

(قـلـت: وأخرجه آخرون كما تراه مخرجاً في ((الإرواء)) ١٩٦٧).

(١٦٢) _ الإقعاء: واتە پاڵـداتەوە ئەو شتەی دواوەی لە لاوازی و برسێتيدا .

(قـلـت: هذا من معاني ((الإقعاء)) ولكنه غير مراد هنا، وإنما هو أن يجلس على أليتيه وينصب ساقيه مستوفزاً غير متمكن. انظر: ((النهاية)) وغيره من كتب اللغة).

## ٢٥ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە سیفەتی نانی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ١٢٣ _ عن عائشة أنها قالت: ((ما شبع آلُ محمدٍ صلى الله عليه وسلم من خُبزِ الشعير يومين متتابعين حتى قُبِضَ رسولُ الله صلى الله عليه وسلم)).

١٢٣_ لە عائیشەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: ((خاوخێزانی محمد تێر نەبوون لە نانی جۆ دوو ڕۆژی لەسەریەك تا پێغەمبەری خوا ﷺ گیانی سپارد)).

صحيح ١٢٤ أباأمامة الباهلي يقول: ((ما كان يَفْضُل عن أهل بيت رسول الله صلى الله عليه وسلم خبز الشعير)).

١٢٤ _ ئەبو ئومامەی باهیلی دە فەرموێت: ((لە خاوخێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ نانی جۆی زیادە نەدەمایەوە)).

صحيح ١٢٥_ عن أبن عباس قال: ((كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يبيتُ الليالي المتتابعة طاوياً هو وأهلُه، لا يجدون عَشاءً، وكان أكثَر خبزِهم خبز الشعير)).

---

[١٢٣] _ وأخرجه المؤلف في ((الزهد)) برقم ٢٣٥٨ ومسلم فيه برقم ٢٩٧٠ وابن ماجة فيه.

(قلت: وقال المؤلف: ((حسن صحيح)). ورواه البخاري بلفظ: ((... من طعام البر ثلاث ليال تباعا...)). أخرجه في مواطن منها ((الأطعمة)) في موضعين منه).

[١٢٤] _ أخرجه المؤلف في ((الزهد)) برقم ٢٣٦٠.

(قلت: وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح)). ورواه أحمد (٥/ ٢٥٣و٢٦٠ و٢٦٧) وابن سعد ٤٠١/١).

[١٢٥] _ وأخرجه المؤلف في ((الزهد)) برقم ٢٣٦١ وابن ماجة.

(قلت: وابن سعد أيضاً (٤٠٠/١) وقال المؤلف: ((حسن صحيح)). وهو مخرج في ((الصحيحة)) ٢١١٩).

١٢٥ _ لە ئیبنو عەباسەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ چەندین شەوی لەسەریەك خۆیو خێزانەكانی بە برسێتی دەمانەوە، ژەمی خواردنی ئێوارەیان نەبوو، زۆرترین نانەكانیشیان نانی جۆ بوو)).

صحيح ١٢٦_ أبوحازم عن سهل بن سعد أنه قيل له: ((أكل رسول الله صلى الله عليه وسلم النـقـيَّ يعني الحـُوَّارَى؟))(١٦٣) فقال:سهل: ((ما رأى رسول الله صلى الله عليه وسلم النَّـقـيَّ حتى لَـقـيَ الله عز وجل))، فقيل له:هل كانت لكم مناخل على عَـهدِ رسول الله صلى الله عليه وسلم؟ قال: ((ما كانت لنا مناخل)). فقيل: كيف كنتم تصنعون بالشعير، قال: ((كنا ننفخه فيطير منه طار﴿ ثم نُـثَـرِّيه ﴾(١٦٤) ثم نـَعْـجِـنُـه)).

٢٦_ ئەبوحازم دەفەرموێت بە سەهلی كوڕی سەعدیان فەرموو: ((ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ پاڵفتەی دەخوارد مەبەستی ئاردی سپی یە؟)) سەهل فەرمووی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ئاردی پاڵفتەی نەبینی تا گیانی سپارد)) پێیان گوت: ئایا لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ راببێژتان (مناخل) هەبوو؟ فەرمووی: ((راببێژمان نەبوو)). پێیان گوت: چۆن جۆكەتان بەكاردەهێنا؟ فەرمووی: ((فوومان پێدا دەكردو ئەوەی دەفڕی دەفڕی ﴿پاشان ئاومان تێدەكرد ﴾ پاشانیش دەمانشێلاو دەمانكرد بە هەویر)).

صحيح ١٢٧_ عن أنس بن مالك قال:((ما أكل نَـبيّ الله صلى الله عليه وسلم على خِـوانٍ (١٦٥) ولا في سُـكُـرّجةٍ،(١٦٦) ولا خُـبِـزَ له مُـرَقَّـقٌ)).

---

[١٢٦] _ أخرجه المؤلف في ((الزهد)) برقم ٢٣٦٥.

(قـلـت: وقال: ((حديث حسن صحيح)). وفاته البخاري في ((الأطعمة)) وابن ماجة (٣٣٧٥) وأحمد (٣٧٢/٥) وابن سعد ٤٠٨/١).

(١٦٣) _ الـحُـوَّارَى: ئاردی سپی پوخت و پاڵـفتەی ئاردەكەیە. (المعجم الوسيط).

(١٦٤) _ واتە ئاومان تێدەكرد.

[١٢٧] _ أخرجه المؤلف في ((الزهد)) برقم ٣٣٦٤ والبخاري وابن ماجة والنسائي.

(قـلـت: وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح))).

قال: فقلت لقتادة: فعلامَ كانوا يأكلون؟ قال: على هذه السُّفَرِ.

١٢٧_ لە ئەنەسی كوڕی مالكەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەر خوان و لە نێو قاپی بچوكی سەلاتەدا خواردنی نەخوارد و، نانی تەنكیشی بۆ نەكرا)).

فەرمووی: بە قەتادەم گوت: لە سەر چ شتێك خواردنیان دەخوارد؟ فەرمووی: لەسەر ئەم سفرانە.

ضعيف ١٢٨_ عن مسروق(١٦٧) قال: ((دَخَلت على عائشة، فَدَعَتْ لي بطعام و قالت: ماأشبعُ من طعامٍ فأشاء أن أبكي إلا بَكَيْتُ قال: قلت: لِمَ؟ قالت: أذكر الحال التي فارق عليها رسولُ الله صلى الله عليه وسلم الدنيا، والله ما شبع من خبزٍ ولحمٍ مرتين في اليوم)).

١٢٨_ لە مەسروقەوە فەرموویەتی: ((چوومە خزمەتی عائیشە، بانگی خواردنی بۆ كردم و فەرمووی: كەتێر دەبم لە خواردنێك گریانم دێت و مەگەر (إلا)

---

(١٦٥)_ الخِوان، بكسر الخاء وبضم: بەرزیەكە ئامادە دەكریت بۆ ئەوەی خواردنی لە سەر بخورێت.

(١٦٦) _ السُكُرُّجة، بضم السين والكاف والراء المشددة المضمومة: بریتیە لە قاپێكی بچوك شتێكی كەمی دلْكەرەوەی خواردنی تێدا دادەنرێت وەكو سەلاتە و ترشيات.

(السُّفر): بضم السين المشددة: كۆكردنەوەی (سُفرة)یەو لە خوان تایبەترە، درێژ دەكرێتەوەو رادەخرێت بۆ ئەوەی خواردنی لە سەر بخورێت یا لە پێستە یا لە قوماش دروست دەكریت.

[١٢٨] _ وأخرجه المؤلف في ((الزهد)) برقم ٢٣٥٧.

(قلت: وقال: ((حديث حسن)) وفي بعض النسخ ((حسن صحيح)). وهوفي نقدي لا يستحق التحسين بله التصحيح، لأن فيه مجالد بن سعيد وهو ضعيف. ومن طريقه أخرجه جمع من الأئمة ذكرتهم في ((التعليق الرغيب على الترغيب والترهيب))، وبينت هناك أن ذكر البكاء فيه منكر. والله أعلم).

(١٦٧) _ ناونراوە (مسروق) چونكە بە بچوكی دزراوە، پێش مردنی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم مو سلْمان بووە، پێشینی یەكەمی (الصدر الأول) لە كوفە بینیوە . (گوتم: باوەڕپێكراوە پێشەواو زاناو خواپەرستە (ثقة فقيه عابد)، وەكو ئەوەی لە ((التقريب))دا هاتووە ).

دەگریم. فەرمووی: گوتم: بۆ؟ فەرمووی: ئەو بارودۆخەم دێتەوە یاد کە تیایدا پێغەمبەری خوا ﷺ دونیای بە جێهێشت؟ سوێند بە خوا دووجار لە ڕۆژێکدا تێر نان و گۆشت نەبوو))

## ٢٦_ بەشى ئەوەى سەبارەت بە پێخۆرى پێغەمبەرى خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ١٢٩_ عن عائشة: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: ((نِعمَ الإدامُ الخَلّ)). قال عبدالله بن عبد الرحمن في حديثه: ((نعم الأدْمُ أ الإدَامُ الخل)).

١٢٩_ لە عائيشەوە دەگێڕنەوە فەرموويەتى: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى: ((چاكترين پێخۆر سركەيە)).

عەبدولاّى كوڕى عەبدولرەحمان لە فەرموودەكەيدا گوتويەتى: ((چاكترين پێخۆر (الأدْم أو الإدام) سركەيە)).

صحيح ١٣٠_ عن جابر بن عبدالله قال: قال رسول الله صلى الله علية و سلم: ((نِعْمَ الإدامُ الخلّ)).

١٣٠_ لە جابرى كوڕى عەبدولاّوە دەگێڕنەوە فەرموويەتى: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى: ((چاكترين پێخۆر سركەيە )).

صحيح ١٣١_ عن زَهْدَم الجَرمْي قال: ((كنا عند أبي موسى الأشعري فأتيَ بلحم دجاجٍ، فَتَنَحى رجلُ من القومِ، فقال: مالَكَ؟ فقال: إني رأيتها تأكل شيئاً

---

[١٢٩] _ أخرجه المؤلف في ((الأطعمة)) برقم ١٨٤١ ومسلم في ((الأشربة)) برقم ٢٠٥١.
(قلت: وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح))، وقد أخرجه هو ومسلم عن شيخين لهما أحدهما الإمام الدارمي _ وهو عبدالله بن عبدالرحمن الذي ذكر له المؤلف اللفظ الثاني، وهو في ((سنن الدارمي)) (٢/١٠١)، والحديث مخرج في ((الصحيحة)) من طرق ٢٢٢٠).

[١٣٠] _ أخرجه المؤلف في ((الأطعمة)) برقم ١٨٤٠ ومسلم وأبوداود فيه برقم ٣٨٢٠ والنسائي.
(قلت: أخرجوه من طرق عن جابر، وهي مخرجه في المصدر السلبق).

[١٣١] _ أخرجه المؤلف في ((الأطعمة)) برقم ١٨٢٧ والبخاري في ((التوحيد)) و((النذور)) و((الذبائح)) و ((كفارات الأيمان)) و((المغازي)) ومسلم في ((الأيمان والنذور)) والنسائي في ((الصيد)). (قلت: وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح)) ورواه الدارمي (٢/١٠٢) أيضاً وأبو

(١٦٨) فحلفتُ أن لا آكلَـها، قال: ((ادنُ فإني رأيت رسول الله صلى الله عليه وسلم يأكل لَحم الدجاج)).

وفي رواية عنه قال: كنا عند أبي موسى الأشعري قال: فَـقُدِّم طعامُـه: وقُدِّم في طعامه لحم دجاجٍ، وفي القوم رجلُ من تَـيْـمِ الله، أحمرُ كأنَّـه مولَـى. قال: فلم يـدْنُ. فقال له أبوموسى: ((ادنُ فـإني قد رأيت رسول الله صلى الله عليه وسلم أكل منه)). فقال: إني رأيته يأكل شيئاً فقذِرته، فحلفت أن لا أطعمه أبداً.

١٣١_ له زەهـدەمی جەرمیەوە فەرموویەتی: ((لە گەڵ ئەبو موسای ئەشعەریدا دانیشتبووین گۆشتی مریشكی بۆ هێنرا،پیاوێكی كۆمەڵەكە دووركەوتەوە، فەرمووی: ئەوە چیتـە؟ پیاوەكە گوتی: بینیم شتێكی بۆگەن دەخوات و سوێندم خوارد ئیتر نەیخۆم، فەرمووی: ((نزیك بەرەوە چونكە بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ گۆشتی مریشك دەخوات)). زەهدەمی جەرمی لە ڕیوایەتێكی تردا دەفەرمێت: ((لە گەڵ ئەبو موسای ئەشعەریدا دانیشتبوین، زەهدەم دەڵێت: خواردنەكەی خرایە بەردەست، لە خواردنەكەیدا گۆشتی مریشك پێشكەش كراو، لە هۆزی (تیم الله) پیاوێك لە نێو كۆمەڵەكەدا بوو، سوور بوو هەروەكو لە نازو نیعمەتدا بێت. گوتی: نزیك نەبۆوە. ئەبو موسا پێی فەرموو: ((نزیك بەرەوە چونكە بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ لێی دەخوات)). پیاوەكە گوتی: بینیم شتێكی بۆگەن دەخوات و ڕقم لێدەبێتەوە، سۆیندم خوارد هەرگیز نەیخۆم.

ضعيف ١٣٢_ عن سفينة قال: ((أكلت مع رسول الله صلى الله عليه وسلم لَحمَ حُبَـارى)).

---

الشيخ وغيرهم وهو مخرج في ((الإرواء)) ٢٤٩٩). لە فەرموودەكەشەوە دەردەكەوێت كە خواردنی گۆشتی مریشك حەڵاڵە چونكە لە شتە پاك و خۆشەكانە.

(١٦٨) _ واتە بۆگەن بوو.

[١٣٢] _ أخرجه أبوداود في ((الأطعمة)) برقم ٣٧٩٧ والمؤلف فيه برقم ١٨٣٠. (قـلـت: وضعفه المؤلف ثَـمَّـةَ بقوله: ((حديث غريب)). وهوحري بذلك فـإن في سنده جهالة كما بينته في المصدر السابق). (الحُـبَـارى) بضم الحاء وفتح الباء: باڵندەیەكی ناسراوە، ملی گەورەیە،

۱۳۲_ لە سەفینەوە فەرموویەتی: ((لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ گۆشتی چیرگم خوارد)).

۱۳۳_ عن أبي أسـيد قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: صحيح ((كلوا الزيت، وادَّهنوا به " فإنه من شجرة مباركة))

۱۳۳_ لە ئەسیدەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ڕۆنی زەیتون بخۆن و، خۆتانی پێ چەورکەن، چونکە لە دارێکی پیرۆزە)).

۱۳٤ _ عن عمر بن الخطاب رضي الله تعالى عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: صحيح ((كلو الزيت وادَّهنوا به " فإنه من شجرة مباركة)).

۱۳٤_ لە (عومەری کوڕی خطاب)ەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ڕۆنی زەیتون بخۆن و خۆتانی پێ چەورکەن " چونکە لە دارێکی پیرۆزە)).

صحيح ۱۳٥_ عن أنس بن مالك قال: ((كان النبي صلى الله عليه وسلم يعجبه الدّبَّـاءُ، فَـأُتِـيَ بطعام، أو دُعِـيَ له، فجعلت أتَـتَـبَّعُهُ، أضعه بين يديه، لـما أعلم أنه يحبه)). صحيح

---

ڕەنـگی خۆڵـــەمێشیە، گۆشتەکەی لە نێوان مریشك و مراویدایە، بە نێرو مێکەشی هەر (حُباری)ی پێدەگوترێت. (حُباری): واتە مریشکە کێوی، چیرگ. وەرگێڕ.

[۱۳۳] _ وأخرجه المؤلف في ((الأطعمة)) ۱۸٥۳. (قلت: واستغربه، لكنه حسن على الأقل بما بعده وغيره كما بينته في ((الصحيحة)) (۳۷۹)، وله فيه طرق أخرى).

[۱۳٤] _ وأخرجه المؤلف في ((الأطعمة)) برقم ۱۸٥۲ وابن ماجة فيه برقم ۳۳۰٤. (قلت: وأعله المؤلف هنا و هناك، ولكنه بين وجهه ثمة، والراجح عندي المرسل.ولكنه يتقوى بما قبله كما بينته في المصدر السابق، لا سيما وقد وجدت له طريقا أخرى عن عمر نحوه في ((المعجم الكبير)) للطبراني ۸۹).

[۱۳٥] _ أخرجه المؤلف بألفاظ متقاربة في ((الأطعمة)) برقم (۱۸٥۰ و۱۸٥۱) وأ بوداود فيه برقم ۳۷۸۲ ومسلم فيه برقم ۲۰٤۱ والبخاري في ((الأطعمة / باب الدباء)) والنسائي.

وفي طريق ثانيه (١٦٣): ((إن خياطاً دعا رسول الله صلى الله عليه وسلم لطعام صنعه، قال أنس: فذهبت مع رسول الله صلى الله عليه وسلم إلى ذلك الطعام، فَـقَرَّبَ إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم خبزاً من شعير، ومَرَقاً ﴾ وفي طريق ثالثـه: ثريداً عليه دباء / ٣٣٤﴾ فيه دباء وقديد، (١٦٩) قال أنس: فرأيت النبي صلى الله عليه وسلم يتتبع الدّباء حوالى القصعة، (١٧٠) ﴿وكان يحب الدباء﴾ فلم أزَلْ أحِبّ الدّباء من يومئذ)).

((پێغەمبەری خوا ﷺ کولەکەی بە دڵ بوو، خواردنێکی بۆ هێنرا، یا بانگ کرا بۆ خواردنی، منیش بە دوای کولەکەکانی نێو خواردنەکەدا دەگەڕام، دەمخستە پێش دەستی، چونکە دەمزانی حەزی لێیەتی)). لە ڕێگەیەکی دووەمەوە (١٦٣)؛ ((بەرگ دروویەك پێغەمبەری خوای ﷺ بانگکرد بۆ خواردنێك دروستی کردبوو، ئەنەس فەرموویەتی: بە هاوڕێیەتی پێغەمبەری خوا ﷺ چووم بۆ ئەو خواردنە، چەند نانێك لە جۆو، شلەیەك ﴿لە ڕێگەیەکی سێیەمیشەوە: تریتێك کولەکەی بە سەرەوە بوو: ٣٣٤﴾ کە گۆشتی وشکراوەی تێدا بوو خستە پێش دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەنەس فەرمووی: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوای کولەکەی نێو چواردەوری لەگەنەکەدا (قصعە) دەگەڕا ﴿حەزی لە کولەکە بوو﴾ منیش لەو ڕۆژەوە حەزم لە کولەکەیە)).

---

(قلت: وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح، وقد روى من غير وجه عن أنس)). وأخرجه أبو الشيخ (٢١٢ و٢١٤) من طرق عدة عنه، وابن سعد (٣٩١/١ و٣٩٢) ببعضها، وهو مخرج في ((الصحيحة)) برقم ٢١٢٧).

(الدباء): هو القرع: واتە کولەکە.

(١٦٩) _ القديد: گۆشتێکی خوێ کراو وشکراوەیە لەبەر هەتاو یا هیتر.

(١٧٠) _ القَصعة، بفتح القاف: لەگەنێکە دە کەس تیایدا نان دەخوات، بەڵام (الصحفة) جۆرە لەگەنێکی ترە پێنج کەس تیایدا دەخوات .

صحيح ١٣٦_ عن حكيم بن جابر عن أبيه قال: ((دخلت على النبي صلى الله عليه وسلم فرأيت عنده دُبَّاء يُقَطَّعُ، فقلت: ما هذا؟ قال: ((نُكَثِّر به طعامَنا)).

قال أبو عيسى: وجابر هذا هو جابر بن طارق، ويقال: ابن أبي طارق، وهو رجل من أصحاب رسول الله صلى الله عليه وسلم، ولا نعرف له إلا هذا الحديث الواحد.

١٣٦ _ حەكیمی كوڕی جابر لە باببیەوە دەگێڕێتەوە و دە فەرمێت: ((چومە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و بینیم كولەكە لە لایدا لەت لەت دەكرێت. گوتم: ئەمە چی یە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خواردنمانی پێ زیاد دەكەین)).

ئەبو عیسی فەرموویەتی: ئەم جابرە جابری كوڕی گرقهو، پێشی گوتراوە: ئیبنو ئەبی گارق، كە پیاوێك بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ،و تەنها ئەم فەموودەیەشی دەناسین.

صحيح ١٣٧_ عن عائشة قالت: ((كان النبي صلى الله عليه وسلم يحب الحلواء والعسل)).

١٣٧ _ لە عائیشەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ حەڵواو هەنگوێنی بە دڵ بوو)).

---

[136] _ أخرجه ابن ماجة برقم ٣٣٠٤ في ((الأطعمة)) وقد أشار إليه المؤلف في ((الأطعمة)) بعد حديث ١٨٥٠.

(قلت: وإسناده صحيح، وأخرجه أبو الشيخ أيضاً (ص ٢١٤) والطبراني (٢٠٨٠ _ ٢٠٨٥) وهو مخرج في المصدر السابق برقم ٢٤٠٠).

[137] _ أخرجه المؤلف في ((الأطعمة)) برقم ١٨٣٢ والبخاري في ((الأطعمة / باب الحلواء والعسل)) وفي ((الأشربة)) و((الطب)) و((ترك الحيل)) ومسلم برقم (١٤٧٤) وأبوداود في ((الأشربة / باب شراب العسل)) برقم ٣٧١٥ وابن ماجة في ((الأطعمة)) برقم ٣٣٢٣.

(قلت: وكذا الدارمي (٢/١٠٧) وأحمد (٦/ ٥٩) وابن سعد (١/ ٣٩١) وأبو الشيخ ٢٠٣).

١٣٨_ عطاء بن يسار أن أم سلمة أخبرته: صحيح ((أنها قَـرَّبت إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم جَـنْـباً مَـشْـوِيّـاً، فأكل منه، ثم قام إلى الصلاة وما توضَـأ)).

١٣٨_ لە عەطائى كوڕى يەسار دەگێڕنەوە كە ئومو سەلەمە پێى ڕاگەياند بوو: ((كە پارچە گۆشتێكى برژاوى خستە بووە پێش دەستى پێغەمبەرى خوا ﷺ، لێى خواردبوو، پاشان هەستا بۆ نوێژو دەستنوێژى نەگرتبوو)).

١٣٩ _ عن عبد الله بن الحارث قال:صحيح ((أكلنا مع رسول الله صلى الله عليه وسلم شِـواءً في المسجد)).

١٣٩_ لە عەبدوڵاى كوڕى حارثەوە فەرموويەتى: ((لەگەڵ پێغەمبەرى خوادا ﷺ برژاوێكمان لە مزگەوتدا خوارد)).

صحيح ١٤٠_ عن المغيرة بن شعبة قال: ((ضِفت (١٧١) مع رسول الله صلى الله عليه وسلم ذات ليلةٍ فأتي بجَـنْـب (١٧٢) مَشْوِيّ، ثم أخذ الشَّـفرةَ فجعل

---

[١٣٨] _ أخرجه المؤلف في ((الأطعمة)) برقم ١٨٣٠ وهو مما تـفرد به.

(قـلـت: كلا، فـقـد أخرجه الـنسائي أيضاً في ((الطهارة / باب ترك الوضوء مما غيرت النار))، وأخرجه أحمد (٦ /٣٠٧) وإسناده صحيح، وقال المؤلف: ((حسن صحيح غريب))).

[١٣٩] _ أخرجه ابن ماجة في ((الأطعمة)) برقم ٣٣١١ وأشار إليه المؤلف في ((سننه)) بعد رقم ١٨٣٠.

(قـلـت: أخرجه ابن ماجة في موضعين: أحدهما بالرقم المذكور، وفيه _ كالمؤلف_ ابن لهيعة، والآخر برقم (٣٣٠٠) وإسناده صحيح، لكن ليس فيه ذكر (الشّـواء)، وحسنه البوصيري فـقـصر، وصححه ابن حبان (٢٢٣) ورواه أحمد (٤/ ١٩٠ و١٩١) بالأسنادين).

[١٤٠] _ وأخرجه أبوداود في ((الطهارة)) برقم ١٨٨ وابن ماجة.

(قـلـت: هذا خطأ، فـإن ابن ماجة لم يخرجه مطلـقـاً كما في ((تحفة المِزِّي)) (٨/٤٩٢) و ((ذخائرالنابلسي)) (١١٥/٣)، وعزاه المزي الى ((كبرى النسائي))، وإسناد الحديث صحيح، وهو مخرج في ((صحيح أبي داود)) ١٨٢).

(١٧١) _ ضِـفـتُ: واتە ميوانى بووم .

(١٧٢) _ بجنب مشوي: واتە پارچە گۆشتێكى برژاو. (شفرة): واتە چەقۆ.

يَـحِـزّ، فَـحَـزَّ لي بها منه. قال: فجاء بلال يُـؤْذِنـه(١٧٣) بالصلاة، فألـقـى الشَّـفـرة فقال: ((ما له؟ تَـرِبَـتْ (١٧٤)يداه)).

١٤٠ _ له موغیرەی كوڕی شوعبەوە فەرموویەتی: ((شەوێك میوانی پێغەمبەری خوا بووم ﷺ پارچە گۆشتێكی برژاوی بۆ هێنرا، پاشان چەقۆكەی هەڵگرت و دەستی بە بڕینی كرد، بە چەقۆكە بۆی لـێ بڕیم. موغیرە فەرمووی: ئەمجا بیلال هاتو كاتی نوێژی پێڕاگەیاند، چەقۆكەی فڕێداو فەرمووی: ((چیەتی؟ هەژاركەوێت)).

قال: (١٧٥) وكان شاربُـه قد وَفَى، (١٧٦) فقال له: ((أقُـصّـه لك على سواك؟))، أو (١٧٧): ((قُـصَّـه (١٧٨) على سواك)).

---

(١٧٣) _ يؤذنه بالصلاة: واتە كاتی نوێژی پێڕاگەیاند.

(١٧٤) _ تَـرِبت يداه: بفتح التـاء وكسر الراء: لە كتێبی (شرح سنن الترمذي)دا (١٢٨/١) ولەمیانەی باسكردنی فەرموودەی (١١٣)دا ها تووە: ((كە بنچینەی وشەی (تربت) واتە هەژار كەویت، بەڵام عەرەب ڕاهاتوون لە سەر بە كارهێنانی وشەكە بە بێ مەبەست بوون لە مانای بنچینەیی وشەكە بۆ نمونە دەڵێن؛ تربت يداك: واتە هەژار كەویت، وقاتـله الله ما أشجعه: واتە خوا بیكوژێت چەند ئازایە، ولا أم له: واتە دایكی نەبێت، ولا أب له: واتە بابت نەبێت، ثـكلتـه أمه: واتە لە بار دایكی چیت، ویل أمه: وەیل بۆ دایكی. هەموو ئەوانە بە كاردەهێنن لە كاتی ئینكاركردنی شتێكدا، یا قەدەغەكردنی، یا بڕیاردانی جێبەجیكردنی، یا بە مەزن و گەورە دانانی، یا هاندان یا شادومان و پێ سەرسام بوونی. والله أعلم. بڕوانە كتێبی ((شرح مسلم))ی ئیمامی نەوەوی ٢٢١/٣.

(١٧٥) _ قال: گوتی؛ واتە موغیرە فەرمووی، چونكە لێرەدا كە فەرموویەتی؛ ((وكان شاربه)) واتە سمێڵی ئاوڕدانەوەیەكی تێدایە لە كەسی قسەكارەوە بۆ نادیار، چونكە مەبەستی بوو بڵـێت (وكان شاربي) واتە سمێـڵـم، ئەمەش زۆر بە ڕوونی لە (ڕیوایە)تێكی ئیمامی ئەحمەدا ئاشكەرایە بە بێژەی؛ ((قال المغيرة.وكان شاربي وفى)) واتە ((موغیرە فەرمووی. سمێـڵـم درێژ ببوو)). هەروەها بە پشتگیریكردنێكی زیاتری (ڕیوایە)تەكەی ئیمامی (الطحاوي) كە لە ڕێگەیەكی ترەوە لە موغیرەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت؛ ((أخذ رسول الله صلى الله عليه من شاربي على سواك)) واتە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم لە سەر سیواك لە سمێڵی بڕیم. وە ئەوەی لە كتێبی (الشمائل) و هیدیكەدا هاتووە كە گوایە مەبەست (سمێڵی بیلال) ە هەڵەیەكی ئاشكەرایە. سوودی فەرموودەكەش لەوەدایە كە سونەت لە سمێڵـدا بڕینێتی لە لێوارەوە و نەك

١٤٠ _ موغیرە فەرمووی: سمێڵم درێژ ببوو، پێی فەرموم: ((ئایا لە سەر سیواك بۆتی ببڕم))، یا: ((لە سەر سیواك بیبڕە)).

صحیح ١٤١ _ عن أبي هريرة قال: ((أُتِـي النبي صلى الله عليه وسلم بلحم، فـرُفِـعَ إليه الذراع، وكانت تُـعجِـبُـه، فَـنهَـش منها)).

١٤١ _ لە ئەبی هوریرەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ گۆشتی بۆ هێنراو، دەستەکەی بۆ بەرزکرایەوە و خرایە پێش دەستی و، زۆر حەزی لێبوو، قەپی پێداکرد و لێی خوارد)).

١٤٢_ عن ابن مسعود قال: صحيح ((كان النبي صلى الله عليه وسلم يعجبه الذراع. قال: وَسُـمَّ في الذراع، (١٧٩) وكان(١٨٠) يُـرى أن اليهود سَـمّـوه)).

---

هەمووی بتاشرێت، وەکو هەندێك لە صوفیەکان و کەسانی دیکەش ئەنجامی دەدەن. بۆ زیاتر شارەزابوون بگەڕێرەوە بۆ کتێبەکەم (آداب الزفاف).

(١٧٦)_ وفی: وا تە درێژ ببوو بەسەر زارمدا دەیڕوانی.

(١٧٧) _ أقصه لك على سواك: بتـقدير همزة الأستـفهام أي أأقصه لك على سواك: واتە ئایا لەسەر سیواك بۆتی برم. سیواکیش بریتیە لە دارێـکی بچوکی (ئاراك) و بۆ پاکردنەوەی دانەکان بەکاردەهێنرێت، مەبەستی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم ئەوە بوو دار سیواکەکە بخاتە ژێر سمێـڵی و پاشان ئەوەی لە دار سیواکەکە درێژتر بێت بیبڕێت.

(١٧٨) _ ((أو)): واتە (یا) گومانێکە لای ئەو کەسانە دروست بووە کە فەرموودەکەیان لە موغیرەوە یا کەسانی دیکەوە گێڕاوەتەوە کە ئایا بە چ دەربڕینێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم ڕستەکەی فەرمووە.

(گوتم: من واتیدەگەم لە نوسخەی بنچینەوە فەرمایشتی: ((لە)) کەوتبێت چونکە ڕستە ڕاستەکە بەم جۆرەیە:

((قصه له)) بە بەڵـگەی هەردوو (ریوایە) تەکەی ئیمامی ئەحمەد و ئیمامی ئەبو داود: ((وكان شاربي وفى، فقصه لي على سواك)) واتە سمێـڵـم درێژ بوبو، لە سەر سیواك بۆی بڕیم. یا فەرمووی: ((أأقصه لك على سواك)) واتە ئایا لە سەر سیواك بۆتی برم).

[١٤١] _ أخرجه المؤلف في ((الأطعمة)) برقم ١٨٣٨ وابن ماجة برقم ٣٣٠٧ والبخاري ومسلم.

[١٤٢] _ وأخرجه أبوداود فى ((الأطعمة)) حديث رقم ٣٧٨١.

(قـلـت: وكذا أبو الشيخ (٢٠٢) وهو مخرج في ((الصحيحة)) ٢٠٥٥).

١٤٢ _ لە ئیبنو مەسعودەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ گۆشتی پیلی بە دڵ بوو. ئیبنو مەسعود فەرمووی: دەستێکیان بۆ ژەهراوی کردبوو واشگومان دەبەم جوولەکەکان ژەهراویان کردبێت)).

١٤٣ _ عن أبي عُبيد(١٨١) قال: صحيح ((طَبخت للنبي صلى الله عليه وسلم قدراً، وقد كان يُعجبه الذراع، فناولته الذراع، ثم قال: ((ناولني الذراع)) فناولته. ثم قال: ((ناولني الذراع)).فقلت: يا رسول الله! وكم للشاة من ذراع؟ فقال: ((والذي نفسي بيده لو سكتً لناولتني الذراع ما دعوت)).

١٤٣_ لە ئەبی عوبێدەوە فەرموویەتی: ((بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ پڕ مەنجەڵێکم لێناو، گۆشتی دەستی بە دڵ بوو، دەستێکم پێدا، پاشان فەرمووی: ((دەستەکەم بەرێ)) پێمدا. پاشان فەرمووی: ((دەستەکەم بەرێ)). ئەوجا گوتم:

---

(١٧٩) _ ئەوە لە جەنگی خەیبەردا روویدا، زەینەبی کچی حارث بە فەرمانی جوولەکە بۆی دانابوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەواڵی ژەهرەکەی پێدراو خۆی لێپاراست، پاشان زەینەب موسڵمان بوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم هیچ تۆڵەیەکی لێنەکردەوە، پێغەمبەری خوا زەینەبی لە پێش خۆیدا ئامادەکرد و پێی فەرموو: چ پاڵی پێوەنای ئەو کارە بکەی؟ زەینەبیش گوتی: ئەگەر پێغەمبەر بیت ژەهر هیچ کارێکت تێ ناکات و مەگەر (وإلا) لە تۆ رزگارمان دەبێتو دەحسێینەوە.

(١٨٠) _ وكان: واتە ئیبنو مەسعود، (كان يُرى) واتە واگومان دەبرا، كە بە شێوەی نادیار (مجهول) دەربڕاوە، واتە ئیبنو مەسعود واگومان دەبا، بە شێوەی دیار (معلوم).

[١٤٣] _ قلت: حديث صحيح، ورجاله ثقات غير شهر بن حوشب وعنه أخرجه أحمد (٣/ ٤٨٤ و٤٨٥). لكن له شاهد من حديث عبد الرحمن بن أبي رافع عن عمته عن أبي رافع مرفوعاً به نحوه. أخرجه أحمد (٦/٨) وابن سعد (١/٣٩٣) والطبراني في ((المعجم الكبير)) (رقم_ ٩٧٠)، وله عند أحمد (٦/٣٩٢) والطبراني (٩٦٤_٩٦٩) طرق أخرى يتقوى بها. وشاهد ثان من حديث أبي هريرة في

((المسند)) (٢/٥١٧) وإسناده حسن، وصححه ابن حبان (٢١٥٣). وشاهد ثالث عن فلان لم يسم. وأخرجه أحمد (٢/ ٤٨).

(١٨١) _ عبيد بالتصغير بدون تاء: بەندەی (مولی) پێغەمبەری خوا بوو صلى الله عليه وسلم وقد جاء بالتصغير أيضاً (أبو عبيدة).

ئەی پێغەمبەری خوا! مەڕ چەند دەستی هەیە؟ فەرمووی: ((بەو زاتەی نەفسی منی بە دەستە ئەگەر بێدەنگ بوایەی چەند داوام بکردایە دەستت دەدامێ)).

ضعيف ١٤٤_ عن عائشة رضي الله عنها قالت: ((ما كانت الذراع أحبَّ اللحم إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم، ولكنه كان لايجد اللحم إلا غِـبّـاً،(١٨٢) وكان يَـعْـجَـل إليها لأنها أعجلها نضجاً)).

١٤٤_ لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: ((گۆشتی دەست خۆشترین گۆشت نەبوو بەلای پێغەمبەری خواوە ﷺ، بەڵام گۆشتی دەست نەدەکەوت مەگەر (إلا) جار بە جارێك، پەلەشی بۆ دەكرد چونكە لە هەمووی خێراتر پێدەگەشت)).

ضعيف ١٤٥_ عبدالله بن جعفر يقول: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: ((إن أطيبَ اللحمِ لحم الظَّهرِ)).

١٤٥ _ عەبدولای كوڕی جەعفەر دەفەرموێت: گو یـسـبیـستی پێغەمبەری خوا بوم ﷺ دەیفەرموو: ((بە تامترین گۆشت گۆشتی پشتە)).

[144] _ وأخرجه المؤلف في ((الأطعمة)) برقم ١٨٣٩.

(قـلـت: وضعفه بقوله ((غريب لا نعرفه إلا من هذا الوجه)). وفيه فليح بن سليمان وليس بالـقـوي كما قال الذهبي في ((الـكـاشف)) عن عبدالوهاب بن يحيى بن عباد لم يوثـقـه غير ابن حبان، ذكره في أتباع التابعين، وهذا يعني أنه منـقـطع لأنه يرويه عن جد أبيه: عبدالله بن الزبير، وهو صحابي معروف. ثم إن الحديث بظاهره مخالف للحديث الصحيح: ((كان أحب اللحم إليه الذراع)). أخرجه أبو الشيخ (٢٠١) من طرق عن جمع من الصحابة. منها أبو هريرة، وقد مضى حديثه برقم ١٤١).

(١٨٢) _ غِـبـاً، بكسر الغين: واتە جار بە جارێك.

[145] _ أخرجه ابن ماجة في ((الأ طعمة / باب أطايب اللحم)) ح ٢٣٠٨.

(قـلـت: وفيه شيخ من (فَـهم) لم يسم، ولذلك خرجته في ((الضعيفة)) ٢٨١٣).

١٤٦_ عن أم هانيء قالت: حسن دخل عليَّ النبي صلى الله عليه وسلم فقال:((أعندكِ شيء؟)). فقلت: لا، إلا خبزٌ يابس وخلُ، فقال: ((هاتي، ما أقْـفَرَ (١٨٣) بيت من أدم فيه خَـلّ)).

١٤٦_ لە ئومو هانيئەوە فەرموويەتى: ((پێغەمبەرى خوا ﷺ ديدەنى كردم و فەرمووى: ((ئايا شتێك خواردنت هەيە؟)). گوتم: نەخێر، جگە لە نانى وشك و سركە، فەرمووى: ((بيهێنە، ماڵێك سركەى تێدا بێت خاڵى نابێت لە پێخۆر)).

صحيح ١٤٧_ عن أبي موسى الأشعري عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: ((فَضل عائشةَ على النساءِ، كفضل الثَّريدِ على سائر الطعامِ)).

١٤٧_ لە ئەبى موساى ئەشعەريەوە دەگێڕنەوە فەرموويەتى: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى: ((فەزل و چاكێتى عائيشە بەسەر ژنانەوە، هاوشێوەى فەزڵ و چاكێتى تريتە بەسەر تێكڕاى خواردنەكانەوە)).

صحيح ١٤٨_ أنس بن مالك يقول: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((فضل عائشة على النساءِ، كفضل الثَّريدِ على سائر الطعامِ)).

---

[١٤٦] _ وأخرجه المؤلف في ((الأطعمة)) برقم ١٨٤٢ وهو مما تفرد به.
(قلت: وقال: ((حسن غريب من هذا الوجه)). وفيه ثابت أبو حمزة الثمالي وهو ضعيف. لكن للحديث شواهد عن عائشة وجابر يرتقي بمجموعها الى درجة الحسن، وقد خرجتها في ((الصحيحة)) ٢٢٢٠).
(١٨٣) _ واتە لە پێخۆر خاڵى نابێت و دانشتوانەكەشى بىَ پێخۆر نابن ((نهاية)).
[١٤٧] _ أخرجه المؤلف في ((الأطعمة)) برقم ١٨٣٥ والبخاري في ((أحاديث الأنبياء)) وفي ((فضل عائشة)) و ((الأطعمة)) ومسلم في ((الفضائل)) برقم ٢٤٣١ والنسائي في ((عِشرة النساء)).
(قلت: وقال المؤلف: ((حسن صحيح))).
(الثريد): لە ڕۆرى بريتيە لە نانى تێكەڵكراوى شلەو لەگەڵ گوشتدايە.
[١٤٨] _ أخرجه المؤلف في ((فضل عائشة)) برقم ٣٨٨١ والبخاري في ((فضل عائشة)) وفي ((الأطعمة)) ومسلم في ((الفضائل)) برقم ٢٤٤٦ وابن ماجة في ((الأطعمة)).

١٤٨_ ئەنەسی كوڕی مالك دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((فەزڵ و چاكێتی عائیشە بە سەر ژنانەوە، هاوشێوەی فەزڵ و چاكێتی تریتە بە سەر تێكڕای خواردنەكانەوە)).

صحيح ١٤٩_ عن أبي هريرة رضي الله عنه: ((أنه رآى رسولَ الله صلى الله عليه وسلم توضأ من ثَـوْرِ أقـطٍ،(١٨٤) ثم رآه أكل من كَـتـف ولم يتوضأ)).

١٤٩_ لە ئەبی هوریرەوە ڕەزای خوای لێبێت: ((كە بینیبوی پێغەمبەری خوا ﷺ بە هۆی خواردنی پارچەیەك كەشكەوە دەستنوێژی گرت، پاشان بینیبوی لە گۆشتی شانی مەڕێك دەخوات و، دوای ئەوەش نوێژی كردو دەستنوێژی نەگرتەوە)).

حسن ١٥٠_ عن أنس بن مالك قال: صحيح ((أوْلَـمَ (١٨٥) رسول الله صلى الله عليه وسلم على صَـفِـيَّـةَ بتمر وسَـويق)).

---

[149] _ أخرجه المؤلف في ((الطهارة)) برقم ٧٩ وابن ماجة برقم ٤٩٣ ولفظه ((أكل صلى الله عليه وسلم كتـف شاة فمضمض وغسل يديه وصلى)).

((قـلـت: إسـنـاد حديث الباب صحيح على شرط مسلم، وأخرجه ابن خزيمة في ((صحيحه)) (٤٢) وعنه ابن حبان (٢١٧) أما حديث المؤلف هناك، فهو حديث آخر إسناداً و متـنـاً فـإنه من طريق أخرى عن أبي هريرة مرفوعاً بلفظ:

((الوضوء مما مست النار، ولو من ثور أقط)). فقال له ابن عباس: يا أبا هريرة! أنتوضـأ من الدهن ؟! أنتوضأ من الحميم ؟! قال: فقال أبوهريرة: يا ابن أخي إذا سمعت حديثـاً عن رسول الله صلى الله عليه وسلم فلا تـضرب له مثلا:

واتە ئەبو هوریرە لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه و سلم دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: دەستنوێژگرتن بە هۆی هەموو شتێكەوە ئاگری بەركەوتبێت، ئەگەر با كەشكیش بێت. گوتی: ئیبنوعەباس بە ئەبو هورەیرەی فەرموو: ئایا بە هۆی ڕۆنەوە دەستنوێژ بگرین ؟ ئایا بە هۆی گەرمیەوە دەستنوێژ بگرین ؟: ئەوەبوو ئەبو هورەیرە فەرمووی: ئەی كوڕی برام هەر كات لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه و سلم فەرمودەیەكت بیست نموونەی بۆ مەهێنەرەوە.

(١٨٤) _ الـثَـوْر، بفتح الـثـاء وسكون الواو: واتە پارچەیەك (الأقـط)، واتە بە هۆی خواردنی پارچەیەك (الأقـط)ەوە كە: دۆیەكی ووشكراوی ڕەقە كە لە ناو كوردەواری ئێستەدا كشكی پێ دەڵێن.

١٥٠_ لە ئەنەسى كوڕى مالكەوە فەرموويەتى: ((پێغەمبەرى خوا ﷺ بۆ گواستنەوە صەفيە زيافەتێكى لە خورما و ئاردى سفر دروست كرد)).

ضعيف ١٥١_ عن سلمى(١٨٦) أن الحسنَ بنَ علي ٍ وابنَ عباس وابنَ جعفر أتوها، فقالوا لها: اصنعي لنا طعاماً مما كان يعجب رسولَ الله صلى الله عليه وسلم ويُحَسِّن أكلَه، فقالت: يا بُنَيَّ لا تشتهيه اليوم، قال: بلى، اصنعيه لنا. قال: فقامت فأخذتْ من شعير فطحنته، ثم جعلته في قِدْر، وصبَّت عليه شيئاً من زيت، ودقَّت الفلفلَ والتوابلَ (١٨٧) فقربته إليهم، فقالت:((هذا مما كان يعجب رسول الله صلى الله عليه وسلم ويُحَسِّن أكله)).

١٥١ _ لە سەلما دەگێڕنەوە كەوا حەسەنى كوڕى عەلى و ئیبنو عەباس و ئیبنو جەعفەر چونەتە دیدەنى و، پێیان فەرمووە: خواردنێكمان بۆ دروست بكە لەوانەى پێغەمبەرى خوا ﷺ حەزى لێدەكردو خواردنى بە چاك دادەنا، سەلما گوتى: كوڕم ئەمڕۆ ئارەزوى مەكە، ئەویش فەرمووى: بەڵێ، دروستیكە بۆمان. فەرمووى: هەستاو لە جۆیەكەى برد و هاڕى، پاشان كردى بە نێو مەنجەڵێك و، هەندێك ڕۆنى بە سەریدا ڕژاندو، فلفلو بەهاراتى هارىو خستیە پێش دەستیان،

[١٥٠] _ أخرجه المؤلف في ((النكاح)) برقم ١٠٩٥ وأبوداود برقم ٣٧٤٤ وابن ماجة برقم ١٩٠٩.
(قلت: وقال المؤلف: ((حسن غريب)). لكن رواه أحمد (١١٠/٣) بإسناد صحيح ثلاثي).
(١٨٥) _ واتە زيافەتى گواستنەوەى صەفيەى بە خورما و ئارد دروستكرد و لە ((الصحيحين))يشدا هاتووە: ((أولم عليها بحيس)) واتە بۆ گواستنەوەى صەفيە خواردنێكى لە خورما و كەشك و ڕۆن دروستكرد، پێدەچێت لە جياتى كەشك ئارد يا نانى لەت لەت كراو بەكاربهێنرێت.
[١٥١] _ (قلت: إسناده ضعيف، رجاله ثقات غير الفضيل بن سليمان فقد ضعفوه كما في ((الكاشف للذهبي)) مع كونه من رجال الشيخين، ولذلك قال الحافظ في ((التقريب)): ((صدوق له خطأ كثير)). ولا ينافيه قول الهيثمي (٣٢٥/١٠): ((رواه الطبراني، ورجاله رجال الصحيح غير فائدة مولى ابن أبي رافع وهو ثقة)). لأن الفضيل من رجال ((الصحيح)) كما علمت)).
(١٨٦) _ سلمى: دايەنى ئيبراهيمى كوڕى پێغەمبەرى خوايە صلى الله عليه و سلم و خێزانى ئەبى رافعه و خزمەتكارو چێشت لێنەرى پێغەمبەرى خواشە صلى الله عليه و سلم .
(١٨٧) _ توابل: بريتيە لەو مادانەى دەكرێت بە نێو چێشتەوە وەكو كزبرە و كمون و هتد.

ئەمجا فەرمووی: ((ئەمە لەو شتانەیە پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی لێدەکردو خواردنیشی بە چاك دادەنا)).

صحيح ١٥٢_ عن جابر بن عبد الله قال: أتانا النبي صلى الله عليه وسلم في منزلنا، فذبحنا له شاةً، فقال: ((كأنهم علموا أنَّـا نحب اللحم)). وفي الحديث قصه.

---

[152] _ قلت: إسناده صحيح رجاله كلهم ثقات. وأخرجه الدارمي (١/٢٢و٢٥) وأحمد (٣/٢٩٧و٣٩٨) عنه مطولا جداً. ثم رواه أحمد (٣/٣٠٣) من طريق أخرى نحوه مختصراً وهي طريق المؤلف رحمه الله، ولفظه: ((أتيت النبي صلى الله عليه وسلم أستعينه في دين كان على أبي، قال: فقال: آتيكم. قال: فرجعت فقلت للمرأة: لا تـكلمي رسول الله صلى الله عليه وسلم ولا تسـأليه. قال: فـأتـنا فذبحنا له داجناً كان لـنـا، فقال: يا جابر! كـأنكم عرفتم حبـنا للحم. قال: فلما خرج قالت له المرأة: صلي علي وعلى زوجي. أوصل علينـا قال: فقلت لها: أليس قد نهيـتـك. قـالت: ترى رسول الله كان يدخل علينـا ولا يدعو لنا!)) واتە جابری کوڕی عەبدوڵا فەرموویەتی: چومە خزمەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم بۆ کۆمەك خوازی دانەوەی قەرزێك بە لای بابمەوە بوو، جابر فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم فەرمووی: دیدەنیـتان دەکەم. جابر فەرمووی: چومەوە و بە ژنەکەم گوت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا مەدوێ و لێشی مەپرسە. جابر فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم دیدەنی کردین و ئێمەش ئاژەڵـێـکی ما ڵـیمان هەبوو بۆمان سەر بڕی، ئەویش فەرمووی: ئەی جابر! وەکو ئەوەی زانیـبیـتان حەزمان لە گـۆشـتـە. جابر فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم کە چووە دەرەوە ژنەکە پێ ی گوت: داوای لێـخۆش بوون بۆ خۆم و مێـردەکەم بکە، یان ژنەکە گوتی: داوای لێخۆشبوونمان بۆ بکە، پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم فەرمووی: پەروەردگارا لێـیـان خۆشـبە. جابر فەرمووی: بەژنەکەم گوت: ئایا قەدەغەم نەکردیت. ژنەکەش گوتی: بە دیدی تۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم دیدەنیمان دەکات و دوعا و نزامان بۆ ناکات! ئیمامی ئەبو داودیش وادەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم فەرمووی: ((الصلاة على المرأة وزوجها)) واتە خوایە گیان لە ژن و پیاوەکە خۆش بە. لە ڕێگەی یەکەمی گێـڕانەوەی فەرموودەکەشدا زیادەگەلێك هەیە، لەوانە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانیدا بە ناشتنی شەهیدەکانی ئوحد لە جێگەی شەهید بوو نیاندا. وهذا القدر رواه أصحاب السنن الأربعة وصححه المؤلف وابن حبان، وهو مخرج في ((أحكام الجنائز)) (ص ١٤). لەو (تخريج)ەشەوە دوو شت ڕوون دەبێتەوە:

یەکەمیان: ئەو چیرۆکەی دانەر ئاماژەی بۆ دەکات لە (جه نگی ئوحدا) ڕوویداوە.

١٥٢_ لە جابری كوڕی عەبدولاّوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵەكەی خۆماندا دیدەنی كردین و، ئێمەش مەڕێكمان بۆ سەر بڕی، فەرمووی: ((وەكو ئەوەی زانیبێتیان ئێمە حەزمان لە گۆشتە)). لە فەرموودەكەشدا چیرۆكێك هەیە.

صحيح ١٥٣_ عن جابر قال: ((خرج رسول الله صلى الله عليه وسلم وأنا معه، فدخل على امرأة من أنصار، فذبحت له شاة، فأكل منها، وأتـتـه بـقـنـاع (١٨٨) من رطَب (١٨٩) فأكل منه، ثم توضأ للظهر وصلى، ثم انصرف، فأتـتـه بعلالة (١٩٠) من عُلالة الشاة، فأكل، ثم صلى العصر، ولم يتـوضأ)).

١٥٣_ لە جابرەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ چووە دەرەوەو منی لەگەڵدا بوو. تا چووە ماڵێ ئافرەتێكەوە لە ئەنصارەكان، مەڕێكی بۆ سەربڕی‌و، ئەویش لێ ی خوارد، پاشان قاپێك خورمای ڕوتابی پێگەیوی بۆ هێناو لێی خوارد، پاشان دەستنوێژی گرت و نوێژی نیوەڕۆی ئەنجامدا، كە سلاّوی دایەوە ئافرەتەكە چوو، پاشماوەیەك لە پاشماوەكانی مەڕەكەی بۆ هێناو، ئەویشی خوارد، پاشان نوێژی عەسری ئەنجامداو دەستنوێژی نەگرت)).

---

دووەمیان: هەڵەی گوفتاری دوانێژە (المعلق) كە گوایە جابر لە كاتی (جەنگی خەندەقدا) فەرموویەتی: چیرۆكێكی تری باس كردوە، بە دڵـنیای ئەوە چیرۆكێكی ترە و جیاوازە لەم چیرۆكە، لەبەر ئەوە لامبردووە، سوودی لێوەرگیرە، چونكە لای ڕاڤـەكاران شاراوە بووە، والله الموفق.

[١٥٣] _ أخرجه أصحاب السنن، والمؤلف في ((الطهارة)) برقم ٨٠.

(قـلـت: إسناده صحيح وعزوه لغيره من أصحاب السنن وبهذا السياق خطأ كما يـتـبـين ذلك بمراجعة ((تحفة الأشراف)) للحافظ المزي ٢/ ٢١٢و٣٦٥).

(١٨٨) _ قِـنـاع بكسر الـقـاف: قـاپێـكە یا سینیـەكە خواردنی لە سەر دەخورێت.

(١٨٩) _ رُطَـب: پێچەوانەی وشكەو، خورمای ڕوتابیش ناسراوە، بریتیە لە پێـگەیوی فەریكە (بسر) خورما.

(١٩٠) _ العُلالة بضم العين: واتە پاشماوە، یا ئەوەی كەم كەم خۆتی پێوە خەریك دەكەیت. وشەی (العُلالة)ەش لە (العَـلل)ەوە هاتووە: واتە خواردنەوە دوای خواردنەوە.

١٥٤ عن أم المنذر قالت: حسن_ دخل عليَّ رسول الله صلى الله عليه وسلم ومعه عليٌّ، ولنا دَوالٍ (١٩١) معلقه، قالت، فجعل رسول الله صلى الله عليه وسلم يأكل، وعليٌّ معه يأكل، فقال رسول الله صلى الله عليه وسام لعلي: ((مَهْ (١٩٢) يا علي فإنك ناقهُ)). (١٩٣) قالت: فجلس علي والنبي صلى الله عليه وسلم يأكل، قالت: فجعلت لهم سِلقاً وشعيراً، فقال النبي صلى الله عليه وسلم لعلي: ((من هذا فأصب " فإن هذا أوفق لك)).

١٥٤_ له ئومو مونذيرەوە فەرموويەتى: پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوڕێیەتی عەلی دیدەنیان کردمو، ئێمەش هێشووگەلێکی خورمای هەڵواسراومان هەبوو، ئومو مونذر فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە خواردنیو، (عە لی)یش لە گەڵیدا دەیخوارد، پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەلی فەرموو: ((ئەی عەلی وازبێنە، تۆ بەم نزیکانە چاك بویتەتەوە لە نەخۆشی)). ئومو مونذیر فەرمووی: ئەمجا عەلی دانیشت و پێغەمبەری خوا ﷺ دەیخوارد، ئومو مونذیر فەرمووی: پاشان هەستام سڵقو جۆم بۆ لێنان، پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەلی فەرموو: ((لەمە بخۆ" ئەمە بۆ تۆ گونجاوترە)).

حسن ١٥٥_ عن عائشة أم المؤمنين رضي الله عنها قالت: كان النبي صلى الله عليه وسلم يأتيني فيقول: ((أعندكِ غَداء))(١٩٤) فأقول: لا، فيقول: ((إني

---

[١٥٤] _ أخرجه أبوداود في ((الطب)) ٣٨٥٥ والنسائي وابن ماجة والمؤلف. (قلت: وقال: ((حديث جيد غريب)). وأخرجه الحاكم (٤٠٧/٤) وقال: ((صحيح الإسناد)). ووافقه الذهبي. وفيه فليح بن سليمان، قال الحافظ: ((صدوق كثير الخطأ))، وعنه أخرجه أحمد (٣٦٤/٦). نعم ذكر بعضهم أنه توبع، وعليه فالحديث حسن، وعليه جرى ابن القيم، فراجع ((الصحيحة)) ٥٩).

(١٩٠) _ دوال، جمع دالية: هێشو یەکە لە فەریکە خورما (بُسر) هەڵدەواسرێتو، ئەگەر تەڕ بوو پێگەیشت دەخورێت.

(١٩٢) _ (مَهْ) اسم فعل: واتە وازبێنە.

(١٩٣) _ ناقە: واتە تۆ بەم نزیکانە لە نەخۆشی چاك بویتەتەوە. لە سوودەکانی فەرموودەکەش ئامۆژگاری کردنی نەخۆشە بە پارێزکردن و ئەوانەش بەم نزیکانە چاك بوونەتەوە لە نەخۆشی.

[١٥٥] _ (قلت: وأخرجه المؤلف في ((السنن)) (٧٣٤) بإسناده هنا ومتنه وقال: ((حديث حسن، قال يحيى بن سعيد: طلحة بن يحيى لم يكن ثبتاً في الحديث)). وقال فيه الحافظ في ((التقريب)):

صائم))، قالت: فأتاني يوماً، فقلت: يا رسول الله! إنه أهْديَتْ لنا هدية، قال: وما هي؟ قلت: حَيْسُ. (١٩٥) قال: ((أمَا إني أصبحت صائماً)) قالت: ثم أكل.(١٩٦)

١٥٥ _ لە عائیشەی دایکی ئیماندارانەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەهاتە لامو دەیفەرموو: ((ئایا قاوەڵتیت هەیە)) دەمگوت: نەخێر، ئەویش دەیفەرموو: ((کەواتە من بە ڕۆژوم))، عائیشە فەرمووی: ڕۆژێك هاتە لام، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! دیاریەکیان پێشکەش کردوین، فەرمووی: دیاریەکە چی یە؟ گوتم: (حەیسە). فەرمووی: ((بەڵام من بە ڕۆژوو بووم)). عائیشە فەرمووی: پاشان خواردی.

ضعيف ١٥٦_ عن يوسف بن عبد الله بن سَلام قال: رأيت النبي صلى الله عليه وسلم أخذ كَسرةً من خبز الشعير، فوضع عليها تمرةً، وقال: ((هذه إدام هذه))، وأكل.

١٥٦_ لە یوسفی کوڕی عەبدوڵای کوڕی سەلامەوە فەرموویەتی: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ پارچەیەك نانی جۆی هەڵگرتو، خورمایەکی خستە سەری و فەرمووی: ((ئەمە پێخۆری ئەمەیە)) و دەستیکرد بە خواردنی.

---

((صدوق يخطيء)). قلت: فهو حسن الحديث كما قال المؤلف لاسيما وقد أخرج له مسلم هذا الحديث وغيره، وصححه ابن خزيمة، وهو مخرج في ((إرواء الغليل)) ٩٦٥).

(١٩٤) _ غداء: خواردنی سەرەتای ڕۆژە، واتە قاوەڵتی.

(١٩٥) _ حَيْسُ، بفتح الحاء: خواردنێکە لە خورماو کەشكو ڕۆن دروست دەکرێت.

(١٩٦)_ ئەمە بەڵگەی سەربەست بوون (تحلل) و شکاندنی ڕۆژوی سوونەتە.

[١٥٦] _ أخرجه أبوداود في ((الأيمان والنذور)) برقم ٣٢٥٩ والمؤلف.

(قلت: عزوه للترمذي خطأ أيضاً " فإنه لم يروه إلا هنا: ((الشمائل))، وإسناده ضعيف كما بينته في ((الضعيفة)) ٤٧٣٧). ثم إن الحديث إنما هو من مسند يوسف بن عبدالله بن سلام، فما ذكره المعلق أن في نسخة زيادة: ((عن عبد الله بن سلام)) خطأ من بعض النساخ مُخالف لما في ((تحفة الأشراف))، ولأبن كثير ولكل من خرج الحديث فإنهم رووه عن يوسف ولم يتعدوه).

صحيح ١٥٧_ عن أنس أن رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((كان يعجبه الـثُّـفْـل)). قال عبدالله: يعني ما بقي من الطعام.

١٥٧_ لە ئەنەسەوە دەیفەرموو پێغەمبەری خوا ﷺ: ((نیشتووی خواردنی حەز لێبوو)). عەبدوڵا فەرموویەتی: مەبەستی ئەوە بوو كە لە خۆراك دەمایەوە.

[157] _ وأخرجه أحمد والحاكم / الجامع الصغير/.

(قـلـت: ورواه أيضـاً ابن سعد (١/ ٣٩٣) وأبو الشيخ (١٩١) والحاكم (٤/١١٥و١١٦) وبيـض له والذهبي، وإسناده صحيح على شرط الـشـخين. وزاد ابن سعد: ((يعـني الـثـريد)). وهي عند الحاكم من قول أبي بكر محمد بن إسحاق. ومن طرائف التصحيف أن ((الـثـفل)) تـصحف على ناسخ ((أبي الشيخ)) أو طابعه الى ((البقل)) وغفل عن ذلك محـقـقـه الشيخ الغماري فـقـال في تـعـليقه عليه: ((معروف))!).

## ٢٧_ بەشی ئەوەی سەبارەت بە دەستنو یژی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە لە کاتی خۆراکدا [١٩٧]

صحيح ١٥٨_ عن ابن عباس: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم خَرج من الخلاء، فَـقُرِّبَ إليه الطعامُ فقالوا: ألا نـأتيك بـوَضوءٍ؟(١٩٨) قال: ((إنما أمِـرت بالـوضوء إذا قـمت إلى الصلاة)). (وفي رواية / ١٨٧: فقال: ((أأصلي فأتوضأ؟))).

١٥٨_ لە ئیبنو عەباسەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئاودەست هاتە دەرەوەو، پاشان خۆراکی لەپێش دەستدا دانرا، گوتیان: ئاوی دەستنوێژت بۆ نەهێنین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە ڕاستیدا فەرمانم پێکراوە بە دەستنوێژ گرتن هەرکات هەڵسام بۆ نوێژکردن)). لە (ڕیوایە)تێکی تریشدا /١٨٧: فەرمووی: ((ئایا نوێژ دەکەم تا دەستنوێژ بگرم).

ضعيف ١٥٩_ عن سلمان قال: قـرأت في التوراة: إن من بـركة الطعام الوضوء بعده، فذكرت ذلك للنبي صلى الله عليه وسلم، وأخبرته بما قرأت في التوراة، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((بركة الطعام الوضوء قبله، والوضوء بعده)).

---

[١٩٧] _ مەبەست بە دەستنوێژ گرتن لێرەدا، دەستنوێژ گرتنی زمانەوانیە (الوضوء اللغوي) کە بریتیە لە شتنی هەردوو دەست و زار. (گوتم: فەرموودەکەی ئیبنو عەباسی داهاتوو بەر پەرچیدەداتەوە، چونکە بە ڕوونی ئاشکەرای دەکات مەبەست بەوە دەستنوێژ گرتنی شەرعیە نەك زمانەوانی ئەوجا ئاگادار بە، بۆیە پێویستە فەرموودەکەی سەلمان لەم بەشەدا لابرێت ئەگەر دروست بێت).

(١٥٨) _ أبودلود في ((الأطعمة)) برقم ٣٧٦٠ والنسائي والمؤلف فيه برقم ١٨٤٨ ومسلم بنحوه.

(قلت: وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح))).

(١٩٨) _ الوَضـوء، بفتح الواو: مەبەست ئاوی دەستنوێژ گرتنە.، وبضم الواو: مەبەست کرداری دەستنو یژ گرتنە.

[١٥٩] _ وأخرجه المؤلف في ((الأطعمة)) برقم ١٨٤٧ وأبو داود فيه ٣٧٦١.

(قلت: وضعفه المؤلف بقوله: ((لا نعرفه إلا من حديث قيس بن الربيع وهو يضعف في الحديث)). وهو مخرج في ((الضعيفة)) ١٦٨).

١٥٩_ لە سەلمانەوە فەرموویەتی: لە تەوراتدا خوێندبوومەوە: کە خۆراك بەرەکەتو فەرپاریی تێدەکەوێت بە دەستنوێژگرتن لە پاشیدا، ئەوەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکردو، ئەوەش لە تەوراتدا خوێندبوومەوە پێم ڕاگەیاند، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خۆراك بەرەکەت و فەرپاریی تیدەکەوێت بە دەستنوێژ گرتن لەپێشیداو، دەستنوێژ گرتنیش لە پاشیدا)).

## ٢٨_ بەشى ئەوەى پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى پێش خۆراك و پاش ئەوەى لێدەبوويەوە:

ضعيف ١٦٠_ عن أبي أيوب الأنصاري قال: ((كنا عند النبي صلى الله عليه وسلم يوماً فَـقُـرِّبَ طعامُ، فلم أرَ طعاماً كان أعظمَ بركةً منه أوَّلَ ما أكلنا، ولا أقلَّ بركةً في آخره، فقلنا: يا رسول الله! كيف هذا؟ قال: ((إنا ذكرنا اسم الله حين أكلنا، ثم قَعَد ﴿بعد﴾ مَن أكل ولم يسم الله تعالى" فأكل معه الشيطان)).

١٦٠_ لە ئەبى ئەيوبى ئەنصاريەوە فەرموويەتى: ((ڕۆژێك لاى پێغەمبەرى خوا بووين ﷺ، خواردنێك خرايە پێش دەستمان، هيچ خواردنێكى ترم نەبينيبوو لەو خواردنە بەرەكەتدارتر بێت يەكەم جار كە دەستمان بە خواردنى كردو، بەرەكەتيشى كەمتر نەبوو لە كۆتايدا، گوتمان: ئەى پێغەمبەرى خوا! چۆن بوو ئەوە؟ فەرمووى: ((ئێمە ناوى خوامان يادكردەوە كاتێك كە خواردمان، ﴿لە دوا يدا﴾ ئەوەى دانيشت خواردى و ناوى خواى تعالاى نەهێنا " شەيتان لە گەڵيدا خواردى)).

١٦١_ عن عائشة قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: صحيح ((إذا أكل أحدُكم فَـنَـسِـيَ أن يذكرَ الله تعالى على طعامـِه فليقل: (بسم الله أوَّلَـه وآخرَه))).

---

[١٦٠] _ قلت: إسناده ضعيف، فيه عبدالله بن لهيعة، وهو سيء الحفظ، وفوقه راويان لا يعرفان، وقد أخرجه أحمد (٥/٤١٥ و٤١٦) بإسناد المؤلف ومتنه، ومنه أستدركت الزيادة التي بين المعكوفتين، ومن ((المجمع)) (٥/٢٣) وقال: ((رواه أحمد، وفيه راشد بن جندل و حبيب بن أوس، وكلاهما ليس له إلا راو واحد، وبقية إسناده رجال ((الصحيح)) خلا ابن لهيعة وحديث حسن))!.

[١٦١] _ أخرجه أبوداود في ((الأطعمة)) برقم ٣٧٦٧ والنسائي والمؤلف في ((الأطعمة)) برقم ١٨٥٩. (قلت: وقال: ((حديث حسن صحيح)). وصححه غيره أيضاً، وهو كما قالوا بالنظر لشواهده، كما بينته في ((إرواء الغليل)) (١٩٦٥) و((الكلم الطيب)) ١٨٢).

١٦١_ لە عائیشەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەركات یەكێكتان خواردی و بیری چوو لە سەر خۆراكەكەی یادی خوای تعالی بكاتەوە با بڵێــت:(بە ناوی خوا لە سەرەتا و كۆتاییەوە).

صحيح ١٦٢_ عن عُمر بن ﴿أبي﴾ سَلمة (١٩٩) أنه: دخل على رسول الله صلى الله عليه وسلم وعنده طعام، فقال: ((ادنُ يا بُنَيَّ! فَسَمِّ الله تعالى، وكل بيَمِينك، وكل مما يَلِيكَ)).

١٦٢_ لە عومەری كوڕی ﴿ئەبی﴾ سەلیمەوە كە: چۆتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وخۆراكی لە پێش دەستدا بووە، فە رمووی: ((نزیك بەرەوە كوڕم! ناوی خوای تعالی بهێنەو، بە دەستی ڕاستت بخۆ و، لە بەردەمی خۆت بخۆ)).

ضعيف ١٦٣_ عن أبي سعيد الخدري قال: ((كان رسول الله صلى الله عليه وسلم إذا فرغ من طعامه قال: الحمد لله الذي أطعمنا وسقانا، وجعلنا مسلمين)).

١٦٣_ لە ئەبی سەعیدی خودریەوە فەرموویەتی: ((هەركات پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی هەڵگرتایە لە خۆراكەكەی دەیفەرموو: سپاس و ستایش بۆ پەروەردگار كە خۆراكی داین و ئاوی داین و، كردینی بە موسڵمان)).

---

[١٦٢] _ أخرجه المؤلف في ((الأطعمة)) برقم ١٨٥٨ والبخاري فيه وكذا مسلم فيه برقم ٢٠٢٢ وكذا أبوداود برقم ٣٧٧٧ وابن ماجة فيه.

(١٩٩) _ زڕ كوڕی پێغەمبەری خوا بوو صلى الله عليه و سلم لە ئومو سەلیمە، لە دایك بووی حەبەشەیە لە كاتی كۆچكردنی بابیدا بۆ ئەوێ، ساڵی ٨٣ كۆچی لە مەدینە مردووە و ناوی بابیشی عەبدوڵای كوڕی عەبدولئەسەدە .

[١٦٣] _ أخرجه أبوداود برقم ٣٨٥٠ والنسائي.

(قلت: والمؤلف أيضاً (٣٤٥٣)، وإسناده ضعيف كما بينته في ((تخريج الكلم الطيب)) ١٨٨).

صحيح ١٦٤_ عن أبي أمامة قال: كان رسول الله صلى الله عليه وسلم إذا رفعت المائدة من بين يديه يقول: ((الحمد لله حمداً كثيراً طيباً مباركاً فيه، غيرَ مُـوَدَّعٍ (٢٠٠) ولا مُستَغنىً عنه(٢٠١) ربُّنا)).

١٦٤_ له ئەبی ئومامەوە فەرموویەتی: هەركات پێغەمبەری خوا ﷺ خوانەكە لە پێش دەستیدا هەڵگیرایە دەیفەرموو: ((سپاس و ستایش بۆ خوا سپاسو ستایشێكی زۆرو پاك و پیرۆزبێت، وازلێنەهێنانی ئەو ستایشكردنەو، دەست لێ هەڵنەگرتنی پەروەردگارمان)).

صحيح ١٦٥_ عن عائشة قالت: كان النبي صلى الله عليه وسلم يأكل الطعامَ في ستةٍ من أصحابه، فجاء أعرابي فأكَلَه بلُقْمَتَيْن، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((لو سَمَّى لكفاكم)).

١٦٥_ له عائیشەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ شەش كەس لە هاوەڵانیدا خۆراكیان دەخوارد، لەو كاتەدا دەشتیەك هات و بە دوو پاروو خواردی، پێغەمبەری خوا ﷺفەرمووی: ((ئەگەر ناوی خوای بهێنایە بەشی دەكردن)).

---

[١٦٤] _ أخرجه أبوداود برقم ٣٨٤٩ والبخاري والنسائي وابن ماجة في ((الأطعمة)) برقم ٣٢٨٤. (قلت: والمؤلف أيضاً (٣٤٥٢) وصححه، وأحمد ٥/٢٥٢ و٢٥٦و٢٦١و٢٦٧).

(٢٠٠) _ غير مُودَّع: واته واز لێ نەهێنانی ئەو ستایش كردنە بەڵكو كارپێكردنی بە بەردەوامی وەكو چۆن نیعمەتەكانی خوای پەروەردگار چاوتروكانێك لە ئێمە نابڕێت، لە (ڕیوایە) تەكەی ئیمامی بوخاریشدا بەم جۆرەیە: ((غير مكفي ولا مودع)) واتە پێویستی بە هیچ كەس نی یە، بەڵكو هەر پەروەردگارە ڕۆزی بەندەكانی دەدات و پێویستیەكانیان پڕ دەكاتەوە. (جگە لەوەش ڕاڤەگەلێكی تری بۆ كراوە).

(٢٠١)_ ولا مستغنى عنه: واته كەس دەستی لێهەڵناگرێت.

[١٦٥] _ أخرجه أبوداود والمؤلف في ((الأطعمة)) برقم ١٨٥١ وابن ماجة وابن حبان في ((صحيحه)). ئەم فەرموودەیە بە ڕوونی دەریدەخات كە گوتنی (بسم الله) فڕوبەرەكەتی خواردن زیاد دەكاتو، نەگوتنیشی نەمانی بەرەكەتە. (قلت: وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح))، ورواه أحمد (٥/ ٢٠٨).

صحيح ١٦٦_ عن أنس بن بن مالك قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((إن الله لَيَـرْضَـى عن العبد أن يـأكل الأكلـَةَ فَـيَـحْـمَـده عليها، أو يشرب الـشَّربةَ فيحمدُهُ عليها)).

١٦٦ _ له ئەنەسی کوڕی مالك دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:((بە دڵنیای خوای تعالى لە بەندە ڕازی دەبێت کە خواردنێك بخوات و سوپاس و ستایشی لە سەر بکات، یا قومێك بخواتەوە و سپاس و ستایشی لە سەر بکات)).

[166] _ أخرجه المؤلف في ((الأطعمة)) برقم ١٨١٧ وأحمد ومسلم والنسائي.

## ٢٩ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە پەرداخەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ١٦٧ _ عن ثابت قال:((أخرج إلينا أنس بن مالك قَـدَحَ خشبٍ غليظاً مُـضَـبَّـباً (٢٠٢) بحديد، فقال: يا ثابت! هذا قَـدَح رسول الله صلى الله عليه وسلم)).

١٦٧_ لە ثابیتەوە فەرموویەتی: ((ئەنەسی كوڕی مالیك پەرداخێكی دارینی ئەستوری قایمكراو بە ئاسنێكی پانی بۆ دەرهێناین و فەرمووی: ئەی ثابت ئەمە پەرداخی پێغەمبەری خوایە ﷺ))؛

صحيح ١٦٨_ عن أنس قال: ((لقد سَـقَـيْـت رسولَ الله صلى الله عليه وسلم بهذا الـقَـدَح الشرابَ كله: الماء والـنـبيذ،(٢٠٣) والعسلَ واللبَـن)).

---

[١٦٧] _ أخرجه البخاري في ((كتاب الأشربة)) عن عاصم الأحول قال: رأيت قدح النبي صلى الله عليه وسلم عند أنس بن مالك، وكان قد تصدع، فسلسله بفضة. قال: وهو قدح جيد عريض من نضار، والنضار، خشب معروف. واتە ئیمامی بوخاری ئەم فەرموودەیە لە عاصمی ئەحوەلەوە دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: پەرداخەكەی پێغەمبەری خوام صلى الله عليه و سلم بەلای ئەنەسی كوڕی مالكەوە بینی، درزی تێكەوتبوو، بە زیو قایمی كردبوو، فەرمووی: پەرداخێكی باشی فراوان بوو لە داری (نضار) دروستكرا بوو. (نضار)یش دارێكی ناسراوە، واتە دارگەز.

(٢٠٢) _ واتە قایمكراو بە (ضباب)ێك لە ئاسن. (ضباب)یش كۆی (ضبة)یە كە بریتیە لە ئاسنێكی پان و داری تێدا كۆ دەكرێتەوە بۆ ڕێگرتن لە بڵاوبونەوەی .

[١٦٨] _ وأخرجه مسلم في ((الأشربة)) برقم ٢٠٠٨.

(قلت: وكذا رواه أبوالشيخ (٢٢٢) وزاد في رواية: ((فلولا أني رأيت أصابعه صلى الله عليه وسلم في هذه الحقة لجعلت عليها الذهب والفضة)) واتە پێشەوا ئەبو شێخ لە (ڕیوایە) تێكدا فەرموودەكە بەم زیادەوە دەگێڕێتەوە: ((ئەگەر پەنجەكانی پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم لە نێو ئەم ئەڵقەیەدا نەبینیایە ئەوا بە زیوو ئاڵتون دامدەپۆشی)). وإسناده صحيح. وأخرجه الحاكم (١٠٥/٤) نحو لفظ المؤلف، وصححه على شرط مسلم، ووافقه الذهبي).

(٢٠٣) _ النبيذ: ئاوێكە خورمای تێدەكرێت بۆ ئەوەی شیرین بێت. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم سەرەتای شەو خورمای بۆ دەكرایە نێو ئاوو بەیانی لێی دەخواردەوە.

١٦٨ _ لە ئەنەسەوە فەرموویەتی: ((دڵنیابن بەم پەرداخە هەموو خواردنەوەکانم داوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ: ئاو و ئاوی شرینکراو بە خورما (النبیـذ)و هەنگوێنو دۆ)).

## ٣٠ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە میووەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ١٦٩_ عن عبد الله بن جعفر قال:((كان النبي صلى الله عليه وسلم يأكل القِـثَّـاء بالرُّطَـب)).

١٦٩ _ لە عەبدولاَّی كوڕی جەعفەرە وە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ خەیاری بە خورمای ڕوتابی تازە پێگەیووە دەخوارد)).

صحيح ١٧٠_ عن عائشة قالت:((أن النبي صلى الله عليه وسلم كان يأكل البطِّيخَ بالرُّطَب)).

١٧٠_ لە عائیشەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ كاڵەكی بە خورمای ڕتابی تازە پێگەیووە دەخوارد)).

صحيح ١٧١_ عن أنس بن مالك قال:((رأيت رسول الله صلى الله عليه وسلم يجمع بين الخِـرْبِـزِ (٢٠٤) والرُّطب)).

---

[١٦٩] _ أخرجه المؤلف في ((الأطعمة)) برقم ١٨٤٥ والبخاري ومسلم وأبوداود كلهم فيه برقم ٣٨٣٥ وابن ماجة.
(قلت: وهو مخرج في ((الصحيحة)) ٥٦٦).
(القثاء): لە خەیار دەچێت بەلاَم لەو گەورەترە واتە تەرۆزی.

[١٧٠] _ وأخرجه المؤلف في ((الأطعمة)) برقم ١٨٤٤ وأبو داود فيه برقم ٣٨٣٦ والنسائي مختصرا. (قلت: ورواه جمع آخر، إسناده بعضهم صحيح الشيخين وحسنه المؤلف وهو مخرج في المصدر السابق ٥٧).

[١٧١] _ أخرجه أحمد والنسائي ((الجامع الصغير)).
(قلت: وإسناده صحيح كما بينته في المصدر المذكور ٥٨).

(٢٠٤) _ الخِرْبِز بكسر الخاء: واتە كاڵـەك، ووشـەكەش لـە فارسیەوە وەرگێڕاوەتـە سـەر زمانی عەرەبی، ( مەستیش كاڵەكی زەردە، چونكە ساردیەكی تێدایەو خورمای ڕتاب یەكسانی دەكاتەوە ).

١٧١_ لە ئەنەسی كوڕی مالكەوە فەرموویەتی: ((بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ كاڵەكی زەردو خورمای ڕتابی تازە پێگەیووی بەیەكەوە دەخوارد)).

صحيح ١٧٢_ عن أبي هريرة قال: ((كان الناسُ إذا رأوا أولَ الثمر جاؤوا به رسولَ الله صلى الله عليه وسلم. فإذا أخذه رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: ((اللهم بارك لنا في ثمارنا، وبارك لنا في مدينتنا، وبارك لنا في صاعنا وفي مُدّنا، اللهم إنّ إبراهيم عبدك وخليلُك و نبيّك، وإني عبدك و نبيُّك، وإنه دعاك لمكةَ (٢٠٥)، وإني أدعوك للمدينة بمثل ما دعاك به لمكة، ومثله معه)).قال: ثم يدعو أصغرَ وَليدٍ (٢٠٦) يراه، فيعطيه ذلك الثمر))

١٧٢ _ لە ئەبی هوریرەوە فەرموویەتی: ((هەر كاتێك خەڵكی نۆبەرەی بەروبومیان پێگەیشتایە دەیانهێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ. ئەویش كە لێی وەردەگرتن دەیفەرموو: ((خوایە گیان بەرەكەت بخەرە نێو بەرەكانمانەوەو، بەرەكەت بخەرە نێو شارەكەمانەوەو، بەرەكەت بخەرە نێو كێش و شاینمانەوە، خوایە گیان ئیبراهیم بەندەو دۆستو پێغەمبەری تۆیەو، منیش بەندەو پێغەمبەری تۆم، ئیبراهیم بانگەوازی بۆ كردی بۆ مەكەو، منیش بانكەوازت بۆ دەكەم بۆ مەدینە

---

[١٧٢] _ أخرجه المؤلف في ((الدعوات)) برقم ١٤٥١ ومسلم في ((الحج)) برقم ١٣٧٣ وابن ماجة في ((الأطعمة)) برقم ٣٩٢٩.

پەسەندیكردنی منداڵیش بە پێدانی نۆبەرەی بەروبوم دەگەڕێتەوە بۆ زۆر شادومانی بونیان بەو بەخشینە، یا بۆ ئەوەی بۆنەیەكی گونجاو بێت لە نێوان نۆبەرەو منداڵە بچوكەكاندا لەبەر نزیكی هەردوكیان لە بوون و بەدیهێنانەوە. والله أعلم.

(٢٠٥) _ قال تعالى في سورة إبراهيم / ٣٧: (ربنا إني أسكنت من ذريتي بواد غير ذي زرع عند بيتك المحرم، ربنا ليقيموا الصلاة فاجعل أفئدة من الناس تهوي إليهم وارزقهم من الثمرات لعلهم يشكرون). وا تە (پەروەردگارا بەڕاستی من هەندێ لە وەچە و خێزانم لە دۆڵێكی وشكی بێ كشت وكاڵدا جێنشین كردوە لە پاڵ ماڵە پیرۆزەكەتدا، ، پەروەردگارا، بۆیە لێرە جێنشینم كردون تا بە چاكی نوێژو خواپەرستی ئەنجام بدەن، جا داواكارم دڵی هەندێك لەو خەڵكە كەمەندكێش بكەیت و لە رزق و جۆراوجۆر بەهرەمەندیان بكەیت، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بكەن). تەفسیری ئاسان. برهان محمدأمین.

(٢٠٦) _ الوليد: وا تە منداڵێكی بچوك.

وەكو چۆن بانگەوازی بۆ كردی بۆ مەكەو، دوو ئەوەندەش)). ئەبو هوریرە فەرمووی: پاشان كە بچوكترین منداڵی دەبینی بانگی دەكردو ئەو بەروبومەی دەدایە)).

ضعيف ١٧٣ _ عن الرُّبَيِّعِ بنت مُعَوِّذ بن عَفراء قالت: ((بعثني معاذ بن عَفراء بقناعٍ من رُطَب، وعليه أجْرٍ (٢٠٧) من قثاء زُغْبٍ، (٢٠٨) وكان يحب القثاء، فأتيته به وعنده حِلية(٢٠٩) قد قَدِمتْ عليه من (البحرين) (٢١٠) فملأ يده منها فأعطانيه)).

١٧٣_ لە روبەیعی كچی موعەویذی كوڕی عەفرائەوە فەرموویەتی: ((بە سینیەك خورمای ڕتابی تازە پێگەیوو كە ژمارەیەك خەیاری بچوكی تووكنی بە سەرەوە بوو لە لایەن موعاذی كوڕی عەفرائەوە نێردرام بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و، زۆر حەزی بە خەیار بوو، بۆم بردو خشڵێكی زۆری لابوو لە (بەحرینەوە) بۆی هاتبوو دەستی پڕ كردو پێیدام)).

ضعيف ١٧٤_ ومن طريق أخرى عنها قالت: ((أتيت النبيَّ صلى الله عليه وسلم بقناع من رُطَبٍ وأجْرٍ زغبٍ، فأعطاني ملءَ كفه حُلِيًّا، أو قالت: ذهباً)).

---

[١٧٣] _ أخرجه الطبراني / الجامع الصغير/ القسم المتعلق بالقثاء.

(قلت: إسناده ضعيف، فيه علل بينتها في ((الضعيفة)) ٥٤١١).

(٢٠٧) _ القناع: سینیەكە خواردنی لە سەر دەخورێت، (أجْر) بفتح الهمزة وسكون الجيم: واتە بە سەر سینیەكەوە (أجر) هەبوو كە كۆكراوەی (جرو)ە كە بچوكی هەموو شتێكە ئاژەڵ بێت یا هیتر .

(٢٠٨) _ زُغْب بضم الزاي وسكون الغين جمع (أزغب) بفتحتين: بریتیە لە توكی بچوك لە سەرەتای دەرچونیداو ئەوەش كە بەسەر خەیاری بچوكەوەیە دەچوێنرێت بە تووكی بچوك لە سەرەتای دەرچوونیدا.

(٢٠٩)_ حِليە بالكسر: ناوێكە بۆ ئەو شتانەی كە ژنان خۆیانی پێدەرازێننەوە وەكو ملوانكە یا شتیتر .

(٢١٠) _ واتە لە باج و دەستكەوتی بەحرەینەوە بۆی هاتبوو.

[١٧٤] _ أنظر تخريج الحديث السابق.

(قلت: إسناد هذا غير السابق وهو خير منه على ضعفه).

١٧٤ _ لە ڕێگەیەكی ترەوەو لە هەمان هاوەڵەوە فەرموویەتی: ((بە سینیەك خورمای ڕتاب و ژمارەیەك خەیاری بچوكی تووكنەوە چوومە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش پڕ بەدەستی خشـڵی پێدام، یا فەرمووی: زێڕ)).

## ٣١ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە سیفەتی خواردنەوەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

١٧٥ _ عن عائشة رضي الله عنها قالت: صحيح ((كان أحبَّ الشرابِ إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم الحُلْوُ البارد)).

١٧٥ _ لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: ((خۆشترین خواردنەوە بە لای پێغەمبەری خواوە ﷺ شرینی سارد بوو)).

١٧٦_ عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: حسن: دخلت مع رسولِ الله صلى الله عليه وسلم أنا وخالد بنْ الوليد على مَيمونةَ فجاءتنا بإناءٍ من لَبَنٍ،

---

[١٧٥] _ وأخرجه المؤلف في ((الأشربة)) برقم ١٨٩٧ وهو مما تفرد به.

(قلت: وأعله بالإرسال، لكن وجدت له شاهداً من حديث ابن عباس خرجته مع حديث الباب في ((الصحيحة)) ٣٠٠٦).

[١٧٦] _ أخرجه ابن ماجة في ((الأ شربة)) برقم ٣٤٢٦ مختصراً.

(قلت: والمؤلف أيضاً (٣٤٥١) بإسناد هنا ومتنه، وقال: ((حديث حسن)) أي لغيره، وهو كما قال أو أعلى، فإن له طريقا أخرى عند ابن ماجة مفرقاً في موضعين، أشار في الأصل إلى أحدهما، وفاته الآخر (٣٣٢٢) وهو مخرج في ((الصحيحة)) ٢٣٢٠). وفي الباب عن أنس ((أتى النبي صلى الله عليه وسلم بقدح لبن قد شيب بماء فشرب، وعن يساره أبو بكر وعن يمينه أعرابي، فأعطى الأعرابي فضله وقال: الأيمن فالأيمن)). واتە ئەنەس فەرموویەتی: ((جامێك ماستاویان بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هێناو لێی خواردەوەو، ئەبو بەكر بە لای ڕاستیەوە دانشتبوو دەشتەیەكیش بە لای چەپیەوە **دانیشتبوو**،

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم پاشماوەی خواردنەوەكەی دایە دەشتەكیەكە و فەرمووی: ((ڕاست بە ڕاست)). أخرجه الستة إلا النسائي. وأبو داود في ((الأشربة)) برقم ٣٧٢٥. والمؤلف برقم ١٨٩٤. ومسلم برقم ٢٠٢٩. وعن سهل بن سعد عند الشيخين بنحوه.

(قلت: وفي رواية لهما: ((أستسقى رسول الله صلى الله عليه وسلم فأتي..)) إلخ.

لێرەشەوە ئاشكرا دەبێت كە دەستپێكردن بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم لە بەر ئەوە نەبوو كە گەورەی خەڵكەكەو سەروەریان بوو _ هەرچەند بە هەق گەورەو سەروەرە _ بەڵكو چونكە خۆی داواكاری خواردنەوەكە بوو، كەواتە هیچ دژكاریەكی نێوان ئەو ڕووداوەو لە نێوان

فشرب رسول الله صلى الله عليه وسلم وأنا على يمينه، وخالد عن شماله، فقال لي: ((الشَّربة لك، فإن شئتَ آثرتَ بها خالداً)). فقلت: ما كنت لأوثر على سؤرك (٢١١) أحداً، ثم قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((من أطعمه الله طعاماً فليقل: (اللهم بارك لنا فيه وأطعمنا خيراً منه)، ومن سقاه الله عزوجل لبناً فليقل: (اللهم بارك لنا فيه وزدنا منه))). ثم قال: قال رسول الله ﷺ:((ليس شيء يُجزيء مكانَ الطعام والشراب غير اللبن)).

١٧٦ _ لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێت فەرموویەتی: ((من و خالیدی کوڕی وەلید بە یاوەری پێغەمبەری خوا ﷺ چووینە دیدەنی مەیموونە و قاپێك ماستاوی بۆ هێنایـن، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی خواردەوەو من بە لای ڕاستیەوە دانیشتبووم، خالیدیش بە لای چەپیەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ((ئێستا خواردنەوەکە هیتۆیە، ئەگەر ئارەزووت لێبێت پەسەندێتی (إیثار) خالدی پێدەکەیت)). ئەوجا گوتم: پەسەندێتی هیچ کەس بە پاشماوەی خواردنەوەکەی تۆ ناکەم، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەرکەس خوای تعالی خۆراکێکی پێدا با بڵێت: (پەروەردگارا" فرو بەرەکەت برژە بە سەرماندا لەمەو لەم خواردنەش چاکترمان بدەرێ)، وە هەرکەس خوای گەورە شیری خۆراکدا با بلێت: (پەروەردگارا " فرو بەرەکەت برژە بە سەرماندا لەمەو لەمەشمان بۆ زیاد بکە).

---

فەرمایشتی: ((ڕاست بە ڕاست))یدا بەدی ناکرێت و، تایبەتمەندیش لەمەدا نییەو، بەڵکو هەمووان دەگرێتەوە، بەڵکو هەر خۆشی جەختی لە سەر دەکاتەوە و کاتێکیش ئەوەی فەرمووە پاش ئەوەی خۆی بوو بە ئاودێرو ئەوجا بە دەشتەکیەکەی داو ئەوەشی فەرموو بۆ خستنەڕووی حوکمە شەرعیەکەی کەوا ئاودێر پێویستە بە کەسانی لای ڕاستیەوە دەست پێ بکات بە ڕەهایی (مطلق)، ئەگەر گەورەی خەڵکەکە بێت یا کەسانی تر، ئەنەس لە (ڕیوایە)تێکدا بە گوتنی؛ ئەوە سوونەتە، ئەوە سوونەتە، ئەوە سوونەتە، جەختی ئەوەی سەرەوە دەکاتەوە).

(٢١١) _ سۆرك: مەبەست ئەوەی لە جامەکەدا مایەوە دوای خواردنەوەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم.

پاشان ئیبنو عەباس دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەدەر لە شیر هیچ شتێك جێگەی خواردن و خواردنەوە ناگرێتەوە)).

## ٣٢ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە چۆنیەتی خواردنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

حسن ١٧٧_ عن عَمرو بن شُعيب عن أبيه عن جده (٢١٢) قال:((رأيت رسول الله صلى الله عليه وسلم يشرب قائماً وقاعداً)).

١٧٧ _ عەمری كوڕی شوعەیب لە باببەوە لە باپیرەیەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ((بینیومە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕا وەستاوی و بە دانیشتنەوە شلەمەنی دەخواتەوە)).

صحيح ١٧٨_ عنْ ابن عباس رضى الله عنهما قال: ((سقيت النبي صلى الله عليه وسلم من زمزم، فشرب وهو قائم)).

---

[١٧٧] _ أخرجه المؤلف في ((الأشربة)) برقم ١٨٨٤.

(قلت: وقال: ((حسن صحيح))، وله شواهد كثيرة يأتي في الباب بعضها، وقد صح في أكثر من حديث نهيه بل زجره صلى الله عليه وسلم عن الشرب قائماً. بل صح أنه أمر من شرب قائماً بالأستقاء. فأختلف العلماء في الجمع، فذهب الطحاوي في ((المشكل)) (٣/١٨و٢١) الى أن النهي للتحريم، وحمله النووي على التنزيه، والقلب الى الأول أميل كما كنت شرحته في ((الصحيحة)) (٧٥_٧٧) فراجعه فإنه مهم). وا تە بە (صحیح)ی لە زۆر فەرموودەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم قەدەغە بەڵكو ڕێگری خواردنەوەی شلەمەنی بووە بە ڕاوەستانەوە . بەڵكو بە (صحیح)ی لە فەرموودەی دیكەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم فرمانی ڕشانەوەی داوە بەو كەسانەی بەڕاوەستانەوە شلەمەنی دەخۆنەوە، لێرەوە زانایان جیاواز بوون سەبارەت بە چۆنیەتی كۆكردنەوەی نێوان ئەو فەرموودانە، ئیمامی (الطحاوي) لە كتێبی (المشكل)دا (٣/١٨و٢١) فەرموویەتی ئەو قەدەغەكردنە بۆ حەرام كردنە، كەچی ئیمامی (نووی) فەرموویەتی بۆ (تنزیه)ە، دڵیش هەواداری یەكەمە وەكو ئەوەی لە ((الصحیحة))دا (١٧٥_١٧٧) باسم كردوە، بیخوێنەرەوە چونكە گرنگە.

(٢١٢) _ عەمری كوڕی شوعەیبی كوڕی محمدی كوڕی عەبدوڵای كوڕی عەمری كوڕی عاصە، مەبەستیش بە باپیرەی واتە باپیرەی بابی كە عەبدوڵای كوڕی عەمری كوڕی عاصە، هاوەڵێكی بەڕێزی ناسراوە، (ریوایە )تەكەی ئیمامی ئەبو داودیش پشتگیری دەكات.

١٧٨_ لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێـبێـت فەرموویەتی: ((لە زەمزەم ئاوم دایە پێغەمبەری خوا ﷺو، بە ڕاوەستانەوە لێی خواردەوە)).

صحيح ١٧٩_ عن النـَّزَّال(٢١٣) بن سَـبْـرَةَ قال: ((أتي عليٌّ رضي الله عنه بكوزٍ من ماء وهو في الرَّحبة،(٢١٤) فأخذ منه كفًا فغسل يديه ومضمض واستـنـشـق، ومسح وجهه و ذراعيه ورأسَـه، ثم شـرب منه وهو قائم، ثم قال: هذا وضوء من لم يُـحدِث،(٢١٥) هكذا رأيت رسول الله صلى الله عليه وسلم فعل)).

١٧٩_ لە نـەززالی کوڕی سەبرەوە فەرموویەتی: ((عەلی ڕەزای خوای لێ بێت لە (ڕەحبەدا) بوو گۆزەیەك ئاوی بۆ هێنرا، پڕ دەستی ئاوی لێبرد و هەردوو دەستی شت و ئاوی لە دەمی ڕادا و ئاویشی بە لووتیدا وەردا و، دەم و چاوو هەردوو قۆڵی و شەری سڕی (مسح) پاشان بە ڕاوەستانەوە لێی خواردەوە، پاشانیش فەرمووی: ئەمە دەستنوێژی ئەو کەسەیە لەش گران نەبێت، بەم چەشنە بینیومە پێغەمبەری خوا ﷺ کرداری دەکرد)).

---

[١٧٨] _ أخرجه المؤلف في ((الأشربة)) برقم ١٨٨٣ والبخاري في ((الحج)) و((الأشربة)) ومسلم برقم ٢٠٢٧ والنسائي في ((الحج)). وابن ماجة في ((الأشربة)).

[١٧٩] _ وأخرجه أبو داود في ((الأشربة)) برقم ٣٧١٨ والبخاري وأحمد.

(قلـت: في ((المسـند)) (١/ ١٢٣و١٣٩و١٤٤)والبخـاري في ((الأشـربة)). وعـزوه لأبـي داود دون النسائي فيه تساهل كبير، لأن الأول لم يـروه بهذا التمام بخلاف النـسائي فـإنه أخرجـه في ((الطهارة)) بتمامه. ورواه ابن حبان أيضاً (١٥٢) والطيالسي (١٦٤) والبيهقي (١/ ٧٥) وله فيـه طرق أخرى كالمسند ١/ ١٠١و١٠٢و١١٦و١٢٠).

(٢١٣) _ النـَّزَّال " بتشديد النون المفتوحة وتشديد الزاي: هیلالی کوفیە، گوتراوە هاوەڵـێـتی پێغەمبەری خوای صلى الله عليه و سلم هەبووە، کۆمەڵی زانایان فەرموودەیان بـۆ (تخریج)کـردوە جگە لە ئیمامی موسلیم.

(٢١٤) _ الرَّحبة: یا شوێـنێکە لە کوفە، یا حەوشەی مزگەوتە، یا شو ێـنێـکی فراوانە.

(٢١٥) _ ئەم دەستنوێژە دەستنوێژی زمانەوانیە (الوضوء اللغوي) مەبەستیش بـەو دەسـتنوێژە خۆپاکردنەوەیە .

صحيح ١٨٠ _ عن أنس بن مالك رضي الله عنه: (وفي طريق أخرى /٢١٤: كان أنس يتنفس في الإناء ثلاثا وزعم أنس): ((أن النبي صلى الله عليه وسلم كان يتنفس في الإناء ثلاثاً إذا شرب، ويقول: هو أمـرأ وأروى)).

١٨٠_ ئەنەسی كوڕی مالـك ڕەزای خوای لیٰ بێت: (لە ڕێگەیەكی تریشەوە / ٢١٤: ئەنەس سیٰ جار لە جامەكەدا هەناسەی دەداو ئەنەس واشی ڕادەگەیاند): ((كە پێغەمبەری خوا ﷺ سیٰ جار لە جامەكەدا هەناسەی دەدا هەركات شلەمەنی بخواردایەوەو، دەیفەرموو: ئاوەها بە ئاسانی قووت دەچیٰ و تێنو شكێنتریشە)).

ضعيف ١٨١_ عن ابن عباس رضي الله عنهما: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم كان إذا شرب تنفس مرتين)).

١٨١_ لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لیـبیـت فەرموویەتی: ((هەركات پێغەمبەری خوا ﷺ شلەمەنی بخواردایەوە دوو جار هەناسەی دەدا)).

صحيح ١٨٢_ عن كبشة(٢١٦) قالت: ((دخل عليَّ النبي صلى الله عليه وسلم فشرب من فِي قِربةٍ(٢١٧) معلقة قائماً، فقمت إلى فيها فقطعتُه)).

---

[180] _ أخرجه المؤلف في ((الأشربة)) برقم ١٨٨٥ ومسلم برقم ٢٠٢٨، وأبوداود برقم ٣٧٢٧ والنسائي. (قلت: في ((الكبرى)) له، وقال المؤلف: ((حسن غريب)) وهو مخرج في ((الصحيحة)) ٣٨٧). ومعنى: (أمرأ): واتە بە ئاسانی قووت دەچیٰ.

[181] _ أخرجه المؤلف في ((الأشربة)) برقم ١٨٨٧ وابن ماجة برقم ٣٤١٧.

(قلت: وإسناده ضعيف، وبيانه في ((الضعيفة)) ٤٢٠٤).

[182] _ وأخرجه المؤلف في ((الأشربة)) برقم ١٨٩٣ وابن ماجة فيه برقم ١٤٢٣ وزاد ((تبتغي بركة موضع فم الرسول صلى الله عليه وسلم)). واتە ئیمامی ئیبنو ماجە فەرموودەكە بەم زیادەوە دەگێڕێتەوە ((خوازیاری بەدەستهێنانی فەڕو بەرەكەتی جیٰ زاری پێغەمبەری خوا بوو صلى الله عليه و سلم)). (قلت: وقال المؤلف: ((حسن صحيح))، وإسناده صحيح على شرط مسلم وصححه ابن حبان ١٣٧٢).

(٢١٦) _ كەبشەی كچی پابتی ئەنصاریە و خوشكی حەسانە، هاوەڵێتی هەبووە.

(٢١٧) _ واتە لە دەمی (قربة)یەك، (قربة)ەش بریتیە لە پێستەیەكی خۆشەكراو ئاوی تیدەكرێت (كو نە).

١٨٢_ لە كەبشەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ دیدەنی كردم و بە ڕاوەستانەوە لە دەمی كونەیەكی هەلواسراو ئاوی خواردەوە و، منیش هەستام بۆ دەمی كونەكە و بڕاندم)).

صحيح١_ عن أنس بن مالك: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم دخل على أم سُلَيم (٢١٨) وقِربةٌ معلقة، فشرب من فم القربة وهو قائم، فقامت أم سليم إلى رأس القربة فقطعتها)). (٢١٩)

١٨٣_ لە ئەنەسی كوڕی مالـكەوە: ((پێغەمبەری خوا ﷺ چووە دیدەنی ئومو سولەیم و كونەیەك هەڵواسرابوو، بە ڕاوەستانەوە لە دەمی كونەكە ئاوی خواردەوەو، ئومو سولەیمیش هەستاو سەری كونەكەی بڕاند)).

صحيح ١٨٤_ عن عائشة بنت سعد بن أبي وقاص عن أبيها: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم كان يشرب قائماً)).

١٨٤_ عائیشەی كچی سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص لە بابیەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕاوەستانەوە شلەمەنی دەخواردوە)).

---

[١٨٣] _ أخرجه أحمد، وأشار إليه المؤلف بعد حديث ١٨٩٢.
(قلت: هو في ((المسند)) (٣/١١٩و٦/٣٧٦و٤٣١) وكذا الدارمي (٢/١٢٠) وابن الجارود في ((المنتقى)) (٨٦٨)، وفيه البراء بن يزيد بن بنت أنس وهو مجهول، لكن تابعه حُميد عند أبي الشيخ (٢٢٦) فهو به حسن. وله طريق أخرى مختصراً. ثم وجدت له شاهداً من حديث عائشة فهو به صحيح، أخرجه أحمد ٦/١٦١).
(٢١٨) _ أم سُليم: دایكی ئەنەسی كوڕی مالكە.
(٢١٩) _ في نسخة: (فقطعته).
[١٨٤] _ أشار إليه المؤلف في ((الأشربة)) بعد حديث ١٨٨٣ والشوكاني في ((نيل الأوطار)) ٨/١٩٥.
(قلت: إسناده ضعيف، لكن يشهد له ما قبله، وأخرجه الطحاوي في ((شرح المعاني)) (٤/٢٧٣_ مصر) وأبو الشيخ (٢٢٦) والبزار والطبراني كما في ((المجمع)) ٥/٨٠).

## ٣٢_ بەشی ئەوەی سەبارەت بە خۆ بۆنخۆشكردنی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ١٨٥_ عن موسى بن أنس بن مالك عن أبيه قال: ((كان لرسول الله صلى الله عليه وسلم سُكَّةٌ(٢٢٠) يَتَطَيَّب منها)).

١٨٥_ موسای كوڕی ئەنەسی كوڕی مالك لە بابیەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت:((پێغەمبەری خوا ﷺ (سوككە) یەكی هەبوو خۆی پێ بۆنخۆش دەكرد)).

صحيح١٨٦ _ عن ثُمامة بن عبد الله قال: كان أنس بن مالك لا يرد الطيبَ، وقال أنس: ((إن النبي صلى الله عليه وسلم كان لا يرد الطيبَ)).

١٨٦_ لە پومامەی كوڕی عەبدوڵاوە فەرموویەتی: ئەنەسی كوڕی مالك بۆنی ڕەتنەدەكردەوەو، ئەنەس دەیفەرموو: ((پێغەمبەری خوا ﷺ بۆنی ڕەت نەدەكردەوە)).

---

١٨٥ _ أخرجه أبوداود في ((كتاب الترجل / باب أستحباب الطيب)) ٤١٦٢.

(قلت: وإسناده صحيح على شرط مسلم، وأخرجه ابن سعد (٣٩٩/١) وأبو الشيخ ٩٨).

(٢٢٠) _ سُكَّة " بضم السين وتشديد الكاف: جۆرە بۆنێكی ڕەشە تێكەڵ دەكرێت و دەشێلرێت و بە جێ دەهێلرێت هەرچەند كاتی بە سەرداتێپەڕ بێت بۆنەكەی دەردەكەوێت، لەوانەشە (سُكَّة) قاپێك بێت بۆنی تێبكرێت، وەكو ئاشكەراشە خۆ بۆنخۆشكردنی موسڵمانی ڕۆژەكانی هەینیو، هەردوو جەژنو، كاتی ئیحرام بەستنو، نوێژەكانی جەماعەتو، كۆڕەكانو، خوێندنی قورئانو، فێربونی زانستو یادكردنەوە (ذكر)و زیاتر جەختی لەسەر كراوەتەوە .

١٨٦ _ أخرجه أحمد والبخاري والنسائي والمؤلف في ((الأدب)) برقم ٢٧٩١.

(قلت: وقال: ((حديث حسن صحيح)) وهو في ((المسند)) (١١٨/٣و١٣٢و٢٦١)) وابن سعد أيضاً (١/ ٣٩٩)، ورواه أبو الشيخ (٩٧) من طريق أخرى عن أنس. وهو رواية لأبن سعد وأحمد ٣/ ٢٢٦ و٢٥٠ و٢٦١).

حسن ١٨٧_ عن ابن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((ثلاث لا تُـرَدُّ: الوسائد، والدهن، واللَّـبَـن)).

١٨٧_ لە ئیبنو عومەر دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سێ شت ڕەت ناكرێتەوە: سەرینو، بۆن و، شیر)).

صحيح ١٨٨_ عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((طيب الرجال ما ظهر ريحُـه وخَـفِـي لونه، وطيب النـساء ما ظهر لونُـه وخَـفِيَ ريحُـه)).

١٨٨_ لە ئەبی هورەیرەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((چاكترین بۆنی پیاوان ئەوەیە بۆنی دەركەوێتو ڕەنگی شاراوە بێتو، چاكترین بۆنی ژنانیش ئەوەیە ڕەنـگی دەركەوێتو بۆنی شاراوە بێت)).

ضعيف ١٨٩ _ عن أبي عثمان النَّـهدي (٢٢١) قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((إذا أعطي أحدكم الريحان فلا يَـردَّه، فإنه خرج من الجَـنَّـةِ)).

---

١٨٧ _ أخرجه المؤلف في ((الأدب)) برقم ٢٧٩١ وهو مماتـفرد به.
(قـلـت: استغربه، وإسناده حسن، ومن أعله فلم يصنع شيـئاً، كما حققـته في ((الصـحيحة)) (٦١٩)٠ والمراد بـ(الدهن): (الطيب). ماناكەشی ئەوەیە كە ڕێزلێنـانی میوان بـەم سێ شـتانە دیاریەكی سادەیەو نابێت ڕەت بكرێتەوە.

١٨٨ _ أخرجه المؤلف في ((الأدب)) برقم ٢٧٨٨.
(قـلـت: وكـذا أبـوداود (٢١٧٤) والنسـائي في ((الزينـة)) وأحمـد (٢/٥٤٠و٥٤١) وقـال المؤلـف: ((حديث حسن)). يعني لغيره فـإن تابعيه لم يسم، لكن له شواهد منها عن عمران بن حصين عند أحمد (٤/٤٤٢) وأبي داود(٤٠٤٨) والمؤلف (٢٧٨٩) وقال: ((حديث حسن غريب))).

١٨٩ _ أخرجـه المؤلـف في ((الأدب)) بـرقم ٢٧٩٢. وفي ((الجـامع الصـغير)) أخرجـه أبـو داود في ((مراسيله)). (قـلـت: وهو مع إرساله ضعيف الإسناد، ولذلك قـال المؤلـف: ((غريـب)). وفي بعـض النسخ منه ((حسن)) وهو مردود كما بينـته في ((الضعيفة)) ٧٦٤)٠

(٢٢١) _ النَّـهـدي " بفتح النون المشددة: پیاوێكی یەمەنیەو نـاوی (عەبـدولرحمانی كـوڕی مـل) ە، تاقی نەفامی بینیوە و لە سـەردەمی پێغەمبـەری خـوادا صـلى الله علیـه و سـلم موسـڵمان بـووە

١٨٩_ لە ئەبی عوسمانی نەهدیەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەركات یەكێكتان ڕەیحانەی پێدرا با ڕەتی نەكاتەوە، چونكە لە بەهەشتەوە هاتۆتە دەرێ)).

_ضعيف جداً ١٩٠_ عن جرير بن عبد الله (٢٢٢) قال: ((عُرِضْتُ بين يَـدَيْ عمرَ بن الخطاب رضي الله عنه، فألـقى جرير رداءه ومشى في إزار، فقال له: خذ رداءك. فقال عمر للـقوم: ما رأيتُ رجلاً أحسن صورة من جرير، إلا ما بلغنا من صورة يوسف الصديق عليه السلام)).

١٩٠_ لە جەریری كوڕی عەبدوڵاوە فەرموویەتی: ((نمایشێكم پێكرا لە بەردەمی عومەری كوڕی خەتابدا ڕەزای خوای لێبێت، جەریر عەباكەی (رداء) فڕێداو بە (إزار)ەكەیەوە ڕێیدەكرد، عومەر ڕەزای خوای لێبێت پێی فەرموو: عەباكەت بەرە. پاشان عومەر ڕەزای خوای لێبێت بە خەڵكەكەی فەرموو: هیچ پیاوێكم نەبینیوە شێوەی لە جەریر جوانتر بێت، بەدەر لەوەی پێمان گەشتووە سەبارەت بە شێوەی یوسف پێغەمبەر ﷺ)).

---

بەڵام بە دیداری نەگەشتووە، پیاوێكی باوەڕپێكراوی جێگیرە و(ثقة ثبت) ساڵی نەوەدو پێنجی كۆچی لە تەمەنی سەدو سی ساڵیدا مردووە.

(الريحان): هەموو ڕووەكێكی بۆن خۆشە، لەوانەش ڕەیحانەو بەیبونە.

[190] _ (قلت: إسناده ضعيف جداً، رجاله ثقات غير شيخ الترمذي عمر بن إسماعيل بن مجالد، وهو متهم كما في ((كاشف الذهبي)). وقال الحافظ: ((متروك)). ومع ذلك فإنه جزم في ترجمة (جرير) من ((الإصابة)) بأن عمر رضي الله عنه قال فيه: ((هو يوسف هذه الأمة)) فلا أدري أذلك لأنه وقف له على طريق أخرى، أم هو التساهل كما هو الغالب من عادتهم في المناقب والفضائل ؟ ثم إن الحديث موقوف، ولاصلة له بالباب كما هو ظاهر).

(٢٢٢) _ جرير بن عبدالله: ئەو هاوەڵە بە ناوبانگە سەرداری هۆزی (بوجەیلە) بووە، پیاوێكی زۆر درێژ بوو، لە كوفە نیشتەجێ بوو و ساڵی ٥١ كۆچی مردووە.

## ٣٤ _ بەشی ئاخاوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بووە؟

صحيح ١٩١_ عن عائشة رضي الله عنها قالت: ((ما كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يَسْرد كَسَرْدِ كم هذا، ولكنه كان يتكلم بكلام بَيِّن، فَصْل، يَحفظه من جَلَسَ إليه)).

١٩١_ لە خاتوو عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێت فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمایشتەکانی نەدەگێڕایەوە هاوشێوەی گێڕانەوەکەی ئێوە: بەڵکو فەرمایشتەکانی فەرمایشتگەلێکی ڕوونی تۆکمەی کۆتایی پێهێنەر بوو، ئەوانەی لە خزمەتیدا بوون لەبەریان دەکرد)).

صحيح ١٩٢ _ عن أنس بن مالك قال: ((كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يعيد الكلمةَ ثلاثاً، لِتُعقل عنه)).

١٩٢_ لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار وشەی دووبارە دەکردەوە، تا لە سەر شێوازی ڕاستەقینەی خۆی لێی تێبگەن)).

---

[١٩١] _ أخرجه المؤلف في ((المناقب)) برقم ٣٦٤٣ والبخاري ومسلم وأبوداود في ((كتاب العلم / باب في سرد الحديث)) ٣٦٥٥ بمعناه.

(قلت: ليس عندهم منه إلا جملة السرد، والمؤلف بإسناده هنا ومتنه وقال: ((حديث حسن صحيح)) وإسناده حسن، وهو رواية لأحمد (٦/ ٢٥٧ و١١٨و١٣٨و١٥٧) وابن سعد (١/ ٣٥٧) وأبي الشيخ ٩٢).

[١٩٢] _ وأخرجه المؤلف في ((المناقب)) برقم ٣٦٤٤ و((الأستئذان)) برقم ٢٧٢٤ والبخاري في ((العلم)) و ((الأستئذان)). قلت: وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح)) وهو في ((البخاري)) (رقم _٦٥_ مختصره) بلفظ: ((حتى تفهم عنه)). واستدركه الحاكم (٤/ ٢٧٣) بلفظ الكتاب وقال ((صحيح على شرط الشيخين)). فتعقبه الذهبي بقوله: ((أخرجه البخاري سوى قوله: لتعقل عنه)). قلت: المعنى واحد، فلا وجه لهذا الأستثناء والتعقب. فتأمل. وللحديث شاهد من حديث أبي أمامة، أخرجه الطبراني (٨٠٩٥).

## ٣٥_ بەشی ئەوەی سەبارەت بە پێكەنینی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

ضعيف ١٩٣_ عن جابر بن سمرة رضي الله عنه قال: ((كان في ساقِ (٢٢٣) رسول الله صلى الله عليه وسلم حُـموشةٌ، (٢٢٤) وكان لا يضحك إلا تبسماً، فكنت إذا نظرت إليه قـلـت: أكحل العينين، وليس بأكحل)).(٢٢٥)

١٩٣_ لە جابری كوڕی سەمورەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: ((تەنكایی یەك لە لاقی پێغەمبەری خوادا ﷺ هەبوو، بەدەر لە زەردەخەنەش پێنەدەكەنی، ئەگەر تەماشام بكردایە دەمگوت: چاوەكانی ڕەشن و ڕەشیش نەبوون)).

صحيح ١٩٤ _ عن عبدالله بن الحارث بن جَـزْءٍ رضي الله عنه قال: ((ما رأيت أحداً أكثرَ تبسماً من رسول الله صلى الله عليه وسلم)).

---

[١٩٣] _ أخرجه المؤلف في ((المناقب)) برقم ٣٦٤٨.

(قـلـت: وقال: ((حديث حسن صحيح غريب))! وأخرجه الحاكم (٢/٦٠٦) من طريق شيخ المؤلـف أحمد بن منيع بإسناده ومتـنه، وقال: ((صحيح الإسناد)). فرده الذهبي بقوله: ((قـلـت: حجاج (يعني ابن أرطأة) لـين الحـديث)). قـلـت: لأنـه مـدلس وقـد عنعنـه. ومـن طريقـه أخرجـه أحمد (٥/١٠٥) وابنـه عبـد الله (٥/٩٧) والطبرانـي في ((المعجـم الكـبير)) (٢٠٢٤) والبغـوي في ((شـرح السنة)) ٣٦٤٢).

(٢٢٣) _ في نسخة ساقيّ.

(٢٢٤) _ خموشة: تەنكیو وردی /وفي المعجم الوسيط/ خَـمِـش الرجل: كان دقيق الساقين. واتە لاقەكانی وردو تەنك بوون.

(٢٢٥) _ الـكَـحَـل بفتحتين: ڕەشیەكی سروشتیە لە پێڵوەكانی چاودا.

[١٩٤] _ أخرجه المؤلف في ((المناقب)) برقم ٣٦٤٥. وهو مما تـفرد بـه. (قـلـت: وحسنـه في بعـض النسخ، والأولى أن يقال: حديث صحيح، لأن رجاله ثـقـات كلهم إلا أنه يخشى من سوء حفـظ ابـن لهيعة، لكن قد رواه عبد الله بن المبـارك عنـد أبـي الشـيخ (٩٠)، وروايتـه عنـه صـحيحة كمـا هـو

صحيح ومن طريق أخرى عنه قال: ((ما كان ضَـحِـكُ رسول الله صلى الله عليه وسلم إلا تـبـسماً /٢٢٨)).

١٩٤_ له عەبدوڵلا كوڕی حارثی كوڕی جەزئەوە فەرموویەتی: ((هیچ كەسێكم نەبینیوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر زەردەخەنەدارتر بێت)).

لە ڕێگەیەكی ترەوە هەمان هاوەڵ ؓ فەرموویەتی: ((پێكەنینی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەر لە زەردەخەنە هیچی تر نەبوو)).

صحيح ١٩٥ _ عن أبي ذر رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((إني لأعلم أوَّلَ رجلٍ يدخل الجنةَ، وآخر رجلٍ يَـخرج من النار: يؤتى بالرجل يومَ القيامة فيقال: اعرضوا عليه صغارَ ذنوبه، ويُـخبَأ (٢٢٦) عنه كبارُها. فيقال له: عملتَ يوم، كذا وكذا، وهو مُـقِـرٌّ لا يُـنكر، وهو مشفق من كبارها، فيقال: أعطوه مكانَ كلِّ سيئةٍ حسنةً. فيقول: إن لي ذنوباً لا أراه ههنا!)).

قال أبوذر: ((فلـقد رأيتُ رسولَ الله صلى الله عليه وسلم ضحك حتى بدت نواجذه)).

١٩٥ لە ئەبی ذەڕەوە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بە دڵنیای من ئاگادارم بە یەكەم پیاو دەچێتە بەهەشتەوەو، دوامین پیاویش كە لە ئاگرەوە دەردەچێت: لە ڕۆژی قیامەتدا پیاو دەهێنرێتو دەگوترێت: تاوانە بچوكەكانی پیشاندەن‌و، گەورەكانیشی لێدەشاردرێتەوەو. پێی دەگوترێت: لە ئاوەها ڕۆژدا، ئاوەها و ئاوەهات كرد، ئەویش دانی پێدا دەنێت‌و نكۆڵی لێناكات و، لە گەورەكانی دەترسێت‌و چاوەڕێی بەزەیی پیاهاتنەوەشە، ئینجا

---

معلوم، ورواه حمد أيضاً (٤/١٩٠و١٩١)، لاسيما والطريق الأخرى الآتية صحيحة، وقال المؤلف: ((حديث صحيح غريب))).

[١٩٥] _ أخرجه المؤلف في ((صفة جهنم)) برقم ٢٥٩٩ ومسلم في ((الأيمان)) برقم ١٩٠.

(قلت: وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح)) ورواه أحمد ١٥٧/٥ و ١٧٠).

(٢٢٦) _ كذا الأصل، وكذا في رواية أحمد، وفي أخرى له: ((نَـحّـوا)). وفي ((السنن)) للمؤلف: ((وأخبئوا)) وفي ((مسلم)): ((وأرفعوا))، والمعنى قريب.

دەگوترێت: لە جێی هەر خراپەیەك چاكەیەكی بدەنێ. ئەویش دەڵێت: تاوانگەلێكم هەیە ئا لێرەدا نایبینم!)).

ئەبو ذەڕ فەرمووی: ((بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ پێكەنی تا دانە خرێكانی دەركەوت)).

صحيح ١٩٦_ عن جرير بن عبد الله رضي الله عنه قال: ((ما حَجَبَني رسولُ الله صلى الله عليه وسلم منذُ أسلمت، ولا رآني إلا ضحك)). وفي رواية: ((إلا تَبَسَّمَ ٢٣١/)).

١٩٦_ لە جەریری كوڕی عەبدوڵاوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: ((لەو كاتەوەی موسڵمان بووم پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای چوونە ژوورەوەی لێنەگرتم، نەشیدەبینیم مەگەر (إلا) پێدەكەنی)).

لە ڕیوایەتێكی تریشدا: مەگەر (إلا) زەردەخەنە دەیگرت)).

صحيح ١٩٧_ عن عبدالله بن مسعود رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((إني لأعرف آخرَ أهل النار خروجاً، رجلٌ يخرج منها زَحْفاً، فيقال له: انطلق فادْخلِ الجنة. قال: فيذهب ليدخل الجنةَ فيجدَ الناسَ قد أخذوا المنازلَ، فيرجع فيقول: يا رب قد أخذ الناس المنازل! فيقال له: أتذكر الزمان الذي كنت

---

[١٩٦] _ البخاري في ((الجهاد)) و((المغازي)) و((الدعوات)) وفي ((ذكرجرير)) و((الأدب)) ومسلم في ((الفضائل)) برقم

٢٤٧٥ وأبوداود في ((الجهاد)) والمؤلف في ((المناقب)) برقم ٣٨٢٢ وابن ماجة في ((المقدمة)) برقم ١٥٩. (قلت: بعضهم بالرواية الأولى، وبعضهم بالأخرى، ومدارها على قيس بن أبي حازم عن جرير. رواه عنه بيان بن بشر بالأولى، وإسماعيل بن أبي خالد بالأخرى، وكلاهما ثقة ثبت، ولعل الراجح الأخرى لموافقة بيان له عليها في رواية لأحمد (٤/ ٣٥٨و٣٥٩و٣٦٢و٣٦٥) وقال المؤلف: ((حسن صحيح))).

[١٩٧] _ أخرجه المؤلف في ((كتاب صفة جهنم)) برقم ٢٥٩٨ والبخاري في ((صفة الجنة)) وفي ((التوحيد)) ومسلم في ((الإيمان)) برقم ١٨٦ وابن ماجة في ((الزهد)) برقم ٤٣٣٩.

و(النواجذ): هي الأضراس: واتە دانە خرێكان .

فيه؟ فيقول: نعم. قال: فيقال له: تَـمَـنَّ. قال: فيتمنى. فيقال له: فإن لك الذي تمنيت وعشرة أضعاف الدنيا. قال: فيقول: أتسخر بي وأنت الملك!)).

قـال: ((فلقـد رأيـت رسـول الله صـلى الله عليـه وسـلم ضـحك حتـى بَـدَتْ نَـواجذه)).

١٩٧_ له عەبدوڵای كوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((من بە دڵنیای دوامین دەرچوانی خەڵكی ئاگر دەناسم، پیاوێكە بە كشان (زحف) دەردەچێت، پێی دەگوترێت: ڕاپەڕە بچۆرە بەهەشتەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەچێت بۆ ئەوەی بچێتە بەهەشتەوە دەبینێت خەڵكی مەنزڵگاكانیان گرتووە، دەگەڕێتەوەو دەڵێت: پەروەردگارم خەڵك مەنزڵگاكانیان گرتووە! پێی دەگوترێت: دێتەوە خەیاڵت ئەو زەمەنەی تیایدا بویت؟ دەڵێ: بەڵێ. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پێی دەگوترێت: ئاواتخوازی بكە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئاواتخوازی دەكات. پێی دەگوترێت: ئەوەی ئاواتخوازی بوویت بۆ تۆیە و دە ئەوەندەی دونیاش. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەڵێت: چۆن گاڵتەم پێدەكەیت و تۆ مەلیكیت!)). عەبدوڵای كوڕی مەسعود فەرمووی: ((دیتم پێغەمبەری خوا ﷺ پێكەنی تا دانە خرێكانی دەركەوتن)).

صحيح ١٩٨_ علي بن ربيعة قال: شهدتُ علياً رضي الله عنه أُتـيَ بدابةٍ ليركبها، فلما وضع رِجلَــه في الرِّكاب قال: بسم الله، فلما استوى على ظهرها قال: الحمدُلله، ثم قال: ((سبحانَ الذي سَخَّر لنا هذا وما كنا له مُـقْـرِنين. وإنا إلى ربنا لـَمُـنْـقَـلِـبون)) (٢٢٧). ثم قال: الحمد لله (ثلاثا)، والله أكبر(ثلاثا)، سبحانك إني

---

[١٩٨] _ أبوداود في ((الجهاد))برقم ٢٦٠٢ والمؤلف في((الدعوات)) بـرقم ٣٤٤٣ والنسـائي وأحمـد في ((المسند)). (قـلـت: وصححه المؤلف وابن حبان والحاكم والنووي وغيرهم، وهو كما قالوا على ما بينته في تعليقي على ((الكلم الطيب)) ١٢٢).

(٢٢٧) _ الآية ١٣ من سورة الزخرف. ومعنى (سخر لنا هذا): أي ذلل لنـا هـذا المركـب الصـعب، وجعله منـقـاداً لنا:

ظلمت نفسي، فاغفر لي، فإنه لا يغفر الذنوب إلا أنت)). ثم ضحك. فقلت له: من أي شيء ضحكت يا أمير المؤمنين؟ قال: رأيت رسول الله صلى الله عليه صنع كما صنعت، ثم ضحك، فقلت: من أي شيء ضحكتَ يا رسول الله؟ قال: ((إن ربك ليعجب من عبدِه إذا قال: ربِّ اغفر لي ذنوبي. يَعلَمُ أنه لا يغفر الذنوب أحدٌ غيره)).

١٩٨_ عەلی كوڕی ڕەبیعە فەرموویەتی: ((تەماشای عەلیم دەكرد ڕەزای خوای لێبێت وەڵاخێكی بۆ هێنرا بۆ ئەوەی سواری بێت، كە پێی خستە سەر ئاوزەنگیەكە فەرمووی: بسم الله (بە ناوی خوا)، كە ڕاست بۆوە سەر پشتی وەڵاخەكە فەرمووی: الحمد لله (سپاس و ستایش بۆ خوایە)، پاشان فەرمووی: ((سبحان الذي سخر لنا هذا وما كنا له مقرنين. وإنا إلى ربنا لَمُنْقَلبون)) واتە پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی ئەمەی بۆ ڕەخساندوین (خۆ ئەگەر ئەو بە میهرەبانی خۆی بۆی ڕام نەكردینایە) ئێمە نەماندەتوانی ڕامیان بكەین ئێمە بێگومان بۆ لای پەروەردگار دەگەڕێینەوە. پاشان عەلی فەرمووی: الحمد لله (ثلاثا) سپاس و ستایش بۆ خوایە (سێ جا ر)، خوا مەزن و گەورەیە (سێ جا ر)، سبحانك إني ظلمت نفسی، فاغفرلي، فإنه لا يغفر الذنوب إلا أنت " واتە: پاك و بێگەردی بۆ تۆیە پەروەردگارا من ستەمم لە نەفسی خۆم كردوە، سا لێم خۆش بە، كەس لە تاوان خۆش نابێت مەگەر تۆ. پاشان پێكەنی: عەلی كوڕی ڕەبیعە دەڵێت: پێم گوت: بە چ پێكەنیت ئەی ئەمیری موسڵمانان؟ عەلیش فەرمووی: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو كارەی ئەنجامدا كە من بە ئەنجامم گەیاند، پاشان پێكەنی، پێم گوت: بە چ

---

واتە ئەم هۆكارە گواستنەوە گرانەی بۆ ڕەخساند وین و، كردویەتی بە ژێر بارمان، (وما كنا له مقرنين) أي مطيقين، من أقرن الشيء: أطاقه وقوي عليه، كأنه صار له قرناً، أي مثله في الشدة. وقال بعض الشراح: أي مطيقين قهره واستعماله لو لم يسخره الله لنا. واتە لە تواناماندا نەبوون ئەگەر خوای تعالی بۆی ڕام نەكردینایە، وشەی (مقرنين)یش لە (أقرن الشيء)ەوە وەرگیراوە؛ واتە لە توانایدا بوو بە هێز بوو بە سەریدا، وەكو ئەوەی بوبێت بە هاوتای، واتە لە هێزو توانادا بو بێت بە هاوتای. كۆمەڵێكی تری ڕاڤەكارانیش گوتویانە واتە توانای زاڵبونمان بە سەریاندا نەبوو وە توانای بە كارهێنانیشیانمان نەبوو ئەگەر خوای تعالی بۆی ڕام نەكردینایە.

پێكەنیت ئەی پیغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((پەروەردگارت سەرسام دەبێت بە بەندەكەی ئەگەر بلێت: خوایە گیان لە تاوانەكانم خۆش بە. پەروەرگار دەزانێت كەسێكی تر لە تاوان خۆش نابێت جگە لە خۆی)).

ضعيف ١٩٩_ عن عامر بن سعد قال: قال سعد:(٢٢٨) ((لقد رأيت النبيَّ ضَحِكَ يوم الخندق حتى بَدَتْ نواجذه. قال: قلت: كيف كان ضَحِكُـه؟ قال: كان رجل معه تِرْسٌ،(٢٢٩) وكان سعد رامياً، وكان الرجل (٢٣٠) يقول: كذا وكذا، بالترس يغطي جَبهتَـه، فنزع له سعد بسهم، فلما رفع رأسه رماه، فلم يخطيء هذه منـه (يعني جَبْهتَـه)، وانقلب الرجل، وشال برجله.(٢٣١) فضحك النبي صلى الله عليه وسلم حتى بَدَت نواجذه. قال: قلت: من أي شيء ضحك؟ قال: من فِعلِه بالرجل).

١٩٩_ لە عامری كوڕی سەعد دەگێڕنەوە فەرموویەتی: سەعد فەرمووی: ((لە ڕۆژی (خەندەق)دا بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ پێكەنی تا دانە خڕێكانی دەركەوت. عامر دەڵێت: پێم گوت: چۆن بوو پێكەنی؟ سعد فەرمووی: پیاوێك قەڵغانێكی بەدەستەوە بوو، سەعدیش تیر هاوێژێكی دەست ڕاست بوو، پیاوەكەش دەیگوت: ئاوەها و ئاوەهاو، بە قەڵغانەكە ڕووی خۆی دادەپۆشی، سعد تیرێكی بۆ دەرهێنا، كە سەری بەرزكردەوە بۆی هاوێشت و، لێی بەهەڵەدا نەچوو (واتە ڕووی پێكا)، پیاوەكە سەربەرەو خواربۆوە و، قاچەكانی بەرزبۆوە. ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێكەنی تا دانە خڕێكانی دەركەوت. عامر دەلێت: گوتم: بە چ پێكەنی؟ سەعد فەرمووی: بەوەی بە پیاوەكە كردی)).

---

[١٩٩] _ (قلت: إسناده ضعيف، ورجاله ثقات غير محمد بن محمد بن الأسود، لم يَرو عنه غير عبد الله بن عون الثقة، وهشام بن زياد المتروك، فهو في عداد المجهولين، لاسيما ولم يوثقه أحد، حتى ولا ابن حبان! ومن طريقه أخرجه أحمد ١٨٦/١).

(٢٢٨) _ واتە سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص كە یەكێكە لە دە كەسی مژدە پێدراوانی بەهەشت.

(٢٢٩) _ الترس: بریتیە لەوەی كە مرۆڤـــی جەنـگاوەر خـۆی لـە پـــالـــیدا دەشارێتەوە لـە بارودۆخی جەنگدا واتە ( قەلـغان ) لە ( ڕیوا یە ) تێكی تردا لە جێی ( ترس ) ( قوس ) هاتووە .

(٢٣٠) _ ئەمە لـە قسـەكانی سـەعدە و مەبەستیشی پیـاوێكی دوژمـنی بەرامبـەر بـە سـەعدە لـە ( خەندەق )ەكەدا .

(٢٣١)_ واتە پیاوەكە سەر بەرەوخوار بۆوەو سەرەوەی بو بە ژێرەوەی، كە گوتویەتی: (وشال برجله) واتە بە پشتیدا كەوتو قاچەكانی بەرز بۆوە .

## ٣٦- بەشی ئەوەی سەبارەت بە گاڵتەوگەپی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح٢٠٠ _ عن أنس بن مالك: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال له: ((يا ذا الأُذُنَـيْن)). قال أبو أسامة: يعني يمازحه.

٢٠٠ _ لە ئەنەسی كوڕی مالكەوە: كە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووبو: ((ئەی خاوەن جووتە گوێ)). ئەبو ئوسامە فەرموویەتی: واتا سوعبەتی لە گەڵدا دەكرد.

صحيح ٢٠١ _ عن أنس بنْ مالك رضي الله عنه قال: إنْ كان رسول الله صلى الله عليه وسلم لَـيُخَالِطُـنا حتى يقول لأخ لي صغير: (٢٣٢) ((يا أبا عُمير! ما فعل النُـغَيْـر)) قال أبو عيسى: وفقه هذا الحديث أن النبي صلى الله عليه وسلم كان

---

٢٠٠ _ أخرجه المؤلف في ((البر)) برقم ١٩٩٣ وفي ((المناقب)) برقم ٣٨٣١ وأبوداود في ((الأدب)) برقم ٥٠٠٢ (قلت: وأحمد (٣/ ١١٧ و ١٢٧و٢٤٢و٢٦٠) وابن السني (٤٢٢) والطبراني (٦٦٣) وقال المؤلف: ((حديث صحيح غريب). وفي إسنادهم جميعا شريك وهو ابن عبد الله القاضي وهو ضعيف لسوء حفظه، لكن رواه الطبراني (٦٦٢) من طريق أخرى عن أنس به. وسنده صحيح، ولعله لذلك جزم الحافظ في ((الأصابة)) بأن النبي صلى الله عليه وسلم قاله)

٢٠١ _ أخرجه المؤلف في ((البر)) برقم ١٩٩٠ وفي ((الصلاة / باب الصلاة على البسط)) برقم ٣٣٣ والبخاري في ((كتاب الأدب)) وابن ماجة فيه برقم ٣٨٢٠ ومسلم في ((الأدب)) برقم ٢١٥٠ والنسائي في ((اليوم والليلة)). (قلت: وكذا أبوداود (٤٩٦٩) وأحمد (٣/١١٥و١١٩و١٧١و١٨٨و١٩٠و٢٠١و٢١٢و٢٢٢و٢٢٣و٢٧٨و٢٨٨) من طرق عن أنس وقال المؤلف ((حديث حسن صحيح))، ووقع في الأصل معزواً لمسلم في الصلاة أيضا و((الأستئذان)) و ((فضائل النبي صلى الله عليه وسلم)) وكل ذلك خطأ.

٢٣٢ _ أبا عمير: برای دایكیی ئەنەسە، كوڕی ئەبی طەلحەی زەیدی كوڕی سەهلی ئەنصاریە، دایكی ئەبا عومەیر ئوموسولەیمی كچی مەلحانەو، ئەبا عومەیر هەر بە منداڵی لە ژیانی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم مردووە. (النُـغير) بضم النون تصغير (النُغَر) بضم النون وفتح الغين، جمعه (نْغران): باڵندیەكی بچوكە. واتە بولبول.

يمازح. وفيه أنه كَـنى غلاماً صغيراً، فقال له: يا أبا عمير. وفيه أنه لابأس أن يعطى الصبي الطير ليلعب به، وإنما قال له النبي صلى الله عليه وسلم: ((يا أبا عمير! ما فعل النُّـغَير؟)) لأنه كان له نُـغَير يلعب به، فمات، فحزن الغلام عليه فمازحه النبي صلى الله عليه وسلم فقال: ((يا أبا عمير: ما فعل النغير؟)).

٢٠١_ لە ئەنەسی كوڕی مالكەوە ڕەزای خوای لێـبێـت فەرموویەتی: بە دڵنیایی پێغەمبەری خوا ﷺ تێكەڵیی دەكردین هەتا ئەو ئاستەی بە برایەكی بچوكم دەیفەرموو: ((ئەی ئەبا عومەیر: چی بە سەرهات نوغەیر (بولبول)). ئەبوعیسا فەرموویەتی: فیقهو سوودی ئەم فەرموودەیە لەوەدایە كە پێغەمبەری خوا ﷺ سوعبەتی دەكرد. سوودێكی دیكەی ئەوەیە نازناوی بۆ كوڕێكی بچوك داناوەو پێی فەرمووە: ئەی ئەبا عومەیر. هەروەها سودێكی تریشی ئەوەیە كە ئاساییە باڵندەیەك بدرێ بە دەستی منداڵەوە یاری پێ بكات، لە ڕاستیدا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەفەرموو: ((ئەی ئەبا عومەیر: چی بە سەر هات نوغەیر)) چونكە بولبولێكی (نغیر)ی هەبوو یاری پێدەكرد، بولبولەكە مردو، ئەویش زۆر خەمبار بوو بۆی، ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ سوعبەتی لەگەڵدا دەكردو دەیفەرموو: (ئەی ئەبا عومەیر: چی بە سەرهات نوغەیری (بولبول))).

صحيح٢٠٢ _ عن أبي هريرة رضي الله تعالى عنه قال: قالوا يا رسول الله! إنك تُـداعبنا. قال: ((نَعَـمْ، غير أني لا أقول إلا حـقاً)).

٢٠٢ _ لە ئەبی هوریرەوە ڕەزای خوای تعالای لێـبێـت فەرموویەتی: گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! سوعبەتیشمان لەگەڵ دەكەی. فەرمووی: ((بەڵێ، بەڵام من جگە لە حەق هیچی تر ناڵێم)).

---

[٢٠٢] _ أخرجه المؤلف في ((البر)) برقم ١٩٩١ وهو مما تفرد به. (قلت: وقال: ((حديث حسن غريب)) وهو كما قال كما بينته في ((الصحيحه)) (١٧٢٦) وحكاية ابن كثير عن الترمذي أنه قال: ((وهذا حديث مرسل حسن)) خطأ، ولعله من الناسخ أو الطابع).

صحيح ٢٠٣ _ عن أنس بن مالك: أن رجلا استحمل (٢٣٣) رسول الله صلى الله عليه وسلم. فقال:((إني حاملك على ولد ناقة))! فقال: يا رسول الله ما أصنع بولد الناقة؟ فقال صلى الله عليه وسلم:((وهل تلد الإبل (٢٣٤) إلا النوق)).

٢٠٣ _ لە ئەنەسی كوڕی مالكەوە: پیاوێك داوای كرد پێغەمبەری خوا ﷺ سواری وەڵاخێكی بكات. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لەسەر كوڕی مێ ووشترێك سوارت دەكەم)). پیاوەكەش فەرمووی:ئەی پێغەمبەری خوا چبكەم بە كوڕی وشتری مێ؟ ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئایا وشتری مێ جگەلە وشتری دەبێ)).

صحيح٢٠٤ _ وعنه: أن رجلاً من أهل البادية كان اسمه زاهراً، وكان يُهدي إلى النبي صلى الله عليه وسلم هديةً من البادية، فَيُجَهِّزه النبيُّ صلى الله عليه وسلم إذا أراد أن يخرجَ، فقال النبي صلى الله عليه وسلم: ((إن زاهراً باديتُنا، (٢٣٥) ونحن حاضروه)).(٢٣٦) وكان صلى الله عليه وسلم يحبه وكان رجلاً دميما

---

[٢٠٣] _ أخرجه المؤلف في ((البر)) برقم ١٩٩٢ وأبو داود في ((الأدب / باب المزاح)) حديث ٤٩٩٨. (قلت: وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح غريب))، وإسناده صحيح على شرط الشيخين، ورواه أحمد٣/١٦٧)

[٢٣٣] _ أستحمل: واتە داوای لێكرد سواری وەڵاخێكی بكات.

[٢٣٤] _ الأصل الناقة، وماقبله ((الإبل))، فكأنه أنقلب على الناسخ أو الطابع، والتصويب من ((سنن المؤلف)) وغيره، فإنه بإسناده هنا ومتنه، وقد رواه البغوي (٣٦٠٥) عن المؤلف وصححه أيضا، وكذلك رواه البخاري في ((الأدب المفرد)) (٢٦٨)، وكذلك في ((شرح القاري)) و((المناوي)).

[٤] _ (قلت: إسناده صحيح على شرط الشيخين، وكذا قال ابن كثير، وأخرجه ابن حبان (٢٢٧٦) والبغوي في ((شرح السنة)) (٣٦٠٤) وأحمد (٣/١٦١) وصححه الحافظ وله شاهد من حديث زاهر نفسه. أخرجه الطبراني في ((المعجم الكبير)) برقم ٥٣١٠).

٢٣٥ _ باديتنا: واتە ئەو سودەی لێیدەبینێت هاوشێوەی ئەو سودەیە كە پیاو لە بیابانەكەی دەیبینێت. (البادي): واتە جێنشینی بیابان، خوای تعالى لە ئایەتی (٢٥) سورەتی (الحج) دا دەفەرمێت: (والمسجد الحرام الذي جعلناه للناس سواء العاكف فيه والباد) واتە مزگەوتی حەرام بریارمان داوە بۆ هەموو خەڵكی بێت چونیەك بۆ ئەوانەی لەوێ دەژین یا ئەوانەی لە شوێنانی ترو بیابانەوە بۆی دەچن. تەفسیری ئاسان. برهان محمد أمين.

(٢٣٧) فأتاه النبيُّ صلى الله عليه وسلم يوماً وهو يبيع متاعه، فاحتضنه من خلفه وهو لا يبصره، فقال: من هذا؟ أرسلني. فالتفت، فعرف النبيَّ صلى الله عليه وسلم، فجعل لا يألو (٢٣٨) ما ألصق ظهره بصدر النبي صلى الله عليه وسلم حين عرفه، فجعل النبيُّ صلى الله عليه وسلم يقول: ((من يشتري هذا العبد؟)). فقال يا رسول الله! إذا والله تجدني كاسداً. فقال النبي صلى الله عليه وسلم: ((لكن عند الله لست بكاسد)). أو قال: ((أنتَ عند الله غالٍ)).

٢٠٤_ هەر لە هەمان هاوەڵەوە: پیاوێکی خەڵکی بیابان ناوی زاهیر بوو، شتی بیابانی بە دیاری پێشکەشی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ هەموو شتێکی بۆ ئامادە دەکرد ئەگەر ویستی دەرچوونی هەبوایە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((سوود لە شتی بیابانیی زاهر دەبینین و، ئێمەش مەدینەی بۆ ئامادە دەکەین)). پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشیدەویست هەرچەند پیاوێکی ناشرین بوو ئەوە بوو ڕۆژێك سەرقاڵی فرۆشتنی کەلوپەلەکانی بوو پێغەمبەری خوا ﷺ چووە دیدەنیو، لە پشتەوە لە ئامێزی گرت و زاهیریش نەیدەبینی، زاهیر دەیگوت: ئەوە کێ یە؟ بەرم بدە. کە ئاوڕی دایەوە، پێغەمبەری خوای ﷺ ناسیو، ئیتر کەمتەرخەمی نەدەکرد سەبارەت بە لکاندنی پشتی بە سنگی پێغەمبەری خواوە ﷺ ئەوە بو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((کێ ئەم کۆیلە دەکڕێ)). زاهیریش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! کەواتە دەمبینی بێ بازاڕمو کەس نامکڕێت. ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەڵام لای پەروەردگار بێ بازاڕنیت)) یا فەرمووی: ((تۆ بە لای پەروەردگارەوە بە نرخیت)).

[٢٣٦] _ ونحن حاضروه: واتە شاری مەدینەی بۆ ئامادە دەکەین، ئەمەش دەچێتە چوارچێوەی ڕەفتارباشی لەگەڵ کردنەوە. لە پێناو فێرکردنی ئومەتەکەیدا بۆ شوێنکەوتنی ئەم ڕەفتارو خۆشدوانیە.

[٢٣٧] _ دميما: واتە پیاوێکی ناشرین بوو بەڵام ئێسك سووك بوو.

[٢٣٨] _ لايألو: واتە کەم تەرخەمی نەدەکرد.

حسن٢٠٥_ عن الحسن قال: أتت عجوز إلى النبي صلى الله عليه وسلم فقالت: يا رسول الله! أدع الله أن يُدخلني الجنةَ. فقال: ((يا أمَّ فلان! إن الجنةَ لا تدخلها عجوز)). قال: فولت تبكي. فقال: ((أخبروها أنها لا تَدخُلها وهي عجوز))، إن الله تعالى يقول: (إنا أنشأناهُنَّ إنشاءً. فجعلناهن أبكاراً. عُرُباً أتْراباً)).(٢٣٩)

٢٠٥_ لە حەسەنەوە فەرموویەتی: ژنێکی بە ساڵاچوو هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! لە خوا بپارێرەوە بۆ ئەوەی بمخاتە بەهەشتەوە. پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەی دایکی فڵان! بەساڵاچوو ناچێتە بەهەشتەوە))، حەسەن فەرمووی: ژنەکە بە گریان دوورکەوتەوە. ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((پێی ڕاگەیەنن بە بەساڵاچوو ناچێتە بەهەشتەوە))، چونکە خوای تعالى دەفەرموێت: (ئەو حۆریانەمان بە تایبەت بۆ دروست کردون. کردومانن بە حۆریانی هەمیشە کیژ. هاوسەرەکانیان زۆر خۆش دەوێ و هەموویان هاوتەمەنن))، پوختەی تەفسیر.

---

[٢٠٥] _ (قلت: إسناده ضعيف، فإنه مع إرسال الحسن إياه _ وهو البصري_ فإن الراوي عنه المبارك بن فضالة مدلس وقد عنعنه، وهو مخرج في ((غاية المرام في تخريج أحاديث الحلال والحرام)) رقم (٣٧٥) وقد حسنته هناك لشاهد له، خرجته ثمة، وانظر المقدمة منه ص ١١).

[٢٣٩] _ ئایەتەکانی ٣٥ و ٣٦ و ٣٧ ی سورەتی وا قعە.

(الأبكار) أي العذارى: واتە کیژ.

(عربا): أي متحببات إلى أزواجهن بحسن التبعل، جمع (عروب) كرُسل ورسول من أعرب إذا بين: واتە خۆشەویستی بەرامبەر بە مێردەکانیان دەردەبڕن بە چاکەی ژن و مێردایەتی.

(أترابا) _ واتە: هاوتەمەنن وەکو ئەوەی لە یەکسانی تەمەندا چواندبێتنی بە پەراسوەکانی سنگ.

## ٣٧_ بەشی ئەوەی سەبارەت بە سیفەتی ئاخاوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

٢٠٦ _عن عائشة رضي الله عنها قالت: قيل لها: هل كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يتمثل بشيء من الشعر؟ قالت:صحيح((كان يتمثل بشعر ابن رواحة، (٢٤٠) ويتمثل بقوله (٢٤١): ويأتيك بالأخبار من لم تُـزَوِّد.(٢٤٢)

---

٢٠٦_ أخرجه المؤلف في ((الأدب)) برقم ٢٨٥٢.

(قلت: وقال: ((حديث حسن صحيح)). قلت: وهو كما قال بالنظر لشواهده، وقد خرجت بعضها مع الحديث في ((الصحيحة)) ٢٠٥٧).

[٢٤٠] _ عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەی ئەنصاری ئەلخەزرەجیە، یەکێـك بوو لەو کەسایەتیانەی لە حاڵ و باری خەڵکەکەی دەکۆڵیەوە و گرنگی پێدەدان و مشوری دەخواردن _ أحد النقباء _ پەیمانی عەقەبە و جەنگەکانی بەدرو ئوحدو خەندەق و جەنگەکانی تریشی بینیوە، جگە لە ڕزگارکردنی مەککە ئەوانەی دواوەی، چونکە لە ڕۆژی جەنگی (مؤتة) دا بە ئەمیری شەهید بوو، لە شیعرەکانی:

وفينا رسـول الله يتلو كتابه    إذا أنشق معروف من الفجر ساطع

أرانا الهدى بعد العمى فقلوبنا    بـه موقنات أن ما قال واقع

يبيت يجافي جنبه عن فراشه    إذا أستقلت بالكافرين المضاجع

واتا:

پێغەمبەری خوامان لە نێواندایەو کیتابەکەی دەخوێنێتەوە، ئەگەر چاکە وەکو سپێدە دەرکەوت درەخشان، ڕێگەی ڕاستی پیشاندایین پاش گومڕابوون دڵەکانمان بێگومانە ئەوەی فەرموویەتی جێگیر دەبێت، دەنوێت و جێگە بە خۆی ناگرێت، کاتێك نوێنەکان بێباوەڕان هەڵدەگرن

[٢٤١] _ واتە نموونەی لە شیعرەکانی طەرەفەی کوڕی عەبدیش دەخوێندەوە. ئەوەشی لە شیعرە موعەلەقەکانیدا گوتووە.

[٢٤٢] _ تُـزَوِّدِ، بضم التاء وكسر الواو المشددة، وهو من التزويد: واتە بەخشینی توێشوو، سەرەتای دێڕەکەش:

ستبدي لك الأيام ماكنت جاهلا    ويأتيك بالأخبار من لم تُـزَوِّدِ.

واتا:

ڕۆژگار بۆت دەردەخات ئەوەی ئاگات لێ نەبووەو هەواڵەکانیشت بۆ دەهێنێ ئەوەی هیچ توێشویەکت پێنەداوە .

٢٠٦_ لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێـبێت فەرموویەتی: كە لێیان پرسیبوو: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نموونەی لە هەندێ شیعر دەخوێندەوە: فەرموویبووی: ((نموونەی لە شیعری عەبدوڵای كوڕی ڕەواحە دەخوێندەوەو، ئەو نموونەیەشی دەخوێندەوە كە دەڵێت: هەواڵەكانت بۆ دەهێنێ ئەو كەسەی هیچ توێشوویەكت پێنەداوە.

صحيح ٢٠٧_ عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((إن أصدق كلمة قالها شاعرٌ، (وفي رواية. أشعر كلمة تكلمت بها العرب /٢٤٧) كلمة لبيد (٢٤٣): ألا كل ما خلا الله باطِل. وكاد أمية بن أبي الصلت أن يُسلم)).

٢٠٧ _ لە ئەبی هوریرەوە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ڕاسترین گوفتار شاعێریك گوتبێتی و (لە ڕیوایەتێكدا چاكترین گوفتاری شیعری عەرەب گوتبێتی / ٢٤٧) گوتەكەی (لەبیدە): بزانە هەموو شتێك جگە لە خوا ناڕەوایە. وە ئەوەندەی نەمابوو (ئومەیەی كوڕی ئەبی صەلت) مو سلمان بێت.

---

[٢٠٧] _ أخرجه المؤلف في ((الأدب)) برقم ٢٨٥٣ والبخاري فيه وفي ((مناقب الأنصار)) ومسلم في ((كتاب الشعر)) برقم ٢٢٥٦ وابن ماجة في ((الأدب)) برقم ٣٧٥٧.

(قلت: وكذا أحمد (٢/ ٢٤٨ و٣٩١و٣٩٣و٤٤٤و٤٥٨و٤٧٠و٤٨٠و٤٨١). وليس عند المؤلف: ((وكاد أمية.٠)) وقال: ((حديث حسن صحيح))، والرواية الأخرى فيها شريك بن عبد الله القاضي وهو سيء الحفظ، وهي رواية لأحمد أيضا. ولم يصح أن تمام البيت: ((وكل نعيم لا محالة زائل)) لأن فيه من لم يسم. راجع ((فتح الباري))).

[٢٤٣] _ لبيد بن أبي ربيعة العامري: لەبید چۆتە خزمەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم لەو ساڵەدا كە شاندی خێڵەكەی دیدەنیان كردوە، پیاوێكی پایە بەرز بووە لە خێڵەكەیدا لە تاق نەفامی و سەردەمی ئیسلامیشدا، چۆتە (كوفە) و ساڵی (٤١) كۆچی و لە تەمەنی (١٤٠) ساڵیدا كۆچی دوای كردووە، یەكێكە لە زمان پاراوەكانی عەرەب (فصحاء العرب) و شاعیرەكانیان و كە موسڵمان بوو ئیتر شیعری نەدەگوت و دەیگوت قورئانم بەسە.

صحيح ٢٠٨ _ عن جُندب بن سفيان البَجَلي (٢٤٤) قال: أصاب حَجَر إصبع رسول الله صلى الله عليه وسلم فَدَمِيَتْ فقال: ((هل أنتِ إلا إصبع دَمِيتِ وفي سبيل الله ما لَقيتِ)).

٢٠٨ _ لە جوندوبی كوڕی سوفیانی بەجەلیەوە فەرموویەتی: بەردێك پەنجەی پێغەمبەری خوای ﷺ پێكاو خوێناوی بوو ئینجا فەرمووی: ((ئایا تۆ تەنها پەنجەیەك نیت خوێنت لیهاتووەو لە پێناوی خوادا ئەوەت بەركەوتووە.

صحيح ٢٠٩ _ عن البراء بن عازب قال: قال له رجل: أفررتم عن رسول الله صلى الله عليه وسلم يا أبا عُمارة؟ فقال: لا والله، ما ولّى رسول الله صلى الله عليه وسلم، ولكن وَلّى سَرَعان الناس، (٢٤٥) تلقتهم هوازن (٢٤٦) بالنَّبل ورسول الله صلى الله عليه وسلم على بغلته، وأبو سفيان بن الحارث (٢٤٧) بن عبد المطلب آخذٌ بلِجامها، ورسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: ((أنا النبي لا كذب أنا ابن عبد المطلب)).

---

[٢٠٨] _ أخرجه المؤلف في ((التفسير)) برقم ٣٣٤٢ والبخاري في ((الجهاد / باب فضل من يصرع في سبيل الله)) وفي ((كتاب الأدب)) ومسلم في ((الجهاد / باب ما لقي الرسول صلى الله عليه وسلم من أذى المشركين)) ح ١٧٩٦.

(قلت: وأحمد (٣١٣/٤) وقال المؤلف: ((حسن صحيح))).

[٢٤٤] _ بَجَلي: بفتح الباء و الجيم: دەگەڕێتەوە بۆ هۆزی (بوجەیلە) .

[٢٠٩] _ أخرجه مسلم في ((الجهاد / باب غزوة حنين)) ح ١٧٧٦ والبخاري في ((المغازي)) والمؤلف في ((الجهاد)) حديث رقم ١٦٨٨ وابن ماجة في ((الجهاد)).

(قلت: وأحمد (٢٨٩/٤) وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح))).

[٢٤٥] _ سَرَعان الناس: واتە خێراكاران و پەلەكاران . (گوتم: واتە خێراكاران بۆ دەرچون و پەلەكارە یەكەمینەكان، وليس هو جمع (سريع)، فإنه يكون على زنة (صبيان) و (كثبان) ومنه يتبين أن الأصل (سَرْعان) خطأ).

[٢٤٦] _ هوازن: هۆزێكی بەناوبانگ بوون لە بواری بە هێزی و توندی تیر هاوێشتنیاندا كە لەوانەیە هەرگیز تیرەكانیان بە هەڵەدا نەچو بێت

[٢٤٧] _ أبو سفيان بن الحارث بن عبدالمطلب: ئامۆزای پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه و سلم و برای شیریەتی.

٢٠٩ _ لە ئەلبەرائى كوڕى عازبەوە فەرموويەتى: پياوێك لێى پرسيبوو: ئايا پێغەمبەرى خواتان ﷺ بەجێهێشتو هەڵـهاتن ئەى (ئەى ئەبا عومارە)؟ فەرمووى: نەخێر سوێند بە خوا، پێغەمبەرى خوا ﷺ هەڵنەهات، بەڵكو خێراكاران و يەكەمينە پەلەكارەكان هەڵهاتن، كە هۆزى هەوازن بە تير ڕووبەڕويان بوونەوەو، پێغەمبەرى خوا ﷺ بەسەر ئێسترەكەيەوە بوو، ئەبوسوفيانى كوڕى حارث كوڕى عبدالمطلب دەستە جڵەوەكەى بە دەستەوە بوو، پێغەمبەرى خواش ﷺ دەيفە رموو: ((من پێغەمبەرى درۆ نيم من كوڕى عبد المطلبم)).

صحيح ٢١٠_ عن أنس: أن النبي صلى الله عليه وسلم دخل مكة في عُمْرة القضاء (٢٤٨) وابن رواحة يَمشي بين يديه وهو يقول: خَلُّوا بني الكفار عَن

٢١٠ _ أخرجه المؤلف في ((الأدب)) برقم ٢٨٥١ والنسائي في ((الحج)).
(قلت: وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح غريب)) ورواه ابن حبان أيضا في ((صحيحه)) (٢٠٢٠)، وإسنادهم صحيح على شرط مسلم، وعزاه الحافظ في ((الأصابة)) لرواية أبي يعلى بسند حسن. فقصر تخريجا وتحسينا! ! وأعله المؤلف بعلة غريبة بعد تصحيحه إياه فقال: ((وروى في غير هذا الحديث أن النبي صلى الله عليه وسلم دخل مكة في عمرة القضاء وكعب بن مالك بين يديه)) وهذا أصح، لأن ابن رواحة قُتل يوم مؤتة، وإنما عمرة القضاء بعد ذلك. كذا قال، والمعروف أن العمرة كانت سنة سبع، وغزوة مؤتة سنة ثمان، كما في (زاد المعاد) وغيره فالأعلال المذكور مردود. والله أعلم).
وا تە دانەر پاش بە ( صحيح ) دانانى فەرموودەكە زەدە داريشى ( اعلال ) دەكات بە زەدەيەكى نامۆ كاتێ فەرموويەتى: (( لە چەند فەرموودەيەكى تردا هاتووە كە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه و سلم بۆ ( عمرة القضاء ) ديدەنى مەككەى كرد ( كەعبى كوڕى مالك ) لەپێش دەستيدا ڕێى دەكرد )) دانەر فەرموويەتى ئەمە ڕاسترە، چونكە ( ئيبنو ڕەواحە ) لە جەنگى موئتەدا كوژراوەو، لە ڕاستيشدا ( عمرة القضاء ) دواى ئەوە ئەنجام دراوە. ئاوەهاى فەرمووە، ئاشكەراشە ( عمرة القضاء ) ساڵى حەوتەمى كۆچى ئەنجام دراوەو، جەنگى موئتەش ساڵى هەشتەم ڕوويداوە، بە بەڵگەى ئەوەى لە ( زاد المعاد ) وهيديكەشدا هاتووە كەوا بوو زەدەى دانەرى ئاماژە پێكراو ڕەتكراوەتەوە، والله أعلم.
٢٤٨ _ عمرة القضاء: پاش ڕێكەوتنى حودەيبيە ئەنجام دراوە .

سَبيلِـهِ اليومَ نَـضربْـكُـمُ على تـنـزيله (٢٤٩) ضَـرْباً يُـزِيلُ الهامَ عن مَـقيله ويُـذْهِل الخليلَ عن خَـلـيلِـه (٢٥٠) فقال له عمر: يا ابن رواحة! بَـيْـنَ يَـدَيْ رسول الله صلى الله عليه وسلم، وفي حرم الله تـقول الشعر؟! فقال صلى الله عليه وسلم: ((خَـلِّ عنه يا عمر! فَـلَـهِـيَ أسرعُ فيهم من نَـضْحِ النَّـبْـلِ )).

٢١٠ _ لە ئەنەسەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ (عُمرة القضاء) دیدەنی مەكەی كردو (ئیبنو ڕەواحەش) لە پێش دەستیدا ڕێی دەكردو دەیفەرموو: ئەوەی بێباوەڕان لەسەر ڕێگەی دورخەنەوە ئەمڕۆ لێتان دەدەین لەسەر قورئانەكەی لێدانێك سەر لە جێگەی لابەرێت دۆستیش دۆستەكەی بیرچێتەوە عومەریش پێی فەرموو: ئەی ئیبنو ڕەواحە: لە پێش دەستی پێغەمبەری خوادا ﷺ و لە حەرەمی خوادا شیعر دەڵێی؟! ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((وازی لێ بێنە ئەی عومەر! بە دڵنیای لە بارینی تیر بەسەریانەوە كاریگەرترە)).

صحيح٢١١ _ عن جابر بن سمرة قال: ((جالست النبي صلى الله عليه وسلم أكثرَ مِنْ مائةِ مَـرة، وكان أصحابُـه يتـنـاشدون الـشِّعرَ، ويتـذاكرون أشياءَ مِـن أمر الجاهلية وهو ساكتٌ، وربما تَـبَـسَّـمَ معهم)).

٢١١ _ لە جابری كوڕی سەمورەوە فەرموویەتی: ((زیاتر لە سەد جار لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دانیشتووم، هاوەڵانی شیعریان بۆ یەكتر دەخوێندەوەو، هەندێ شتیان لە تاڤی نەفامی یادكردەوەو پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنــگ دەبوو، بەڵكو هەندێك جار بە زەردەخەنەش بەشداری دەكردن)).

---

[٢٤٩] _ نَـضربْـكم: بسكون الباء لضرورة الشعر. و(التـنزيل): الـقـرآن. و(النبـل) السـهام: وا تـە تیر.

[٢٥٠] _ والهام: جمع هامة أعلى الرأس: واتە تەوقی سەر. (مقيله) أي موضعه: واتە جێگەكەی.

[٢١١] _ وأخرجـه المؤلـف في ((الأدب)) بـرقم ٢٨٥٤. ((قـلـت: وقـال المؤلـف: ((حـديث حسـن صحيح)). قـلـت: في إسناده شريك، وهو سيء الحفظ، ومن طريقه أخرجـه أحمد (١٠٥/٥)، لكـن تابعه زهير وهو ابن معاوية عند النسائي في ((السهو))، فصح الحديث والحمد لله).

صحيح ٢١٢ _ عن عَـمرو بن الـشَّـريد عن أبيه قال: ((كنت رِدف (٢٥١) النبي صلى الله عليه وسلم، فأنـشـدتُـه مائةَ قافـيةٍ من قول أميةَ بن أبي الصلت الـثَـقـفي، كلـَّما أنشدته بيتـاً قال لي النبي صلى الله عليه وسلم: ((هِـيـهِ))، (٢٥٢) حتى أنـشـدتـه مائة. يعني بيتـاً. فقال النبي صلى الله عليه وسلم: ((إن كـاد لـَيُسلِم)).

٢١٢_ عەمری کوڕی شەرید لە باییەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ((لە پشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ سواری وەڵاخێك ببووم، سەد سەراوی شیعرم لە گوفتارەکانی (ئومەیەی کوڕی ئەبی صەلتی ئەقەفی) بۆ خوێندەوە، هەرکات دێڕێکم بۆ دەخوێندەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەفەرمووم: ((هی تریش))، هەتا سەدم بۆ خوێندەوە. مەبەستی دێڕە شیعرە. ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ وسلم فەرمووی: ((بە دڵنیای هێندەی نەمابوو موسڵمان بێت)).

حسن ٢١٣ _ عن عائشة قالت: صحيح كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يَـضَـع لِـحَسَّـانَ بن ثابت منبراً في المسجد يقوم عليه قائماً، يفاخر عن رسول الله صلى الله عليه وسلم، أو قال: ينافح عن رسول الله صلى الله عليه وسلم، ويقول: ((إن الله يؤيد حسان بِـرُوحِ الـقـدس (٢٥٣) ما ينافحُ أو يفاخرُ عن رسول الله صلى الله عليه وسلم)).

---

[٢١٢] _ أخرجه مسلم في ((كتاب الشعر)) ٢٢٥٥ وابن ماجة في ((الأدب)).

(قـلـت: وأحمد (٤/ ٣٨٨ و ٣٨٩)، وفيـه عنـدهم عبدالله بـن عبـدالرحمن الطـائفي قـال الحـافظ: ((صدوق يخطيء ويَهم)) لكن تابعه على أصل القصة دون قولـه: ((إن كـاد ليسـلم)) إبـراهيم بـن ميسرة عند مسلم وأحمد(٤/٢٨٩و٣٩٠) لكن يشهد له حديث أبي هريرة المتـقـدم برقم ٢٠٧).

[٢٥١] _ رَدف: واتە لە پشتیەوە سواری وەڵاخێـك ببو .

[٢٥٢] _ هـيـهِ: أي زدني: واتە هیتریشم بۆ بخوێنەوە.

[٢١٣] _ أخرجه المؤلف في ((الأدب)) برقم ٢٨٤٩ وأبوداود فيه ح ٥٠١٥.

(قـلـت: وأحمد وغيره، وصححه المؤلف والحاكم والذهبي وهو مخرج في ((الصحيحه)) ١٦٥٧).

[٢٥٣] _ روح الـقـدس: واتە جبریل.

٢١٣_ لە عائیشەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەمزگەوتدا دوانگەیەكی بۆ (حەسانی كوڕی ثابت) دادەناو دەچووە سەری‌و ڕادەوەستا. بە شیعرەكانی شانازی بە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەكرد، یا فەرمووی: بەرگری لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەكردو، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((خوای تعالی پشتگیری حەسان دەكات بە ڕوح القدس) هەرچەند بەرگری یا شانازی بە پێغەمبەری خواوە ﷺ بكات)).

صحیح ٢١٤_ عن عائشة قالت: حدَّث رسول الله صلى الله عليه وسلم ذات ليلةٍ نساءه حديثاً، فقالت امرأة منهن: كأن الحديث حديث خُرافة، فقال: ((أتدرون ما خُرافة؟ إن خُرافة كان رجلاً من عُذرةَ (٢٤٥) أسَرَتْه الجِنُّ في الجاهلية، فمكث فيهم دهراً، ثم ردوه إلى الإنس، فكان يحدث الناس بما رأى فيهم من الأعاجيب، فقال الناس: حديث خرافة)).

٢١٤ _ لە عائیشەوە فەرموویەتی: شەوێك پێغەمبەری خوا ﷺ باسێكی بۆ خێزانەكانی باس كرد، ئەوەبو ژنێكیان فەرمووی: باسەكە لە باسەكەی (خورافە) دەچێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئایا دەزانن (خورافە) چی یە؟ (خورافە) پیاوێك بوو لە هۆزی (عوذرە) لە تاقی نەفامیدا لە لایەن جنەوە بە دیل دەستبەسەركراو، ماوەیەك تیایاندا مایەوە، پاشان گەڕاندیانەوە بۆ ئینس‌و، ئیتر ئەوەی بینیبوی لە شتە سەرسوڕمێنەكانی ناویان بۆ خەڵكی باس دەكردن، ئەوەبو خەڵك گوتیان: باسەكەی (خورافە))).

حديث أم زرع

---

[٢١٤] _ (قلت: إسناده ضعيف، فيه مجالد بن سعيد، وليس بالقوي، ومن طريقه رواه أحمد وغيره، وهو مخرج في ((الضعيفة)) (١٧١٢)، وقال ابن كثير: ((وهو من غرائب الأحاديث، وفيه نكارة)).

[٢٤٥] _ عذرة: یەكێكە لە هۆزە یەمەنیە بە ناو بانگەكان .

صحيح٢١٥ _ عن عائشة قالت: جَلَسَت إحدى عشرةَ امرأة فتعاهَدْنَ وتعاقَدْنَ أن لا يكتمن من أخبار أزواجهن شيئاً.(فقالت الأولى): زوجي لحم جَمَلٍ غَثّ، (٢٥٥) على رأسِ جبلٍ وعرٍ، لا سهلُ فَيُرتَقى، ولا سمينُ فينتقل.(٢٥٦)

فەرموودەكەی (ئومو زەرع)

یازدە ژن دانیشتن و پەیمانیان بەستو رێكەوتن لە سەر نەشاردنەوەی هیچ شتێكی هەواڵی مێردەكانیان. (یەكەمیان گوتی): مێردەكەم گۆشتی وشترێكی لەڕ و لاوازە، بە سەر چیایەكی سەختەوەیە، نە لەبارە بۆ سەركەوتن، نە قەڵەویشە بۆ داگرتن و گواستنەوە (قالت الثانية): زوجي لا أثيرُ خبرَه، (٢٥٧) إني أخاف أن لا أذَرَهُ، (٢٥٨) إن أذكره أذكر عُجَره وبُجَره. (٢٥٩).

---

٢١٥ _ أخرجه البخاري في ((النكاح/ باب حسن المعاشرة مع الأهل وحل السمر في خير)). ومسلم في ((الفضائل / باب ذكر حديث أم زرع ح ٢٤٤٨)) والنسائي في ((عشرة النساء)) وفيه زيادة: ((إلا أنه طلقها، وأنا لا أطلق. فقالت عائشة: يا رسول الله بل أنت خير من أبي زرع)) واتە ئیمامی نەسائی فەرموودەكە بەم زیادەوە دەگێڕێتەوە: ((كەچی تەڵاقیداو، بەڵام من تەڵاق نادرێم. پاشان عائشە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا بەڵكو تۆ لە ئەبو زەرع باشتری)) أنظر القسطلاني على البخاري ٨ / ١٠٢

٢٥٥ _ واتە لە خراپیدا وەكو گۆشتی ووشترە نەك وەكو گۆشتی مەڕ، مەبەستیشی زیادەڕۆكردن بوو بە گوتنی كەم سوودیی و دەست لێهەڵگرتنی و نەمانی خوو و ڕەوشتی باش تیایدا .

٢٥٦ _ مەبەستیش زیدڕۆكردن بوو بە گوتنی لە خۆبایبوون و خراپی دۆستایەتیدا، هەروەها پێگەیشتنیشی مەحاڵە مەگەر بە كێشانی ناڕەحەتیەكی زۆرو، هیچ كەڵكێكیشی بۆ خێزانەكەی نییە لە بواری تێكەڵی و مامەڵەكردن و هیتریشدا لەگەڵ ئەوەی نەویستراو خراپە. مانای (لا ينتقل): واتە خەڵكی هەڵناستن بە گوێزانەوەی بۆ ماڵەكانیان بۆ خواردنیی پاش كێشانی ناڕەحەتیەكی زۆری پێگەیشتن بەڵكو وازی لێدەهێنن لە بەر خراپیەكەی، بە گشتی بەدەست قوچاوی و خراپی و لوت بەرزی بە سەر خێزانەكەیدا و بەد ڕەفتاری وەسفی كرد.

٢٥٧ _ لا أثير خبره: هەواڵی مێردەكەم ناوروژێنم و بڵاوناكەمەوە.

٢٥٨ _ إني أخاف لا أذره: واتە دەترسێت ئەگەر باسی بكات تەڵاقی بدات.

(قلت: بل الضمير فيه راجع الى الخبر، والمعنى: إن شرعت في الخبر أخاف أن أتركه لكثرته).
(گوتم: بەڵكو ڕاناوەكەی دەگەڕێتەوە بۆ (خەبەر)، ماناكەشی: واتە ئەگەر دەست بە باسكردنی هەواڵەكانی بكەم دەترسم لە بەر زۆریان وازی لێبێنم).

(قالت الثالثة): زوجي العَشَنَّقْ، (٢٦٠) إن أنْطِقْ أطلَّقْ، (٢٦١) وإن أسكُتْ أعَلَّقْ(٢٦٢). (قالت الرابعة): زوجي كليل (تِهَامَة)، (٢٦٣) لا حَرّ ولاقَرّ، (٢٦٤) ولا مخافة ولا سآمة. (دووەمیان گوتی): هەواڵی مێردەكەم ناوروژێنم وبڵاو ناكەمەوە، دەترسم وازی لێبێنم لە زۆریاندا، ئەگەر باسی بكەم باسی هەڵەو خەوش و ناتەواوی ئاشكەراو شاراوەكانی دەكەم. (سێ یەمیان گوتی): مێردەكەم درێژێكی نەویستە لە درێژیدا باریكەڵەی بەدڕەفتار، ئەگەر قسە بكەم تەڵاق دەدرێم و ئەگەر بێدەنگیش بم بە مۆڵەقی دەمێنمەوە. (چوارەمیان گوتی): مێردەكەم وەكو شەوی (تیهامە)یە، نەگەرمی نەساردی، نە ترس و بیم و نە بێزاری. (قالت الخامسة): زوجي إن دخل فَهِدَ، (٢٦٥) وإن خرج أسِدَ، (٢٦٦) ولا يسأل عما

---

[٢٥٩] _ (عُجَره) بضم الأول وفتح الثاني: واتە سەراپای عەیبەكانی، ئاشكەرا و شاراوە. (العجر) جمع (عجرة) لە بنەڕەتدا ئاوسانێكە لە خوێنبەرەكانی ملدا. (البجر) جمع بجرة: واتە ناوك. دەیەوێت بڵێت؛ ڕۆناچم لە باسكردنی هەواڵەكانیدا، چونكە ئەگەر باسی بكەم لە ناكۆكی و جیابوونەوەو سەر لێشێوانی ماڵ و منداڵ دەترسم.

[٢٦٠] _ العَشَنَّق: بفتح العين والشين مفتوحة مشددة: واتە درێژێكی نەویستراو لە درێژیدا لاوازو بەدڕەوشت.

[٢٦١] _ إن أنطق أطلق: واتە ئەگەر بە وردی باسی عەیبەكانی بكەم تەڵاقم دەدات چونكە بەدڕەوشتەو، منیش حەزم بە تەڵاق نییە چونكە منداڵم لێهەیە، یا پێویستم پێیەتی.

[٢٦٢] _ وإن أسكت أعلق: واتە ئەگەر لە عەیبەكانیشی بێدەنگ بم هەڵواسراو دەبم، ژنی هەڵواسراویش (معلقه) ئەو ژنەیە كە نە شووی كردوە بە مێردێكی بە كەڵك و، نەتەڵاقیش دراوە بە هیوای شووكردن بێت.

[٢٦٣] _ واتە لە میانڕەوێتی تەواو بێناڕەحتی و ئاسایی كاروباریدا.(تهامة): مەبەست مەككە و دەوروبەرەكەیەتی.

[٢٦٤] _ ئەوە دەبەخشێت كە زیانی پێناگەیەنێت لە بەر ڕەوشت بەرزی و جێگیر بوونی هەموو جۆرە چێژێك لە كاتی دۆستایەتی و تێكەڵاویدا.

[٢٦٥] _ إن دخل فهد: واتە ئەگەر چووە ژوورەوە بۆ لای بازدەدا وەكو بازدانی پڵنگ بۆ جوتبوونی. (فَهِد الرجل): واتە خەوتنی زۆر بوو وەكو پڵنگ.

[٢٦٦] _ واتە ئەگەر بە جێیهێشت و چووە دەرەوە كردەوەی شێرانە ئەنجام دەدات.

عَهِـد.(٢٦٧) (قالت السادسة): زوجي إن أكل لَـفَّ، (٢٦٨) وإن شَـرِبَ اشْتـفَّ، (٢٦٩) وإن إضطجَـعَ التَـفَّ،(٢٧٠) ولا يُـولج الكفَّ لِيَعلَـم البَـثَّ. (٢٧١) (پێنجەمیان گوتی): مێردەكەم كە دێتەوە دەبێـت بە پـڵنگ، كە چووە دەرەوە دەبێـت بە شێر، پرسیاریش ناكات سەبارەت بەو شتومەكانەی پێـی دەزانیّ لە ماڵەكەی چووە. (شەشەمیان گوتی): مێردەكەم هەركات بخوات زۆر دەخواتو چەشنەكانی خواردن تێـكەڵاو دەكات، هەركات بخواتەوە چۆری لیّ دەبڕێت و، ئەگەر ڕاشكشێـت بە پۆشاكەكەی خۆی دەپێچێتەوەو بە لێفەیەك خۆی دادەپۆشێـت بە تەنیا، دەست ناچێـنێت بە نێـو پۆشاكەكمدا بۆ زانینی خەم و پەژارەكانم. (قالت السابعة): زوجي عَـيَايَـاءُ، (٢٧٢) (أو غَـيايَاءُ) طَـباقاءُ كلُّ داءٍ له داء، (٢٧٣) شَـجَّـكِ، أو فَـلَّـكِ، أو جمع كُلاًّ لَـكِ. (قالت الثامنة): زوجي: المسُّ،

---

[٢٦٧] _ ولا يسأل عما عهد: واتە پرسیار ناكات دەربارەی ئـەوەی دەزانێت لـە ماڵەكـەی چـووە لـە خـواردنو خواردنـەوە چـونكە بەخشـندەیە. لەبـەر ئـەوە وەسـفی دەكـات بـە ڕەوشـت بـەرزی و دۆستایەتی و هۆگر بـوون لـە ماڵـەوەداو بەهێـزی و دلێـری لـە كارەكانیـداو، ناگەڕێـت بـە دوای ئەوەی لە ماڵ و كەل و پەلەكانی چووە لە بەر دەست پاكی و بەرچاوفراوانی.

[٢٦٨] _ واتە : زۆر دەخواتو، چەشنەكانی خواردنی تێـكەڵاو دەكات.

[٢٦٩] _ واتە: ئەگەر بخواتەوە پاشماوەی ئاوەكە لە بنی قاپەكەشدا دەخواتەوە، واتە هیچ شتێـك لە قاپەكەدا ناهێـڵێـتەوەو چۆڕی لیّ دەبڕێـت.

[٢٧٠] _ واتە ئەگەر لە سەر لاتەنیشتی پاڵـكەوت بە جلەكانی خۆی دەپێـچێـتەوە و بەلێـفەیەك خۆی دادەپۆشێـت بە تەنها لە جێـگەیەكداو لـە گەڵیـدا جـووت نابێـتو، هـیچ كەڵـكێـكی بـۆ خێـزانەكەی نییە.

[٢٧١] _ واتـە دەسـتی ناچێـنێـت بـە ژێـر جلەكانیـدا بـۆ زانینـی خـەم و پـەژارەكانی و هـیچ بەزەییەكی پێـدانایەتەوە.

[٢٧٢] _ عیایـاء: واتـە توانـای بەڕێـوەبردنی بەرژەوەندیـەكانی خـۆی نـی یـە لـە كەشەنـگیدا، گوتراویشە سست بوونە لە هێـزی پیاوەتیدا. (غیایاء): واتە گومرایی كە بریتیە لە سەرگەردانی یـا هیوابڕان. (طباقاء): ئـەو كەسـەیە كـە كاروبارەكـانی تـەنگی پێـهەڵچنیوە، یـا ئـەو كەسـەیە كـە توانای جووت بوون یا قسەكردنی نەماوە .

[٢٧٣] _ كـل داء لـە داء: واتـە سـەراپای عەیبـەكانی خەڵـكی تیـدا كۆیـە، (شـجك): واتـە یـا سـەری خێزانەكانی دەشكێـنیّ یا ئەندامێكی لەشیان دەقرتێنیّ، یا بۆ خێـزانەكانی هەردوكیان بە جیّ دێـنیّ.

مَسُّ أرنَبْ، (٢٧٤) والريح ريحُ زَرْنَبْ. (٢٧٥). (قالت التاسعة): زوجي رفيعُ العِماد، طويلُ النِّجاد، عظيمُ الرَّماد، قريبُ البيت من الناد. (٢٧٦). (حەوتەمیان گوتی): مێردەكەم بێتوانا و پەكەوتووە، یا (گومڕایە) گێلە، دەردی هەموو خەڵكی تێدا كۆیە، یا سەرت دەشكێنێ یا ئەندامێكی لەشت دەقرتێنێ، یا هەردوكیانت بە كۆ بۆ بەجێ دێنێ. (هەشتەمیان گوتی): مێردەكەم: بەركەوتنی (مس) وەكو بەركەوتنی كەروێشكە لە نەرم و شلیدا، بۆنیشی بۆنی (زەڕنەبە). (نۆیەمیان گوتی): مێردەكەم: كۆڵەكەیماڵەكەی بەرزە، هەڵواسەری شمشێرەكەی (حمائل السیف) درێژە، خۆڵەمێشی گەورەیە،ماڵیشی لە یانەوە نزیكە. (قالت العاشرة): زوجي مالك، (٢٧٧) وما مَالِكُ؟ مَالِكُ خير من ذلك، له إبل كثيرات المبارك، (٢٧٨) قليلات المسارح، (٢٧٩) إذا سمعن صوت المِزْهَر أيقنَّ أنهن هَوالك. (٢٨٠)

---

[٢٧٤] _ مس أرنب: واتە دەست بەركەوتنی (مس) مێردەكەی وەكو بەركەوتنی كەروێشكە لە نەرم و نیانیدا.

[٢٧٥] _ ريح زرنب: زرنب جۆرێكە لە ڕووەكی بۆن خۆش، ماناكەشی بە گشتی ئەوەیە كە بە ڕەوشت بەرزی و چاكێتی ژن و مێردایەتی و نەرم و نیانی وەكو نەرمونیانی كەروێشك وەسفی كردوە، بۆنی جەستەی یا جل و بەرگەكەشی بە بۆنی خۆش چواندوە، پێشدەچێت مەبەستی بە چاكێتی ستایشكردنی (ثناء) بێت لە نێو خەڵكیدا.

[٢٧٦] _ العماد: لە بنچینەدا ستونێكە ماڵەكەی لە سەر دەوەستێ، لە جیاتی ڕەسەنی و وچاخزادەیی بە كاریهێناوە. (النِجاد): بكسر الجيم: هەڵواسەری شمشێرە (حمائل السيف). لە جیاتی باڵابەرزی بەكاریهێناوە. بۆ ئامازەدان كە خاوەن شمشێرەو لەبەر ئەوە ئامازەی بە ئازایەتی و دلێری كردوە. (الرماد): واتە خۆڵەمێشی لە جیاتی بەخشندەیی زۆر بەكارهێناوە كە لە پێویستیەكانی میوانداریە، ئەوەش پێویستی بە زۆری خۆڵەمێش و بەردەوامی سوتەمەنی ئاگرەكەی دەكات. (الناد) أصله النادي حذفت الياء للسجع. جێگەیەكە پیاو ماقوڵانی تێدا كۆدەبنەوە بە مەبەستی دووان و ڕاوێژكردن. ئەمەش سیفەتی خانەدانە كەوا ماڵەكانیان نزیك بە یانە دروست دەكەن بۆ ئەوەی میوانەكان زیاتر بێن بە سەریاندا.

[٢٧٧] _ زوجي مالك: واتە مێردەكەم ناوی مالكە. (خير من ذلك): واتە زۆر چاكترە لەوەی من دەربارەی دەیلێم، ئامارەكردنێكی تێدایە كەوا مێردەكەی لە سەرووی وەسفكردنێوەیەتی بە بەخشندەیی و سنگ فراوانی.

[٢٧٨] _ المبارك جمع مبرك: شوێنی چۆك دادان و یخدانی وشترە.

(قالت الحادية عشرة): زوجي أبو زَرْعٍ، (٢٨١) وما أبو زَرْعٍ؟ أناسَ (٢٨٢) من حُليٍّ أذنيَّ، (٢٨٣) وملأَ من شحْمٍ عَضُدَيَّ،(٢٨٤) وبَجَّحَني فبجحَتْ إليَّ نَفْسِي،(٢٨٥) وجدني في أهل غُنيمةٍ بِشَقٍ، (٢٨٦) (دەیەم گوتی): مێردەكەم ناوی (مالكە)، بەڵام چ مالكێك؟ مالك زۆر چاكترە لەوەی باسیدەكەم، وشترەكانی مۆڵگەی چۆكدادانیان زۆرە، كەمیان دەچن بۆ لەوەڕ، هەركات دەنگی لێدانی (عودیان) بیست دڵنیا دەبن سەر بڕاون. (یازدەیەمیشیان گوتی): مێردەكەم (ئەبو زەرع) ە، بەڵام چ (ئەبو زەرع)ێك؟ لە خشڵەكانی گوێی دەلەراندمەوە، بازووی قەڵەو پڕ بەز كردبووم، دڵخۆشی كردبووم تا بە خۆم دڵخۆش بووم، لە نێو خاوەن مەڕێكی كەم و سەختگوزەراندا دەریهێنام و، فجَعَلني في أهل صَهيلٍ وأطيطٍ ودائسٍ ومُنَقٍّ، (٢٨٧) فعنده أقول فلا أقبَّح،

---

[٢٧٩] _ قليلات المسارح: واتە وشتری زۆرە ئەگەر یخ بدرێن و، ئەگەر بنێردرێن بۆ لەوەڕگا كە من لە بەر یخدراوی زۆربەیان لە جێگەكانیاندا بۆ میوا ن، یا نزیك بە ماڵەوە دایاندەنێت هەتا ئەگەر میوانی هات ئامادەبن بۆ سەربڕین.

[٢٨٠] _ واتە هەركات وشترەكان دەنگی لێدانی عودیان بیست دڵنیا دەبن سەربڕاون بۆ میوان لەبەر بەخشندەی و دەستبڵاوی خاوەنەكەیان.

[٢٨١] _ زوجي أبو زرع: خێزانەكەی ئەو نازناوەی لێناوە بە هۆی زۆری كشت و كاڵەكانیەوە، دەشگونجێت ئەو نازناوەی لێنابێت بە گەشبینی كردن بە زۆری منداڵەكانیەوە، چونكە (زرع) بە مانای منداڵیش هاتووە.

[٢٨٢] _ أناس بزنة أقام، من النوس: واتە جوڵانەوەی شتێكی شۆڕەوە بوو.

[٢٨٣] _ واتە گوێكانی دەلەراندەوە لە بەر ئەو خشڵانەی پێی جوان كردبونەوە.

[٢٨٤] _ واتە قەڵەوی كردم.

[٢٨٥] _ بجحني فبجحت إلي نفسي: واتە دڵخۆشی كردم تا بە خۆم دڵخۆش بووم.

[٢٨٦] _ غُنيمَة " بالتصغير للتقليل: واتە خاوەن مەڕێكی كەم، (بِشِق)" بالفتح والكسر: پێدەچێت ناوی شوێنێك بێت یا مەبەستی مەینەتی و دەردەسەری بێت چونكە پەروەردگار لە ئایەتی / ٧ سورەتی النحل دا دەفەرمێت: (إلا بشق الأنفس). ماناكەشی بە گشتی واتە لە نێو خاوەن مەڕێكی كەم و سەختگوزراندا دەریهێنام، كە بە نارەحەتی و مەینەتی و ژیان گرانی دەیانگوزەراند.

[٢٨٧] _ واتە هەڵیگرتم بۆ نێو ماڵێكی خاوەن حیلەی ئەسپ و دەنگی وشترو مانگا گەلێكی خەرمان كوت بۆ دەركردنی تۆ و لە گوڵەكەیدا (سنبل). (مُنَقّ) بضم الميم وفتح النون وتشديد

(٢٨٨) وأرقُـد فأتَـصبَّـح، (٢٨٩) وأ شرب فأتَـقَـمَّـح، (٢٩٠) أمّ أبي زرع، فما أمُّ أبي زرع؟ (٢٩١): عُكومُها رَداحُ، (٢٩٢) وبيتها فَـسَاحُ،(٢٩٣) خستميه نێو ماڵێـكی خاوەن حیلەی ئەسپ و دەنگی (أطیط) وشترو مانـگاگەلێـكی خەرمان كوت و كرێـكارانی خاوێـنكارو پاكارانی تۆو، لە لایدا قسە دەكەم و سەرزەنشت ناكرێـم، دەخەوم و بەیانی خەو دەكەم، دەخۆمەوە تا پاراو دەبم و سەرم بەرز دەكەمەوە. دایكی ئەبو (زەرع): بەڵام كام دایكی ئەبو (زەرع)؟ تورەكەكانی خواردەمەنی قورس و هەمەچەشن و پڕن، ماڵەكەی بەرپان و فراوانە. أبن أبي زرع، فما ابن أبي

---

القاف: ئەو كەسانەن بە بێـژنگ تۆوەكە پاك دەكەن و خاوێـن دەكەنەوە لە كـا و شتيتر، واتـە خاوەن كشت و كاڵ و تۆوێـكی پاكن.

مەبەستیش لەوانە بە گشتی: ئـەو ژنـە لـە ماڵێكدا بـوو بـە هـەژاری و ناڕەحـەتی دەیانـگوزەراند پاشان ئەو پیاوە گواستیەوە بۆ ماڵـێـكی پـڕ بـە سـامان و زۆرێـتی. چـونكە خـاوەن ئـەسـپ و ووشترو هیتریش بوون.

[288] _ فعنده أقول فلا أقبح: واتە هەر قسـەیەك بـڵێـم سەرزەنـشتم ناكـات چونكە ڕێـزدار و قەدردارم لە دڵـیداو، لە بەر ئەوەی قسەكانم بە جێـدار و باش دادەنێـت.

[289] _ أرقد فـأتصبح: واتە دەخەوم تـا بـەیانی خـەویش دەكـەم ئـەوجا لـە گەڵـمدا بـە بـەزەیی و میهرەبان دەبێت و بە ئاگام ناكاتاوە بـۆ خزمـەتكردن و پیشـەو فرمـانی، چـونكە خۆشەویستم لـە دڵـیداو، كارەكانی بە خزمەتكارانی ڕادەپەڕێـنێـت كە خزمەتی ئەو منیش دەكەن.

[290] _ أشرب فـأتـقمح: واتە تێـر ئـاو دەبم و وازی لێـدێـنم لـە بـەر زۆرێـتی لای ئـەو پیـاوە و، كەمێـتی لای كەسانی تر، بە گشتی ماناكەشی ئەوەیە كە لە لایـەن مێـردەوە ئـازار نـەدراوە لـە هـەردوو لایـەنی خـەوتن و خواردنـەوەوە. گـوتم لـە ؛ ((النهایـة))دا بـەم چەشـنە باسـكراوە ؛ (( ویستویەتی بڵێت دەخواتەوە تا تێـر ئاو دەبێـت و سەری بەرز دەكاتەوە. ویقـال: قمـح الـبعیر یقمح إذا رفع رأسه بعد الري، ویروی بالنون.

[291] _ أم أبـي زرع: ویسـتویەتی بـە دایكـی مێـردەكەیدا هەڵـدات ( مـدح ) پـاش پیاهەڵـدانی مێـردەكەی.

[292] _ عكومها رداح: واتە تورەكەی خواردەمەنیەكانی گەورەیە _ قورسە _ زۆرە ، (العكوم) جمع (عكم) بریتیە لەو تورەكەیەی خواردەمەنی تێـدایە ، (الرَداح) بفـتح الـراء: واتـە گـەورەو قـورس و زۆر.

[293] _ بیتها فَـساح بفتح الفاء: واتە فراوان و، فراوانی ماڵـیش بەلگەی زۆرێـتی سامانە.

زرع؟(٢٩٤): مضجِعه كَمَسَلِّ شَطْبةٍ، (٢٩٥) وتُشْبِعُه ذِراع الجَفرة، (٢٩٦) بنت أبي زرع، فما بنت أبي زرع؟ طَوع أبيها، وطَوع أمِّها، (٢٩٧) وملءُ كسائها، (٢٩٨) وغَيظ جارتها، (٢٩٩) جارية أبي زرع، فما جارية (٣٠٠) أبي زرع؟ لا تَبُثُّ حديثنا تَبثيثاً، (٣٠١) ولا تَنْقُثُ ميرتنا تنقيثاً، (٣٠٢) ولا تَملأ بَيتنا تَعشيشاً، (٣٠٢) كوڕی (ئەبی زەرع)، بەڵام کام کوڕی (ئەبی زەرع)؟ کەم گۆشتو کەمەر وردە وەکو (سەعفی) دارخورمای پاکراو لە گەڵاکەی، دەستی مێ کاریلەیەك تێری دەکات. کچەکەی (ئەبی زەرع)، بەڵام کام کچی (ئەبی زەرع)؟

---

[٢٩٤] _ ابن أبي زرع: پاشان دەستی کرد بە پیاهەڵدانی (مدح) کوڕەکەی ئەبی (زەرع).

[٢٩٥] _ مَسَل، بفتح الأول والثاني: واتە پاکراو.(شَطْبة) بفتح الشين وسكون الطاء: بریتیە لەو بەشەی قلیشراوە لە سەعفی دارخورما. ماناکەشی بە گشتی ئەوەیە کە شوێنی پاڵکەوتنی کە لاتەنیشتێتی وەکو سەعفی دارخورمایە لە وردیدا چونکە کوڕێکی لاوازی کەم گۆشتی کەمەر وردە هاوشێوەی سەعفی دارخورمای پاکراوە لە توێکڵ و گەڵاکەی.

[٢٩٦] _ تُشبعه، بضم التاء لأنه من الإشباع: واتە تێری دەکات، (الجَفْرة) بفتح الجيم وسكون الفاء: مێ کاریلەی بزنە، واتە لە ڕوباریکەڵە و ناسك و کەم گۆشتە بە یەك چەشن و بە بەردەوامی، ئەمەش لە سیفەتەکانی پیاوی بەخشندەیە.

[٢٩٧] _ واتەگوێڕایەڵی بابی و، گوێڕایەڵی دایکێتی ئەو پەڕی گوێڕایەڵی.

[٢٩٨] _ ملء کساءها: واتە پڕ بە جلەکەیەتی چونکە گەورە و قەڵەوە، ئەمەش لە ژناندا سیفەتێکی ستایشکراوە.

[٢٩٩] _ غيظ جارتها: مەبەستی هەوێکەیەتی، واتە جێگەی قینی هەوێکەیەتی چونکە ڕەشکی پێدەبرد (غيرتها منها) بە هۆی زیاتر جوانی و شۆخ و شەنگی و باشێتی بە بەراورد لە گەڵ ئەودا.

[٣٠٠] _ جارية أبي زرع: واتە خزمەتکارەکەی ئەبو زەرع.

[٣٠١] _ لا تبث حديثنا تبثيثا: واتە ئەو قسانەی لە نێوان خۆماندا دەیکەین بڵاو ناکاتەوە بەم لاو بەو لادا چونکە لە خوا ترسە.

[٣٠٢] _ ولا تنقث ميرتنا تنقيثا: واتە خواردنەکانمان ناگوێزێتەوە بەم لاو بەو لادا چونکە دەستپاکو پارێزەرە، (تَنْقُث) بفتح التاء وضم القاف والنون الساكنة: واتە ناگوێزێتەوە، (الميرة) بكسر الميم: واتە خواردەمەنی.

[٣٠٢] _ ولا تملاء بيتنا تعشيشا: واتە ماڵەکەمان پڕ ناکات بە خۆڵ و خاشاك و بیکات بە هێلانەی باڵندە، بەڵکو چاکی دەکات و پاکی دەکاتەوە چونکە زرنگ و ئازایە.

گوێڕایەڵی بابیەتیو، گوێڕایەڵی دایکێتی، قەڵەو پڕ بە جلەکەیەتیو، جێگەی قینی هەوێکەیەتی. کەنیزەکی (ئەبی زەرع)، بەڵام کام کەنیزەکی (ئەبی زەرع)؟ نهێنی و قسەکانمان ناباتە دەرەوەو بڵاو ناکاتەوە، خواردنەکانمان ناگوێزێتەوە بەم لاو بەو لادا بە گواستنەوە چونکە دەستپاکو پارێزەرە، ماڵەکەمان پڕ ناکات بە زبڵو کسکدراو بیکات بە هێلانەی باڵندە.

قالت: خرج أبو زرع (٣٠٤) والأوطاب تُمْخَضُ، (٣٠٥) فَلقي امرأةً مَعَها وَلَدَان لَها كالفَهدَين، (٣٠٦) يلعبان من تحت خَصْرها بِرُمَّانتين، (٣٠٧) فَطَلقَني ونَكَحها، فنكحت بَعده رجلاً سَرِيًّا، (٣٠٨) رَكِبَ شَرِيًّا، (٣٠٩) وأخَذ خَطِيًّا، (٣١٠) وأراح (*) عَليَّ نعما ثَرِيًّا، (٣١١) وأعطاني من كل رائحةٍ زوجاً، (٣١٢) گوتی: ڕۆژێك سەر لە بەیانی (ئەبو زەرع) چووە دەرەوەو مەشکەکان دەژندران، چاوی بە ئافرەتێك کەوت دوو کوڕی هاوشێوەی دوو پڵنگی خۆی پێ

---

[304] _ خرج أبو زرع: ڕۆژێك لە ڕۆژان (ئەبو زەرع) بە گەشتێك چووە دەرەوە.

[305] _ والأوطاب تُمْخَضُ: (الأوطاب) جمع وطب واتە لە بارودۆخێکدا کە مەشکە دۆکان، (تُمْخَضُ) واتە دەژەندران بۆ ئەوەی لە دۆ کەرە دەربهێنرێت. مەبەستیش ئەوەیە لە کاتی دۆ زۆریدا چووە دەرەوە کە باشترین بارودۆخەکانی عەرەبە بۆ بازرگانی.

[306] _ معها ولدان لها كالفهدين: واتە هەردوو کوڕەکەی چواندوە بە پڵنگ لە بازدان و یاریکردن و خێرایی جولانەوەیاندا.

[307] _ يلعبان من تحت خصرها برمانتين: واتە خاوەن دوو مەمکی بچوك هاوشێوەی دوو هەنار، واتە هەردوو کوڕەکەی بە مەمکی دایکیان یاریان دەکرد کە لە دوو هەنا ر دەچوون.

[308] _ سَريا: واتە لە پیاو ماقوڵانی خەڵك و شەریفەکانیان بوو.

[309] _ شَريا: واتە ئەسپی تیژڕەو، کە ڕێ دەکات بە بێ ماندوبون.

[310] _ خَطيا: دەگەڕێتەوە بۆ (الخط). دێیەکە لە کەناری دەریای عومان ڕمی تێدا دروست دەکرا.

(*) قلت: الأصل (راح)، وهو خطأ مخالف لما في((الصحيحين)) و ((النهاية)).

[311] _ أراح: واتە دوای خۆر ئاوابوون دەیانیکردە ژوورەوەو منیش دڵخۆش دەبووم. (النعم) بریتیە لە ووشترو مەڕو مانگا، (ثريا) من الثروة: واتە ماڵ و سامانی زۆر.

[312] _ أعطاني من كل رائحة زوجاً: واتە لە هەر جووتە ئاژەڵێك دەچووە ژوورەوە دوای خۆرئاوابوون جووت جووتی پێ بەخشیم.

وو، لە ژێــر کەمریەوە بە دوو هەنار یاریان دەکرد، ئەوە بوو منی تەڵاقداو ئەوی مارە کرد، پاش (ئەبو زەرع) شووم بە پیاوێــکی ئابڕومەندو پایە بەرز کرد، سواری ئەسپی تیژ ڕەو دەبوو، ڕمی (خطي) بە دەستەوە بوو، سەر لە ئێـواران نیعمەتێـکی بێـشوومارى لە مەڕ و مانـگاو وشتری بۆ دەکردمە ژوورەوە،لە هەر جۆرە ئاژەلـێـش جووتێــکی دامیّ، وقال: کُـلي أُمَّ زرع! ومِـيري أهـلَـك. (٣١٣) فـَلو جمعت كل شيء أعطانيه ما بَـلغ َ أصغرَ آنيةِ أبي زرع. قالت عائـشة رضي الله عنها: فقال لي رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((كنتُ لَـكِ كأبي زرع لأمٌ زرع)). (٣١٤)پێشی گوتم (دایکی زەرع) بخۆو، بەشی کەس و کاریشت بدە، ئەگەر هەموو ئەو شتانەی ئەو پێیداوم کۆکەمەوە بە لامەوە ناگاتە ئاستی بچوکترین قاپی (ئەبو زەرع). عائیشە ڕەزای خوای لێبێت فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ((من بۆ تۆ وەکو باوکی زەرع وام بۆ دایکی زەرع)).

---

[٣١٣] _ واتە ئەو پیاوەی پاش (باوکی زەرع) بو بە هاوسەری پێــی گوت: (دایکی زەرع) چ ئارەزوو دەکەی بخۆو بەشی کەسوکارتیش بدە.

[٣١٤] _ واتە لە خۆشەویستی و بەخشیندا، نەك لە جیابوونەوەو نکۆلی کردندا.

## ٣٩ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە نوستنی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح٢١٦ _ عن البراء بن عازب: أن النبي صلى الله عليه وسلم كان إذا أخذ مَضْجِعه وَضَعَ كَفَّه اليمنى تحت خَدِّه الأيمن وقال:((ربِّ قِني عذابك، يومَ تَبْعَث (وفي رواية: تَجْمع) عبادك)).

٢١٦ _ لە بەرائی كوڕی عازبەوە: هەركات پێغەمبەری خوا ﷺ بنووستبایە دەستی ڕاستی دەخستە ژێر ڕوومەتی ڕاستیو دەیفەرموو: ((پەروەردگارا بمپارێزە لە سزاكەت لەو ڕۆژەدا كە بەندەكانت زیندوو (لە (ڕیوایە)تێكدا كۆ) دەكەیتەوە)).

صحيح ٢١٧ _ عن حذيفة*قال: كان النبي صلى الله عليه وسلم إذا أوى إلى فراشه قال: ((اللهم باسمك أموت وأحيا)). وإذا استيقظ قال: ((الحمد لله الذي أحيانا بعد ما أماتَنا وإليه النشور)).

٢١٧ _ لە حوذيفەوە فەرموويەتی: هەركات پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ نووستن بچوایەتە نوێنەكەیەوە دەیفەرموو: ((بە ناوی تۆوە پەروەردگارا دەمرمو دەژێم)). وە ئەگەر بە ئاگاش بهاتایەوە دەیفەرموو: ((سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی ژیاندینیەوە دوای ئەوەی كە مراندینی و زیندووبونەوەش هەر بۆ لای ئەوە)).

---

[٢١٦] _ أخرجه المؤلف في ((الدعوات)) برقم ٣٣٩٦.

(قلت : وقال : ((حديث حسن غريب من هذا الوجه)). ثم أنه أختلف في إسناده على أبي إسحاق السَّبيعي، وقد شرحت ذلك في ((الصحيحة)) (٢٧٠٣) ورجحت صحته من طريق الثوري عنه، وذكرت له بعض الشواهد).

[٢١٧] _ أخرجه المؤلف في ((الدعوات)) برقم ٣٤١٣ والبخاري فيه وفي ((التوحيد)) وأبو داود في ((الأدب)) وابن ماجة في ((الدعوا ت)).

صحيح ٢١٨ _ عن عائشة قالت: ((كان رسولُ الله صلى الله عليه وسلم إذا أوى إلى فراشه كُلَّ ليلةٍ جمع كفيه فَنَفَثَ فيهما، وقرأ فيهما (قل هو الله أحد) و (قل أعوذ برب الفلق) و (قل أعوذ برب الناس)، ثم مَسَحَ بهما ما استطاعَ من جسدِه، يبدأ بهما رأسَه ووجهَه، وما أقبل من جسدِه، يصنع ذلك ثلاثَ مرات)).

٢١٨ _ لە خاتوو عائیشەوە فەرموویەتی: ((هەموو شەوێك پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بچوایەتە نووێنەکەیەوە هەردوو دەستی کۆ دەکردەوەو فوی پێدا دەکردن‌و، سورەتەکانی (قل هو الله أحد)و (قل أعوذ برب الفلق) و(قل اعوذ برب الناس)ی تێدا دەخوێندن، پاشان دەستی دەهێنایە سەر ئەو شوێنانەی لەشی کە لە توانایدا بوو بە سەری‌و دەموچاوی‌و پێشەوەی لەشی دەستی پێدەکرد، ئەوەی سێ بارە دەکردەوە)).

صحيح ٢١٩ _ عن أنس بن مالك: أن رسول الله صلى الله عليه و سلم كان إذا أوى إلى فراشه قال: ((الحمد لله الذي أطعَمَنا وسَقانا، وكفانا وآوانا، فكم مِمَّنْ لا كافِيَ له ولا مُؤْوِيَ)).

٢١٩_ لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکات بۆ نووستن بچوایەتە نووێنەکەیەوە دەیفەرموو: ((سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی تێر نان‌و ئاوی کردین‌و، پێویستیی نەخستینە یەکێکی ترو هەر ئەویشمان بەسە کەوا داڵدەی داوین، چونکە کەسانێك تەنها پەروەردگار بە بەس دانانێن و داڵدەدەریشیان نییە)).

---

[٢١٨] _ أخرجه المؤلف ((الدعوات)) برقم ٣٣٩٩ والبخاري ومسلم وابن ماجة وأبو داود في ((الأدب / باب ما يقول عند النوم)) برقم ٥٠٥٦.

[٢١٩] _ أخرجه المؤلف في ((الدعوا ت)) برقم ٣٣٩٣ ومسلم وأبو داود في ((الأدب)) برقم ٥٠٥٣ والنسائي.

صحيح ٢٢٠_ عن أبي قتادة ((كان النبي صلى الله عليه وسلم كان إذا عَرَّس بليل, اضَطجَعَ على شِقّهِ الأيمن، وإذا عَرَّس (٣١٥) قُبَيل الصبح نصب ذراعه، ووضع رأسه على كفه)).

٢٢٠_ لە ئەبی قەتادەوە: ((هەركات پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەفەرێكدا بە شەو دابەزیایە بۆ پشوودان بە لای ڕاستیدا پاڵدەكەوت‌و، ئەگەر پێشی بەیانیش دابەزیایە باڵی دادەمەزراندو، سەری دەخستە سەر دەستی)).

---

[٢٢٠] _ أخرجه مسلم في ((الصلاة)).

(قلت : برقم (٣١٣) واستدركه الحاكم عليه (١/ ٤٤٥) فوهم، وقد نبه على ذلك الذهبي رحمه الله). پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وسلم لە پشودانی شەوی سەفردا ئەوەی دەكرد چونكە سوور بوو لە سەر بە تەنگەوە هاتنی نوێژی بەیان و، لە هەمان كاتیشدا فێركردنێكە بۆ سەرجەم موسڵمانان.

[٣١٥] _ عَرَّسَ : واتە دابەزی، (التعريس)یش دابەزینە هەر كاتێك بێت شەو یان ڕۆژ.

## ٤٠_ بەشی ئەوەی سەبارەت بە خواپەرستی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ٢٢١_ عن المغيرة بن شعبة رضي الله عنه قال: صلى رسول الله صلى الله عليه وسلم حتى انتفخت قدماه، فقيل له: أتتكلف هذا وقد غفر الله لك ما تقدم من ذنبك وما تأخر؟(٣١٦) قال: ((أفلا أكون عبداً شكوراً)).

٢٢١ _ لە موغیرەی كوڕی شوعبەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەكرد تا پێكانی هەڵدەتۆقا، پێی گووترا: بۆ ئەوها دەكەیت ئایا خوای تعالی لە تاوانەكانی ڕابردوو ئایندەشت خۆش نەبووە؟ فەرمووی: ((ئایا نابێ بەندەیەكی سوپاسگوزار بم)).

حسن٢٢٢ _ عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: صحيح كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يصلي حتى تَرِمَ (وفي رواية: تَنْتَفِخ /٢٦٠) قدماه. قال: فقيل له:

---

[٢٢١] _ أخرجه البخاري في ((صلاة الليل))، وفي ((الرقاق)) و((التفسير)). ومسلم في ((صفة القيامة والجنة والنار)) والمؤلف في ((الصلاة)) والنسائي وابن ماجة فيه.

(قلت : وقال المؤلف (٤١٢) : ((حديث حسن صحيح)). ورواه ابن سعد (٢/٢٠٩) وابن خزيمة ١١٨٢)

[٣١٦] _ قال تعالى في سورة الفتح : ((إنا فتحنا لك فتحاً مبيناً، ليغفر لك الله ما تقدم من ذنبك وما تأخر). واتە خوای تعالی لە سورەتی (الفتح) دا دەفەرموێت : بەڕاستی ئێمە سەركەوتنێكی ئاشكەرامان پێبەخشیت (مەبستی ڕێكەوتنی حودەیبیە بوو) تا لە هەموو تاوانەكانی ڕابردوو ئایندەشت خۆش بێت. تەفسیری ئاسان. برهان محمد أمين.

[٢٢٢] _ قلت: إسناده حسن صحيح، ومن هذا الوجه أخرجه ابن خزيمة في ((صحيحه)) برقم (١١٨٤)، وإليه وحده عزاه المنذري في ((الترغيب)) (١/ ٢١٥)، وعزاه الحافظ في ((الفتح _ قيام الليل)) إلى البزار وحده، وإسناد الرواية الأخرى حسن أيضا، وأخرجه ابن ماجة (١٤٢٠) من هذا الوجه، والنسائي من طريق أخرى عن أبي هريرة بلفظ: ((كان يصلي حتى تزلع _ يعني تشقق_ قدماه)) وسنده صحيح. واتە ئیمامی نەسائی لە ڕێگەیەكی ترەوە و بە كورتی لە ئەبی هوریرەوە دەگێڕێتەوە بە بێژەی (لفظ) : پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی دەكرد تا پێكانی دەقلیشان. (تنبيه) هذا الحديث _ بروايتيه _ أخرجه المعلق على الأصل بنفس تخريجه المتقدم

أتفعل هذا وقد جاءك: أن الله قد غفر لك ما تقدم من ذنبك وما تأخر؟ قال: ((أفلا أكون عبداً شكوراً)).

٢٢٢ _ لە ئەبی هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد تا پێکانی دەئاوساو (لە ڕیوایەتێکدا: هەڵدەتۆقا / ٢٦٠). ئەبو هورەیرە فەرمووی: پێی گوترا: بۆ ئەمە جێبەجێدەکەیت و بۆت دابەزێندراوە: بە دڵنیای خوای تعالی لە تاوانەکانی ڕابردوو ئایندەشت خۆش بووە؟ فەرمووی: ((ئایا بەندەیەکی سوپاسگوزار نەبم)).

صحيح ٢٢٣_ عن الأسود بن يزيد قال: سألت عائشة رضي الله عنها عن صلاة رسول الله صلى الله عليه وسلم بالليل: فقالت: ((كان ينام أوَّل الليل ثم يقوم، فإذا كان من السَّحَر (٣١٧) أوتر ثم أتى فراشه، فإذا كان له حاجة (٣١٨) ألمَّ بأهله، فإذا سمع الأذان وَثَبَ، فإن كان جنباً أفاض عليه الماء وإلا توضأ وخرج إلى الصلاة)).

---

لحديث المغيرة، فأوهم أنه عندهم جميعاً من حديث أبي هريرة أيضا! وليس كذلك إلا عند من ذكرنا منهم، وعلى التفصيل الذي بينا.

[٢٢٣] _ أخرجه المؤلف في ((الصلاة)) برقم ٤٨ و﴿ سائر﴾ أصحاب الكتب السته.

(قلت : إنما رواه منهم بهذا التمام مسلم في (المسافرين) (١٢٩) والنسائي في ((قيام الليل)) والبخاري في ((التهجد)) (رقم _ ٥٩٧_ مختصره). وسائر السته إنما رووه مختصراً جداً بلفظ : ((كان ينام وهو جنب ولا يمس ماء)). والمؤلف إنما رواه في ((الطهارة)) (١١٨) وليس في ((الصلاة)) (٤٨)! وقد أعله بما لا يقدح كما هو مبين في ((صحيح أبي داود)) (٢٢٣). ورواه أحمد أيضاً ٦/ ١٧٦ بتمامه).

[٣١٧] _ السحر : كۆتایی شەو سەرەتای بەیانەو (أوتر) : واتە نوێژی ویتری دەکرد، جار بە جار بە سێ ڕکات وەکو ئەوەی لە فەرموودەی ژمارە (٢٣٤) داهاتووە، بە یەك دانیشتن و سڵاودانەوەیەك لە کۆتایدا وەکو ئەوەی لە هەندێ فەرموودەی نێو کتێبی (صلاة التراويح)دا ڕوون کراوەتەوە و هەندێ جاریش بە تەنها ڕکاتێکی جیاکراوە لە ڕکاتەکانی پێشەوەی وەکو ئەوەی خاتوو عائیشە لە فەرموودەیەکی داهاتوودا بە ژمارە (٢٣٥) باسی دەکات.

[٣١٨] _ إذا كان له حاجة : واتە پێویستی جووت بوون لە گەڵ خێزانەکەیدا.

٢٢٣_ لە ئەسوەدی کوڕی یەزیدەوە فەرموویەتی: سەبارەت بە شەو نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ لە عائیشەم پرسی؟ ئەوەبوو فەرمووی: ((سەرەتای شەو دەنوستو پاشان هەڵدەستا، لە کاتی پارشێودا نوێژی ویتری دەکردو دەهاتەوە سەر نوێنەکەی، ئەگەر پێویستیەکی هەبووایە دەچووە لای خێزانەکەی، ئەگەر گوێبیستی بانگ بوایە ڕادەپەڕی و، ئەگەر لەشگرانیش بوایە ئاوی بە خۆیدا دەکردو ئەگەریش نا دەست نوێژی دەگرتو دەچوو بۆ نوێژ.

صحيح ٢٢٤ _ عن ابن عباس: أنه بات عند ميمونة وهي خالته (٣١٩) قال:((فاضطجعت في عَرْضِ الوسادة، واضطجع رسول الله صلى الله عليه وسلم في طولها، فنام رسول الله صلى الله عليه وسلم حتى انتصف الليل، أو قبله بقليل أو بعده بقليل، فاستيقظ رسول الله صلى الله عليه وسلم، فجعل يمسح النوم عن وجهه، وقرأ العشر الآيات الخواتيم من سورة (آل عمران)، ثم قام إلى شنّ(٣٢٠) مُعَلَّقٍ، فتوضأ منها، فأحسن الوضوء، ثم قام يصلي. (قال عبدالله بن عباس): فقمت إلى جنبه فوضع رسول الله صلى الله عليه وسلم يده اليمنى على رأسي ثم أخذ بأذني اليمنى ففتلها فصلى ركعتين، ثم ركعتين، ثم ركعتين، ثم ركعتين، ثم ركعتين، ثم ركعتين. (قال مَعْنُ: ست مرات)، ثم اضطجع (وفي رواية: نام حتى نَفَخَ، وكان إذا

---

٢٢٤ _ وأخرج المؤلف في ((الصلاة)) برقم ٢٣٢ قسماً منه، وأخرجه البخاري ومسلم وغيرهم. (قلت : منهم أبو داود، وهو مخرج في ((صحيحه)) (١٢٣٧)، والقسم الثاني الذي أخرجه المؤلف إنما هو قيام ابن عباس بجنبه صلى الله عليه وسلم، وإيقافه إياه عن يمينه صلى الله عليه وسلم. وفي رواية لأحمد (بحذائه). وسنده صحيح. فأنظر ((الصحيحة)) (٦٠٦) و((مختصر البخاري)) (٩٣) و((صحيح أبي داود)) (١٢٣٧)، لێرەوە سونەتێتی وەستانی نوێژکار بە ڕێکی بە تەنیشتی ئیمامەوە ڕوون دەبێتەوە، بە پێچەوانەی ئەوەی ئەمڕۆ خەڵکی لە سەری ڕاهاتوون، ئیتر دەبێت ئاگادار بیت.

٣١٩ _ چونکە لە بابەوە خوشکی دایکی بوو.

٣٢٠ _ واتە کونەیەکی کۆنی هەڵواسراو بۆ ساردکردنەوەی ئاو.

نام نَـفَـخَ / ٢٥٥) حتى جاءه المؤذن فقام فصلى ركعتين خفيفتين (٣٢١) ثم خرج فصلى الصبح)). (وفي الرواية الأخرى: ((فأتاه بلال فآذنه بالصلاة، فقام وصلى ولم يتوضأ))).

٢٢٤ _ لە ئـیبنو عەباسەوە: كە شەوێك لای مەیمونەی پووری نووستبوو" ئیبنو عەباس فەرمووی: من ڕاكشام لە پانی ڕاخەرەكەداو، پێغەمبەری خواش ﷺ لە درێژێكەیدا ڕاكشا، پێغەمبەری خوا ﷺ نووست، هەتا شەو گەیشتە نیوەی، یا پێشی بە كەمێك یا پاشی بە كەمێك، پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاگاهاتو، دەستیكرد بە سڕینی خەوەكە لە دەمو چاویداو، دە ئایەتی كۆتای سورەتی (آل عمران) خوێندەوە پاشان هەڵسا بۆ كونە ئاوێكی شڕی هەڵواسراو دەستنوێژی لێگرت، دەستنوێژێكی چاك، پاشان هەڵسا نوێژ بكات. (عەبدوڵای كوڕی عەباس فەرمووی): لە تەنیشتیدا ڕاوەستام پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی ڕاستی خستە سەر سەرم پاشان گوێی ڕاستی گرتم و بایدا ئینجا دوو ڕكات نوێژی كرد، پاشان دوو ڕكات، پاشان دوو ڕكات، پاشان دوو ڕكات، پاشان دوو ڕكات، پاشان دوو ڕكات. (مەعن فەرموویەتی: شەش جا ر)، پاشان نوێژی ویتری كرد، پاشان ڕاكشا (لە ڕیوایەتێكدا نوست تا پرخەی هات، چونكە كاتێ بنوستایە پرخەی دەهات / ٢٥٥) تا بانـگ بێژەكە هاتە خزمەتی ئەوەبوو هەستاو دوو ڕكاتی سووك نوێژی كرد پاشان چووە دەرەوەو نوێژی بەیانی كرد)) (لە ڕیوایەتەكەی تردا: ((بیلال هاتە خزمەتی و پێی ڕاگەیاند كاتی نوێژە، ئەوەبوو هەستا نوێژی كردو دەستنوێژی نەگرتەوە).

صحيح ٢٢٥_ عن ابن عباس قال: ((كان النبي صلى الله عليه وسلم يصلي من الليل ثلاث عشرة ركعة)). (٣٢٢)

---

[٣٢١] _ ئەو دوو ڕكاتە سوونەتی نوێـژی بەیانە و سوونەتیشە بە سووكی ئەنجام بدرێـت، سـوودی فەرموودەكەش لەوەدایـە كـە سـوونەتەكان لـە ماڵـەوە ئـەنجام بدرێـت باشـترە بـەدەر لەوانـەی جیاكراونەتەوە.

[٣٢٢] _ أخرجه المؤلف في ((الصلاة)) برقم ٤٤٢ والبخاري ومسلم وغيرهم.

(قـلـت : وقال المؤلف : ((حديث حسن صحيح)).

٢٢٥_ لە ئیبنو عەباسەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەودا سیازدە ڕکات نوێژی دەکرد))

صحيح ٢٢٦ _ عن عائشة: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم كان إذا لم يصل بالليل منعه من ذلك النوم، أو غَلَبَتْه عيناه صلى من النهار ثِنْتَيْ عشرة ركعة)).

٢٢٦_ لە خاتوو عائیشەوە: ((هەرکات پێغەمبەری خوا ﷺ شەو نوێژی نەکردایە، نووستن ڕێگری لێکردایە، یا چاوەکانی خەو دایگرتایە، بە ڕۆژ دوازدە ڕکات نوێژی دەکرد)).

ضعيف ٢٢٧_ عن أبي هريرة: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال:((إذا قام أحدكم من الليل فليفتتح صلاته بركعتين خفيفتين)).

---

[٢٢٢] _ واتە سیازدە ڕکاتی دەکرد بەو دوو ڕکاتە سووکەوە کە لە پێشدا دەیکرد وەکو ئەوەی لە فەرموودەکەی زەیدی کوڕی خالدا ڕوون بۆتەوە کە لە پاش دوو فەرموودەوە دێت، هەروەها فەرموودەکەی خودی ئیبنو عەباس کە لە پێشەوە ئاماژەی پێدرا. هیچ دژکاریەکیش بە دیناکرێت لە نێوان ئەم فەرموودانەو فەرموودەکەی خاتوو عائیشە کە لە دوای سێ فەرموودەی ترەوە دێت و بە ڕوونی ئاشکەرای دەکات کەوا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە شەو نوێژدا یازدە ڕکات زیاتری نەدەکرد. هەروەها هیچ دژکاریەکیش لە نێوان ئەم فەرموودەیەی خاتوو عائیشەو فەرموودەیەکی تریدا بەدی ناکرێت کە بە هەمان بێژەی (لفظ) فەرموودەکەی ئیبنو عەباسە لێرەدا، چونکە مەبەست لە گەڵ ئەو دوو ڕکاتە زیادەی نوێژی بەیانە، یا ئەو دوو ڕکاتەی پێغەمبەری خوا صلى لله عليه و سلم بە دانیشتنەوە دوای نوێژی ویتر ئەنجامی دەدا، بە بەڵگەی چەندین فەرموودەی تر کە لە خاتوو عائیشەوە ڕیوایەت کراوە و هەندێکیشان لە (صحيح أبي داود)دا هاتوون بە ژمارە (رقم ١٢٠٥ و ١٢٣٠ و ١٢٣١).

[٢٢٦] _ وأخرجه المؤلف في ((الصلاة)) برقم ٤٤٤.

(قلت : ومسلم أيضاً في ((المسافرين)) (١٤٠) وقال المؤلف : ((حديث حسن صحيح))، والنسائي أيضاً في آخر ((قيام الليل))).

[٢٢٧] _ وأخرجه مسلم في ((الصلاة)) برقم ٧٦٨ وغيره.

٢٢٧_ لە ئەبی هورەیرەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر یەكێكتان بە شەو هەستا بۆ نوێژكردن با نوێژەكەی بە دوو ڕكاتی سووك دەست پێبكات)).

صحيح ٢٢٨_ عن زيد بن خالد الجهني أنه قال: ((لأَرْمُقَنَّ صلاةَ النبي صلى الله عليه وسلم، فتوسَدت عَتَبَتَه أو فُسْطَاطه، فصلى رسول الله صلى الله عليه وسلم ركعتين خَفيفتين، ثم صلى ركعتين طويلتين طويلتين، طويلتين، ثم صلى ركعتين، وهما دون اللتين قبلهما، ثم صلى ركعتين، وهما دون اللتين قبلهما، ثم صلى ركعتين، وهما دون اللتين قبلهما، ثم صلى ركعتين، وهما دون اللتين قبلهما، ثم أوتر، فذلك ثلاثَ عشرة ركعة)).

٢٢٨_ لە زەیدی كوڕی خالد ی جوهەنیەوە كە فەرموویوی: ((بە دڵنیای تەماشای شەو نوێژی پێغەمبەری خوا دەكەم ﷺ، ئەوە بوو بەر دەرگاكەی یا سەیوانەكەیم كرد بە سەرین، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕكاتی سووك نوێژی كرد، پاشان دوو ڕكاتی زۆر درێژی كرد، پاشان دوو ڕكاتی كرد، كەمتر لەو دوانەی پێشەوەی، پاشان دوو ڕكاتی كرد، كەمتر لەو دوانەی پێشەوەی، پاشان دوو ڕكاتی كرد، كەمتر لەو دوانەی پێشەوەی، پاشان دوو ڕكاتی كرد، كەمتر لەو دوانەی پێشەوەی، پاشان نوێژی ویتری كرد، ئەوەبوو بە سیازدە ڕكات.

صحيح ٢٢٩_ عن أبي سلمة بن عبدالرحمن أنه سأل عائشة رضي الله تعالى عنها: كيف كانَتْ صلاة رسول الله صلى الله عليه وسلم في رمضان؟ فقالت: ما كان

---

(قلت : وقد أختلفوا في إسناده على هشام بن حسان عن أبي هريرة، فبعضهم جعله من قوله صلى الله عليه وسلم كما هنا، وبعضهم من فعله، وهذا هو الأرجح كما هو مبين في ((ضعيف أبي داود))

(٢٤٠)، وهذا أولى مما كنت ذكرته في ((الإرواء)) (٤٥٣) فليُعلم).

[٢٢٨] _ وأخرجه مسلم في ((الصلاة))، وأبو داود فيه، وابن ماجة فيه، ومالك في ((الموطأ)) فيه.

(قلت : وهو في ((صحيح أبي داود)) ١٢٣٦).

[٢٢٩] _ وأخرجه المؤلف في ((الصلاة)) برقم ٤٣٩ والبخاري ومسلم وغيرهم.

رسول الله صلى الله عليه وسلم لـيَـزيدَ في رمضان ولا في غيره على إحدى عَشرةَ ركعة، يصلي أربعاً لا تسأل عن حُسنهن وطولهن، ثم يصلي أربعاً لا تسأل عن حُسنهن وطولهن، ثم يصلي ثلاثاً. قالت عائـشة رضي الله عنها: قلت: يا رسول الله! أتـنام قبل أن توتر؟ فقال: ((يا عائشة إن عَـيْـنَـيَّ تـناما ولا ينام قلبي)).

٢٢٩ _ له ئەبی سەلەمەی کوڕی عەبدولڕحمانەوە، کە لە عائـیشەی پرسیبوو ڕەزای خوای لـێبێت: نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕەمەزاندا چۆن بوو؟ عائیشە فەرمووی: بە دڵنیای پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕەمەزانو بەدەر لە ڕەمەزانیش زیاد لە یازدە ڕکات نوێژی نەدەکرد، چوار ڕکاتی دەکرد سەبارەت بە چاکیو جوانی و درێژی مەپرسە، پاشان چوار ڕکاتی دەکرد سەبارەت بە چاکیو جوانیو درێژی مەپرسە، پاشانیش سیّ ڕکاتی دەکرد. عائـیشە ڕەزای خوای لێبێت فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! پێش ئەنجامدانی نوێژی ویتر دەخەوی؟ ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی عائـیشە چاوەکانم دەنویّ و دڵم ناخەویّ)).

صحيح ٢٣٠_ وعنها رضي الله عنها: ((أن رسول الله صلى الله عليه وسلم كان يصلي من الليل إحدى عشرة ركعة، يوتر منها بواحدة، فإذا فرغ منها اضطجع على شـقِّـهِ الأيمن)).

---

(قـلـت : وصححه المؤلف وغيره، وهو مخرج في المصدر السابق ١٢١٢).

[٢٣٠] _ أخرجه المؤلف في ((الصلاة)) برقم ٤٢٠، والبخاري ومسلم وغيرهم.

(قـلـت : المؤلف إنما ذكره بـالرقم المـذكور معلـقا دون إسـناد، مختصـراً، فالصـواب أن يـذكر بديله رقم (٤٤٠) فإنه أسنده به بتمامه وقال : ((حديث حسن صحيح))، وهو مخرج في ((الإرواء)) (٤١٩) و((صحيح أبي داود)) (١٢٠٦)، وبينت فيه أن ذكـر الاضـطجاع في هـذه الروايـة شـاذ، وأن المحفوظ إنما هو بعد سنة الفجر. واتە شێخ ئـەلبانی فەرموویـەتی ئـەم فەرموودەیـەم لـە (الإرواء) و(صحيح أبي داود)يشدا ( تخريج ) كردوەو تيايانـدا ڕوونم کردۆتـەوە کـە باسـکردنی ڕاکشـان دوای شەونوێژ لەم ( ریوایە ) تەدا ( شاذ )ەو، لە ڕاسـتیدا پـارێزراویش ئەوەیـە کـە دوای سـونەتی نوێـژی بەیانە. ئەم کردارەشی صلى الله عليه و سلم بەڵگەی ( ئیستحبابی ) ڕاکشـانەو جاربـەجاریش وازی لێهێناوە بۆ ڕوونکردنەوەی شیاوێتی وازلێهێنانی.

٢٣٠ _ هەر لە دایكی ئیماندارانەوە ڕەزای خوای لێبێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ یازدە ڕكات شەو نوێژی دەكرد، بە ڕكاتێكیان كۆتایی بە نوێژەكەی دەهێنا، كە تەواو دەبوو بە لای ڕاستیدا ڕادەكشا)).

صحيح ٢٣١_ وعنها قالت: ((كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يصلي من الليل تسعَ ركعاتٍ)).

٢٣١ _ هەر لە دایكی ئیماداارانەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ شەو نوێژی بە نۆ ڕكات دەكرد)).

صحيح ٢٣٢ _ عن حذيفة بن اليمان رضي الله عنه: أنه صلى مع النبي صلى الله عليه وسلم من الليل، قال: فلما دخل في الصلاة قال: ((الله أكبر ذو الملكوت والـجَبَـروت والكِبرياء والعظمة)). قال: ثم قرأ البقرة. ثم ركع، فكان ركوعه نحواً من قيامه، وكان يقول: ((سبحان رَبِّـيَ العظيم، سبحان ربي العظيم)). ثم رفع رأسه، فكان قـيـامُـه نحواً من ركوعه، وكان يقول: ((لِـربِّـيَ الحمد، لربي الحمد)). ثم سجد، فكان سجوده نحواً من قـيامه، وكان يقول: ((سبحان ربي الأعلى، سبحان ربي الأعلى)). ثم رفع رأسه، فكان بين السجدتين نحواً من السجود، وكان يقول: ((رَبِّ اغفر لي، رب اغفر لي)). حتى قرأ (البقرة) و (آل عمران) و (النساء) و(المائدة) أو (الأنعام). (شعبة الذي شك في المائدة و الأنعام).

٢٣٢ _ لە حوذەیفەی كوڕی یەمانەوە ڕەزای خوای لێبێت:كە لە گەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ شەو نوێژی كردبوو، حوذەیفە فەرمووی: كە دەستی بە

---

[٢٣١] _ وأخرجه المؤلف في ((الصلاة)) برقم ٤٤٢ والبخاري ومسلم وغيرهم.

(قـلـت : ومنهم أبو داود بزيادة في متـنه، وهو مخرج في ((صحيحه)) برقم (١١٢١).

[٢٣٢] _ أخرجه المؤلف في ((الصلاة)) برقم ٢٦٢ وأحمد ومسلم وأبو داود وابن ماجة.

(قـلـت : عزوه لهؤلاء خطأ أو على الأقـل تساهل كبير، فإنهم إنما أخرجوه بسياق آخر ليس فيـه الذكر بعد التكبير، والحمد في الأعتدال، والدعاء بين السجدتين. فالصواب عـزوه لأبـي داود مـنهم، ورواه النسائي أيضاً، وهو مخرج في ((صحيح أبي دا ود)) (٨١٨). وقـد أخرجـه بالسـياق الأخـر مختصراً ٨١٦).

نوێژەكە كرد فەرمووی: ((ألله أكبر ئەی خاوەن فەرمانداریێتی بێسنورو موڵكو دەستەڵات و مەزنی)). حوذیفە فەرمووی: پاشان سورەتی (البقرة)ی خوێند. پاشان چوو بۆ ڕكوع، ڕكوعەكەی نزیكی وەستانەكەی بوو، دەیفەرموو: ((پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری مەزنم، پاكو بێگەردی بۆ پەروەردگاری مەزنم)). پاشان سەری بەرز كردەوە، وەستانەكەی نزیكی ڕكوعەكەی بوو، دەیفەرموو: ((سوپاسو ستایش بۆ پەروەرگارم، سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگارم)). پاشان چوو بۆ سجود، سجودەكەی نزیكی وەستانەكەی بوو، دەیفەرموو: ((پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری بەرز و بلـندم، پاك و بێگەردی بۆ پەروەدگاری بەرزو بلـندم)). پاشان سەری بەرز كردەوەو، لە نێوان هەردوو سجودەكەدا وەستا نزیكی سجود بردنەكەی و، دەیفەرموو:((پەروەردگارا " لێم خۆشبە، پەروەرگارا " لێم خۆشبە)). تا سورەتەكانی (البقرة)و (آل عمران)و (النساء)و (المائدة) یا (الأنعام)ی خوێند (شوعبە گومانی هەبوو لە خوێندنی (المائدة) یا (الأنعام)دا).

صحيح ٢٣٣_ عن عائشة رضي الله عنها قالت:((قام رسول الله صلى الله عليه وسلم بآية من القرآن ليلةً)).

٢٣٣ _ لە عائشەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: ((شەوێك پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئایەتێكی قورئان شەو نوێژی كرد))

صحيح ٢٣٤ عن عبدالله (٣٢٣) قال: صَلَّيْت ليلةً مع رسول الله صلى الله عليه وسلم، فلم يزل قائماً حتى هممت بأمر سوءٍ، قيل له: وما هممت به؟ قال: ((هممت أن أقعد وأدَعَ النَـبيَّ صلى الله عليه وسلم!)).

---

[٢٣٣] _ (قلت : إسناده صحيح، رجاله ثقات على شرط مسلم، وشيخ المؤلف أبو بكر محمد بن نافع البصري، قد نسبه إلى جده نا فع، وأسم أبيه (أحمد)، وهو مشهور بكنيته، وفيمن أسم أبيه (نافع) أورده أبن أبي حاتم. والله أعلم. وللحديث شاهد من حديث أبي ذر مفصلا تراه في ((صفة الصلاة)) مخرجاً صححه الحاكم وذكره في الأصل معزواً لأبي عبيد فقط في ((فضائل القرآن))!).

[٢٣٤] _ وأخرجه البخاري في ((الصلاة)) ومسلم فيه، وابن ماجة فيه.

٢٣٤ _ لە عەبدوڵای كوڕی مەسعودەوە فەرموویەتی: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ نوێژم دەكرد، بەردەوام وەستا تا ویستم شتێكی خراپی پێچەوانەی ڕەوشت ئەنجام بدەم، پێی گوترا: ویستت چی بكەی؟ فەرمووی: ((ویستم پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕاوەستاوی بە جێبێڵم و بەدانیشتنەوە نوێژ بكەم))

صحيح ٢٣٥ _ عن عائشة رضي الله تعالى عنها: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم كان يصلي جالسا، فيقرأ وهو جالس، فإذا بَقِيَ من قراءتِه قدرُ ما يكون ثلاثين أو أربعين آيةً قام، فقرأ وهو قائم، ثم ركع وسجد، ثم صنع في الركعة الثانية مثل ذلك)).

٢٣٥ _ لە عائیشەوە ڕەزای خوای تعالای لێبێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ بە دانیشتنەوە نوێژی دەكرد، ئینجا ئەگەر بە ئەندازەی سی یا چل ئایەتی بمابا هەڵدەستاو، بەوەستانەوە دەیخوێند، پاشان ركوع و سجودی دەبرد، پاشان لە ڕكاتی دووەمدا هاوشێوەی ئەوەی دووبارە دەكردەوە)).

صحيح ٢٣٦_ عن عبد الله بن شقيق قال: سألت عائشة رضي الله عنها عن صلاة رسول الله صلى الله عليه وسلم. عن تطوعه؟ فقالت: ((كان يصلي ليلاً طويلاً

---

(قلت : وأحمد أيضاً / ٣٨٥ و ٣٩٦ و٤١٥ و٤٤٠)

[٢٣٣] _ واتە عەبدوڵای كوڕی مەسعود.

(قلت : انظر التعليق الآتي برقم ٣٣٢).

[٢٣٥] _ وأخرجه المؤلف في ((الصلاة)) برقم ٣٧٤ وأبوداود فيه برقم ٩٥٥، والبخاري ومسلم وابن ماجة والنسائي.

(قلت : وقال المؤلف : ((حديث حسن صحيح)). وهو مخرج في ((صحيح أبي داود)) (٨٧٩_ ٨٨٣) من طرق عن عائشة رضي الله عنها). فەرموودەكەش بەڵگەی شیاوێتی ئەنجامدانی هەندێك نوێژی سوونەتە بە دانیشتنەوەو هەندێكیشی بەوەستانەوە، ئەمەش ڕای جمهوری زانایانە.

[٢٣٦] _ أخرجه المؤلف في ((الصلاة)) برقم ٣٧٥ وبقية أصحاب الكتب الستة : أبوداود برقم ٩٥٥.

(قلت : وقال المؤلف : ((حديث حسن صحيح))، وهو مخرج في ((صحيح أبي داود)) ٨٨٢).

قـائماً ، وليلاً طويلاً قاعداً ، فإذا قـرأ وهو قـائم ركَـعَ وَ سَجَدَ وهو قائمٌ ، وإذا قـرأ وهو جالس، ركَـعَ وَ سَجَدَ وهو جالسٌ )).

٢٣٦ _ لە عەبدوڵای كوڕی شەقیقەوە فەرموویەتی: سەبارەت بە نوێژەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ. دەربارەی سوونەتەكانی" لە عائیشەم پرسی ڕەزای خوای لێبێت؟ فەرمووی: ((شەوێكی درێژ بەوەستانەوە نوێژی دەكردو، شەوێكی درێژیش بە دانیشتنەوە، ئینجا ئەگەر بە وەستانەوە بیخوێندبا، هەر بە هەستانەوە دەچەمایەوەو ڕكوعو سجودی دەبردو، ئەگەر بە دانیشتنیشەوە بیخوێندبا، هەر بە دانیشتنیشەوە ڕكوع و سجودی دەبرد)).

صحيح ٢٣٧ _ عن حفصة زوج النبي صلى الله عليه وسلم قالت: ((كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يصلي في سُبْحَتِه (٢٢٤) قاعداً ، ويقرأ بالسورة ويُرَتِّلُها، حتى تكون أطولَ من أطولَ منها)).

٢٣٧ _ لە حەفـصەی خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ لە سوونەتەكانیدا بە دانیشتنەوە نوێژی دەكردو، سوورەتەكەی بە تەرتیلەوە دەخوێند، تا درێژتر دەبۆوە لە سورەتێكی دیكەی درێژتر لە خۆی)).

صحيح٢٣٨ _ عن عائشة رضي الله عنها:((أن النبي صلى الله عليه وسلم لم يَمُتْ حتى كان أكثر صلاته وهو جالس)).

---

[٢٣٧] _ أخرجه المؤلف في ((الصلاة)) برقم ٣٧٣ وأحمد ومسلم والنسائي.
(قلت : وقال المؤلف : ((حديث حسن صحيح)). ورواه أحمد أيضاً (٦ / ٢٨٥).
مەبەستیش ئەوەیە كە ماوەی خوێندنی بۆ سورەتەكە درێژتر دەبۆوە بە بەراورد لە گەڵ سوورەتێكی دیكەی درێژتر لەو سوورەتەی كە دەیخوێند ئەگەر بە خوێندنی ئاسایی و بەبێ تەرتیل بخوێندرایە .

[٢٢٤] _ واتە لە نوێژە سوونەتەكاندا.

[٢٣٨] _ (قلت : إسناده صحيح، رجاله كلهم ثقات رجال الشيخين غير عثمان بن ابي سليمان، فإن البخاري إنما أخرج له تعليقاً واحتج به مسلم، وأخرج حديثه هذا في ((المساجد)) رقم (١١٦) بلفظ : ((... كثير من صلاته وهو جالس)). وكذلك أخرجه أحمد (٦/ ١٦٩)، وله عنده (٦/

٢٣٨ _ لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێبێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ كۆچی دوای نەكرد تا زۆربەی نوێژەكانی بە دانیشتنەوە ئەنجامدا)).

صحيح ٢٣٩_ عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: ((صليتُ مع رسول الله صلى الله عليه وسلم ركعتين قبل الظهر، وركعتين بعدَها، وركعتين بعدَ المغرب في بيته، وركعتين بعدَ العشاء في بيته)).

٢٣٩ _ لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوا لە خۆیو باوكیشی بێت فەرموویەتی: ((لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ پێش نیوەڕۆ دوو ڕكاتم كردو، دوای نیوەڕۆش دووڕكاتو، دوای شێوان دوو ڕكات لە ماڵەكەی خۆیداو، دوای خەوتنانیش دوو ڕكات لە ماڵەكەی خۆیدا))

صحيح ٢٤٠_ وعنه رضي الله عنهما قال: حدثتني حفصة: ((أن رسول الله صلى الله عليه وسلم كان يصلي ركعتين حين يطلع الفجر، وينادي المنادي)). قال أيوب: وأراه (٣٢٥) قال: خفيفتين.

٢٤٠ _ هەر لە هەمان هاوەڵەوە ڕەزای خوا لە خۆی و باوكیشی بێت فەرموویەتی: حەفصە بۆی باس كردم: ((كە پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕكات نوێژی دەكرد كاتی دەركەوتنی بەرەبەیانو، بانگبێژ بانگی دەفەرموو)). ئەیوب فەرموویەتی: بە مەزەندەم ئیبنو عومەر فەرمووی: دوو ڕكاتی سووك.

---

٢٥٧) ومسلم أيضا طريق أخرى بمعناه. وشاهد أم سلمة رواه ابن ماجة (١٢٢٥ و ٤٢٣٧) وابن حبان (٦٣٧) وأحمد (٦/ ٣٠٤ و ٣٠٥و ٣١٩ و ٣٢١ و ٣٢٢) وزاد في رواية ((إلا المكتوبة)). وإسنادهم صحيح على شرط الشيخين).

[٢٣٩] _ أخرجه المؤلف في ((الصلاة)) برقم ٤٢٥ والشيخان.

(قلت : وكذا أبو داود، وقال المؤلف : ((حديث حسن صحيح)). وهو مخرج في ((صحيح أبي داود))١١٧٨).

[٢٤٠] _ أخرجه الشيخان.

[٣٢٥] _ أُراه، بضم الهمزة: واتە بە مەزەندەم و، ئەو كەسەش فەرموویەتی نافیعە.

صحيح ٢٤١_ وعنه أيضاً رضي الله عنهما قال: ((حَفِظت من رسول الله صلى الله عليه وسلم ثمانيَ ركعاتٍ، ركعتين قبلَ الظهر، وركعتين بعدها، وركعتين بعدَ المغرب، وركعتين بعد العشاء. قال ابن عمر: حدثتني حفصة بركعتي الغداة، (٣٢٦) ولم أكن أراهما من النبي صلى الله عليه وسلم)). (٣٢٧)

٢٤١ _ هەر لە هەمان هاوەڵەوە ڕەزای خوا لە خۆی و باببیشی بێت فەرموویەتی: ((هەشت ڕکات نوێژی سوونەت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فێربووم، دوو ڕکات پێش نیوەڕۆ، دوو ڕکاتیش لەپاشیداو، دوو ڕکات پاش شێوان‌و، دوو ڕکاتیش پاش خەوتنان. ئیبنو عومەر فەرموویەتی: حەفصە دوو ڕکاتەکەی پێش بەیانیشی بۆ باس کردم‌و، بەڵام من ئەم دەبینی لەپێغەمبەری خواوە ﷺ کە بیکات))

صحيح ٢٤٢_ عن عبدالله بن شقيق قال: سألت عائشة رضي الله عنها عن صلاة رسول الله صلى الله عليه وسلم؟ قالت: ((كان يصلي قبلَ الظهر ركعتين، وبعدَها ركعتين، وبَعدَ المغرب ركعتين، وبعد العشاء ركعتين، وقبل الفجرِ ثِنتَيْن)).

٢٤٢ _ لە عەبدوڵای کوڕی شەقیقەوە فەرموویەتی: سەبارەت بە نوێژی سوونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە عائیشەم پرسی؟ فەرمووی: ((پێش نیوەڕۆ دوو

---

[٢٤١] _ أخرجه المؤلف في ((الصلاة)) برقم ٤٣٣ والشيخان وغيرهم.
(قلت : وقال المؤلف : ((حسن صحيح))).

[٣٢٦] _ الغداة : واتە نوێژی بەیان .

[٣٢٧] _ چونکە لە ماڵەوە بە ئەنجامی دەگەیاند.

[٢٤٢] _ أخرجه المؤلف في ((الصلاة)) برقم ٤٣٦ ومسلم.
(قلت : وقال المؤلف : ((حديث حسن صحيح)). ورجاله رجال مسلم، لكن هذا قد أخرجه في ((المسافرين)) (١٠٥) وكذا أبو داود (١٢٥١) وأحمد (٦/ ٣٠ و ٢١٦) من طرق عن خالد الحذاء الذي في طريق المؤلف _ عن عبد الله بن شقيق به إلا أنه قال : ((قبل الظهر أربعاً)) وهو المحفوظ، ولفظ المؤلف شاذ، فعزوه لمسلم لا يخفى ما فيه، لا سيما وقد جاء عن عائشة من طرق بلفظ : ((أربعاً)) عند أحمد (٦/٤٣ و٦٣و ١٤٨و٢٣٩) وأحدهما عند البخاري وغيره، وهو مخرج في ((صحيح أبي داود)) (١١٧٩). نعم قد صح بلفظ ((ركعتين)) من حديث ابن عمر في ((الصحيحين)) وغيرهما، وهو مخرج في الأروا ء ٦٢٤).

ڕكاتی دەكردو، دوو ڕكاتیش لەپاشیداو، لەپاش شیوان دوو ڕكاتو، لە پاش خەوتنان دوو ڕكاتو، پێش بەیانیش دووان)).

حسن ٢٤٣_ عاصم بن ضمرة يقول: سألـنا علياً كرم الله وجهه عن صلاة رسول الله صلى الله عليه وسلم من النهار؟ فقال: إنكم لا تطيقون ذلك، قال: فـقـلنـا: من أطاق ذلك منا صلى، فقال: ((كان إذا كانت الشمس من ههنـا كهيئـتها من ههنـا عند العصر صلى ركعتين، وإذا كانت الشمس من ههنـا كهيئـتـها من ههنـا عند الظـهر صلى أربعاً، ويصلي قبل الظهر أربعاً، {وذكر أن رسول الله صلى الله عليه وسلم كان يصليها عند الزوال ويمد فيها / ٢٨٩}، وبعدها ركعتين، وقبل العصر أربعاً، يفصل بين كلّ ركعتين بالتسليم على الملائكة المقربين، والنبيين، ومن تبعهم من المؤمنين والمسلمين)).

٢٤٣_ عاصمـــی كوڕی ضمرە دەفەرموێت: سەبارەت بە نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕۆژ لە (علی) مان پرسی (كرم الله وجهه)؟ فەرمووی: ئێوە توانای بەرگەگرتنی ئەوەتان نی یە، عاصم فەرمووی: گوتمان: هەر كەسێك لە ئێمە توانای بەرگەگرتنی هەبێت نوێژ دەكات، ئەوەبوو فەرمووی: ((كاتێ ڕۆژ لێرەوە وەكو ئەو شێوەیەی بوایە لێرەوە لە كاتی عەسردا دوو ڕكاتی دەكردو، كاتێ ڕۆژ لێرەوە وەكو ئەو شێوەی بوایە لێرەوە لە كاتی نیوەڕۆدا چوار ڕكاتی دەكردو، پێش نیوەڕۆش چوار ڕكاتی دەكرد {بە یادیشی هێناوەتەوە كەپێغەمبەری خوا ﷺ پاش تێپەڕبوونی ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسمان (عند الزوال) ئەو نوێژەی دەكردو درێژیشی دەكردەوە / ٢٨٩}و، لەپاشیشیدا دوو ڕكاتی دەكردو، پێشی عەسریش چوار ڕكاتی دەكرد، نێوان دوو ڕكاتو دوو ڕكاتی دیكەی جیا دەكردەوە بە سڵاودانەوە لە سەر فریشتە نزیكەكانو، پێغەمبەرانو، شوێنكەوتوانیان لە باوەڕدارانو موسڵمانان))

---

[٢٤٣] _ المؤلف برقم ٤٢٤و٤٢٩ و٥٩٨ وأحمد والنسائي وابن ماجة.

(قـلـت : وقال المؤلف : ((حديث حسن))، وهو مخرج في ((الصحيحة)) (٢٤٠ و٢٧٠٥)، وروى منـه أبو داود الصلاة قبل العصر، لكنه قال : ((ركعتين))وهو شـاذ، ولـذلك خرجتـه في ((ضـعيف أبـي داود))٢٣٥).

# ٤١_ بەشی نوێژی چێشتەنگاو
## ( صلاة الضحى ):

صحيح ٢٤٤_ معاذة قالت: قلت لعائشة رضي الله تعالى عنها: أكان النبي صلى الله عليه وسلم يُصلي الضحى؟ قالت: ((نعم، أربع ركعاتٍ، ويزيد ما شاء الله عز وجل)).

٢٤٤ _ لە موعاذەوە فەرموویەتی: بە عائیشەم گوت ڕەزای خوای لێبێت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشتەنگاو دەكرد؟ فەرمووی:((بەڵێ، چوار ڕكاتو، چەند خوای عز وجل ویستی بوایە زیادی دەكرد)).

٢٤٥ _ عن أنس بن مالكٍ: صحيح ((ان النبي صلى الله عليه وسلم كان يصلي الضحى سِتَّ رَكَعَات)).

٢٤٥ _ لە ئەنەسی كوڕی مالكەوە: ((پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی بە شەش ڕكات دەكرد)).

صحيح ٢٤٦_ عن عبدالرحمن بن أبي ليلى قال: ما أخبرني أحد أنه رأى النبي صلى الله عليه وسلم يصلي الضحى إلا أمُّ هانيء رضي الله تعالى عنها، فإنها

[244] _ أخرجه أحمد وابن ماجة ومسلم برقم ٧١٩.
(قلت : وآخرون، تراهم في ((الإرواء)) (٤٦٢).
ئیمامی نەوەوی لە كتێبی (( المجموع )) دا ٤/ ٣٥ فەرموویەتی : (( لە یەكێك لە سوننەتەكانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی چێشتەنگاوە، كە چاكترینیان هەشت ڕكاتە، بە بەڵگەی فەرموودەكەی ئومو هانیء، كەمترینیشیان دوو ڕكاتە بە بەڵگەی فەرموودەكەی ئەبی ذەڕ كە ئیمامی موسلیم ( تخريج ) ی دەكات بە بێژەی : (( جێی ئەوەش دەگرێتەوە ئەگەر دوو ڕكات نوێژی چێشتەنگاو بكات )). كاتەكەشی : كاتێ ڕۆژ هەڵدێت تا خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لار دەبێتەوە )).
[245] _ تفرد به المؤلف في ((الشمائل)). (الجامع الصغير).
(قلت : وهو صحيح لغيره كما بينته في المصدر السابق ٤٦٣).

حدَّثتْ: ((أن رسول الله صلى الله عليه وسلم دخل بيتَها يومَ فتح مكَّة فأغتسلَ، فَسَبَّحَ ثمانِ ركعات، ما رأيته صلى الله عليه وسلم صلى صلاةً قط أخفَّ منها، غير أنه كان يُتِمُّ الركوعَ والسجودَ )).

٢٤٦ _ لە عەبدولڕەحمانی كوڕی ئەبی لەیلاوە فەرموویەتی: هیچ كەسێك پێی ڕانەگەیاندووم بینیبێتی كەوا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشتەنگاو دەكات جگە لە ئومو هانیء ڕەزای خوای لێبێت. ئەوەبوو گێڕایەوە: ((كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ڕزگاركردنی مەكەدا دیدەنی كرد و خۆی شت‌و، هەشت ڕكات نوێژی كرد، هەرگیز نەمبینیوە نوێژێكی تری كردبێت سووكتر لەو نوێژانە، بەڵام ڕكوع‌و سجودی بە تەواوی دەبرد)).

صحيح ٢٤٧ _ عن عبدالله بن شَقيق قال: قلتُ لعائشة رضي الله عنها: أكان النبي صلى الله عليه وسلم يصلي الضحى؟ قالت:((لا، إلا أن يجيء من مَغيبه))[٢٢٨]

---

[٢٤٦] _ المؤلف في ((الصلاة)) برقم ٤٧٤ وفي ((الأستئذان)) و ((السِّير)) والبخاري ومسلم في ((الصلاة)) برقم ٣٣٦ وأبو داود فيه والنسائي في ((الطهارة)) وابن ماجة في ((الصلاة)).

(قلت : وقال المؤلف : ((حديث حسن صحيح))، وهو مخرج في المصدر المشار إليه (٤٦٤) وفي ((صحيح أبي داود)) ١١٦٨).

[٢٤٧] _ أخرجه المؤلف وابوداود برقم ١٢٩٢ ومسلم والنسائي.

(قلت : وهو مخرج في ((صحيح أبي داود)) ١١٦٩).

[٢٢٨] _ گوتم : ڕواڵەتی ئەم فەرموودەیە پێچەوانەی فەرموودەكەی دیكەیەتی بە ژمارە (٢٤٨)، چونكە ئەم فەرموودەیە (مُقید)ە واتە دیاریكراوە بە سەفەرەوە، فەرموودەكەی دیكەشی (مُطلق)ە واتە ڕەهایە و دیاری نەكراوە بەشتێكەوە، لێرەدا كۆكردنەوەی (جمع) نێوان هەردوو فەرموودەكە یا بە هەڵگرتنی ڕەهایە بۆ سەر دیاریكراو (حمل المطلق على المقيد)، یا دەگوترێت: ئەمە لە كۆی ئەو نوێژانە بوو كە خاتوو عائیشە ئاگای لێبوو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم بە ئەنجامی دەگەیاند، ئەوەشی لە هەندێ هاوەڵانەوە پێگەیشتبوو كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم ئەنجامی داوە لە بەر ئەوە چەسپاوی (مثبت) ئەم فەرموودەیە بەشێكی ئەو فەرموودەیە دەبێت. ئەمەش ڕاسترە. والله أعلم.

٢٤٧ _ لە عەبدوڵای كوڕی شەقیقەوە فەرموویەتی: بە عائیشەم گوت ڕەزای خوای لێبێت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی دەكرد؟ فەرمووی: ((نەخێر، مەگەر لە سەفەرەكەی بهاتبایەوە)).

ضعيف ٢٤٨_ عن أبي سعيد الـخُـدْري رضي الله تعالى عنه قال: ((كان النبيُّ صلى الله عليه وسلم يُـصلِّـي الضحى حتى نقول: لا يَـدَعَـها، ويَـدَعُـها حتى نقول: لا يصليها)).

٢٤٨_ لە ئەبی سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای تعالای لێبێت فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشتەنـگاوی دەكرد تا دەمانگوت: وازی لێناهێنێت‌و، وازیشی لێدەهێنا تا دەمانگوت: نوێژی چێشتەنگاو ناكات)).

صحيح ٢٤٩_ عن أبي أيوبه الأنصاري رضي الله عنه: أن النبي صلى الله عليه وسلم كان يُـدمن أربَـعَ (٣٢٩) ركعاتٍ عند زَوالِ الشمسِ. فقلت: يا رسول الله! إنك تُـدمن هذه الأربعَ ركعاتٍ عند زَوالِ الشمسِ؟ فقال: ((إن أبواب السماء تُـفْـتَـح عند زوالِ الشمسِ فلا تُـرتَـج (٣٣٠) حتى يُـصلَّـى الظهر، فأحبُّ أن يصعَدَ لي في تـلك الساعة خَـيْـرٌ. قلت: أفي كُلِّهِـنَّ قراءةٌ؟ قال: نعم. قـلـت: هل فيهن تسليمٌ فاصلٌ؟ قال: لا)).

---

[٢٤٨] _ أخرجه المؤلف برقم ٤٧٧.

(قـلـت : وحسنه، وهو مردود بـأن فيه عطيه العوفي وهو ضعيف، وهو مخرج في ((الإرواء)) ٤٦٠).

[٢٤٩] _ أخرجه أبو داود برقم ١٢٧٠ وابن ماجة.

(قـلـت : وهو عندهما مختصر والطريق واحدة، وقد أعلها أبوداود فيـه عبيـدة بـن مُـعَـتِّـب وهـو ضعيف، لكن له طريق أخرى يتـقوى بها، ولذلك خرجته في ((صحيح أبي داود)) (١١٥٣)، وذكـرت فيه بعض طرقه).

[٣٢٩] _ يُدمنُ : واتە بەردەوام دەبوو.

[٣٣٠] _ تُـرتَـجُ، بضم التاء الأولى وفتح التاء الثانية : واتە داناخرێـت.

٢٤٩ _ لە ئەبی ئەیوبی ئەنصاریەوە ڕەزای خوای لێبێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەر ئەنجامدانی چوار ڕکاتی سوونەتی کاتی لاربوونەوەی ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسمان (عند الزوال) بەردەوام دەبوو. گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ بەردەوام ئەو چوار ڕکاتە سوونەتەی کاتی لاربوونەوەی ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسمان دەکەیت؟ ئەوە بوو فەرمووی: ((کاتی لاربوونەوەی ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسمان دەرگاکانی ئاسمان دەکرێتەوە و داناخرێت تا نوێژی نیوەڕۆ ئەنجام دەدرێت، حەزم بە بەرزبوونەوەی چاکەمە لەو کاتەدا. گوتم: ئایا هەموو ڕکاتەکانی خوێندنی تێدایە؟ فەرمووی: بەڵێ. گوتم: ئایا سڵاودانەوەیەکی جیاکەرەوەیان لە نێوانیاندایە؟ فەرمووی: نەخێر)).

صحيح ٢٥٠_ عن عبدالله بن السائبِ: أن رسولَ الله صلى الله عليه وسلم كان يُـصلي أربعاً بعدَ أن تَـزولَ الشمسُ قَـبْـلَ الظهر وقال: ((إنها ساعةٌ تُـفـتَـح فيها أبواب السماءِ فأحِـبُّ أن يَـصْـعَـدَ لي فيها عملُ صالح)).

٢٥٠ _ لە عەبدوڵای کوڕی سائـیبەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ چوار ڕکات نوێژی سوونەتی دەکرد پاش لاربوونەوەی ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسمانو پێش نیوەڕۆو دەیفەرموو: ((کاتێکە دەرگاکانی ئاسمانی تێدا دەکرێتەوە منیش حەزم بە بەرزبوونەوەی کارێکی چاکەمە لەو کاتەدا)).

---

[٢٥٠] _ أخرجه المؤلف في ((الصلاة)) برقم ٤٧٨.

(قـلـت : وقال : ((حسن غريب)) وإسناده صحيح كما بينت هناك).

## ٤٢_ بەشی نوێژە سوونەتەكان لە ماڵدا
## ( صلاة التطوع ) [٣٣١]

٢٥١_ عن عبدالله بن سَعْدٍ (٣٣٢) قال: صحيح سألتُ رسولَ الله صلى الله عليه وسلم عن الصلاة في بيتي، والصلاة في المسجد؟ قال: ((قد ترى ما أقربَ بيتي من المسجد، فَلأنْ أصلِّـيَ في بيتي أحبُّ إليَّ مِن أن أصليَّ في المسجد، إلا أن تكون صلاةً مكتوبةً)).

٢٥١ _ لە عەبدوڵای كوڕی سەعدەوە فەرموویەتی:سەبارەت بە نوێژكردنم لە ماڵەوەدا و، نوێژكردنم لە مزگەوتدا لەپێغەمبەری خوام پرسی ﷺ، فەرمووی: ((لەوانەیە تەماشا بكەی چەند ماڵەكەم لە مزگەوتەوە نزیكە، بە دڵنیای نوێژكردنم لە ماڵەوەدا پێ خۆشترە لە نوێژكردنم لە مزگەوتدا مەگەر نوێژێكی فەرز بێت)).

---

[٣٣١] _ ئەو نوێژانەیە كە بەدەر لە فەرزەكان دەكرێت.

٢٥١ _ أخرجه ابن ماجة في ((الصلاة)).

(قلت : برقم (١٣٧٨)، وإسناده صحيح لولا أن فيه العلاء بن الحارث وكان أختلط، لكن له شاهد قوي من حديث زيد بن ثابت، وهو في ((صحيح أبي داود)) ٩٥٩).

[٣٣٢] _ (قلت : الأصل : (سعيد) والتصويب من كتب الرجال).

# ٤٣ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە ڕۆژووی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح٢٥٢ _ عن عبدالله بن شقيق قال: سألت عائشة َرضي الله تعالى عنها عن صيام رسول الله صلى الله عليه وسلم؟ قالت: ((كان يصوم حتى نقولَ: قد صامَ، ويُـفطر حتى نقولَ: قد أفطر. قالت: وما صامَ رسول الله صلى الله عليه وسلم شهرا ًكاملاً منذ قَـدِمَ المدينة َإلا رمضان َ)).

٢٥٢ _ لە عەبدوڵای كوڕی شەقیقەوە فەرموویەتی: سەبارەت بە ڕۆژووگرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە عائیشەم پرسی ڕەزای خوای لێبێت؟ فەرمووی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕۆژوو دەبوو تا دەمانگوت: بە ڕۆژووەو، بە ڕۆژووش نەدەبوو تا دەمانگوت: بە ڕۆژوو نابێت. عائیشە فەرمووی: لەو ڕۆژەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنایە مەدینە مانگێكی تەواو بە ڕۆژوو نەبوو مەگەر مانگی ڕەمەزان)).

صحيح ٢٥٣_ عن أنس بن مالك أنه سئل عن صوم النبي صلى الله عليه وسلم؟ فقال: ((كان يصوم من الشهر حتى نَـرى أن لا يريد أن يُـفطـرَ منه، ويُـفْـطِـر حتى نُـرى أن لا يريد أن يصومَ منه شيئـا ً، وكنت لا تـشاءُ أن تراهُ من اللـيل ِ مُـصَـلِّـيا ً إلا رأيتَـهُ مُـصَلِّـيا ً، ولا نائـما ً إلا رأيته نائما ً)).

٢٥٣ _ لە ئەنەسی كوڕی مالكەوە كە سەبارەت بە ڕۆژووی پێغەمبەری خوا ﷺ لێیان پرسیبوو؟ ئەویش فەرمووی: ((لە مانـگەكەدا ئەوەندە بە ڕۆژوو دەبوو تا واماندەزانی نایەوێت هیچی لێبشكێنێت و، دەیشیشكاند تا واماندەزانی نایەوێت

---

[٢٥٢] _ أخرجه المؤلف برقم ٧٦٨ وأبو داود برقم ٢٤٣٤ ومسلم والنسائي.
(قـلـت : والبخاري أيضا ً وغيره، وهو مخرج في ((صحيح أبي داود)) ٢١٠٣).

[٢٥٣] _ أخرجه الشيخان.
(قـلـت : وابن خزيمة في ((صحيحه)) (٢١٣٤) وغيره وهو في ((مختصر البخاري)) برقم _ ٥٩٣).

بە ڕۆژوو بێت تیایدا، وە بەشەویش نەتدەویست بیبینی نوێژ دەكات مەگەر دەتبینی نوێژ دەكاتو، نەشدەویست بیبینی نووستووە مەگەر دەتبینی نووستووە)).

صبيح ٢٥٤ _ عن ابن عباس قال: ((كان النبيُّ صلى الله عليه وسلم يصومُ حتى نقولَ: ما يريد أن يُفطرَ منه، ويفطرُ حتى نقول: ما يريد أن يصوم منه، وما صام شهراً كاملاً منذ قَـدِمَ المدينة إلا رمضان)).

٢٥٤ _ لە ئیبنو عەباسەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕۆژوو دەبوو تا دەمانگوت: نایەوێت لێی بشكێنێتو، دەشیشكاند تا دەمانگوت: نایەوێت تیایدا بە ڕۆژوو بێتو، لەو كاتەشەوە تەشریفی هێنایە مەدینە هیچ مانگێك بە تەواوی بە ڕۆژوو نەبوو جگە لە ڕەمەزان)).

صحيح ٢٥٥_ عن أم سَلَـمَـة َقالت: ((ما رأيت النبيَّ صلى الله عليه وسلم يصوم شَـهرين متتـابعين إلا شعبان ورمضان)).

قال أبو عيسى: ((هذا إسناد صحيح، وهكذا قال: عن أبي سلمة عن أم سلمة. ورَوَى هذا الحديث غيرُ واحدٍ: عن أبي سلمة عن عائشة رضي الله تعالى عنها عن النبي صلى الله عليه وسلم، ويحتمل أن يكون أبو سلمة بن عبد الرحمن قد روى هذا الحديث عن عائشة وأم سلمة جميعاً عن النبي صلى الله عليه وسلم)).(٢٣٣)

٢٥٥_ لە ئومو سەلەمەوە فەرموویەتی: ((بە دەر لە شەعبان و ڕەمەزان نەمبینیوە پێغەمبەری خوا ﷺ دوو مانگ بە دوای یەكدا بە ڕۆژوو بێت)).

---

[٢٥٤] _ أخرجه مسلم.

(قـلـت : والبخاري أيضاً وهو في ((مختصر البخاري)) ٩٦٧).

[٢٥٥] _ أخرجه المؤلف برقم ٧٣٦ وأبوداود برقم ٢٣٣٦ والنسائي.

(قـلـت : وإسناده كما قال المؤلف، والأحتمال الذي ذكره قوي، فالحديث صحيح عن أم سـلـمة، وهو هذا، وعن عائـشة وهو اللآتي بعده. وهما مخرجان في ((صحيح أبي داود)) ٢٢٠١ و ٢١٠٤).

[٢٣٣] _ قـلـت : وهو الراجح.

ئەبو عیسا فەرموویەتی: ((ئەمە سەنەدێکی (صحیح) ە و، بەم شێوازە فەرموویەتی: لە ئەبی سەلەمەوە لە ئومو سەلەمەوە. بەدەر لە یەککەسیش ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە: لە ئەبی سەلەمەوە لە عائیشەوە ڕەزای خوای تعالای لێبیت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، پێشدەچێت ئەبوسەلەمەی کوڕی عبدولرحمان ئەم فەرموودەیەی لە عائیشە وئومو سەلەمەوە گێڕابێتەوەو ئەوانیش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ)).

صحيح ٢٥٦_ عن عائشة قالت: ((لم أرَ رسولَ الله صلى الله عليه وسلم يصومُ في شهر أكثرَ من صيامِــه لله ِ في شعبان، كان يصوم شعبان إلا قليلا، بل كان يَـصومُـه كلَّـه)).

٢٥٦_ لە عائشەوە فەرموویەتی: ((نەمبینیوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگێکدا زۆر بە ڕۆژوو بێت زیاتر لە ڕۆژوو گرتنی بۆ خوا لە مانگی شەعباندا، مانگی شەعبان بە ڕۆژوو دەبوو مەگەر کەمێکی، بەڵکو تێکرای بە ڕۆژوو دەبوو)).

صحيح ٢٥٧_ عن عبدالله (٣٣٤) قال: ((كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يصوم من غُـرَّةِ (٣٣٥) كل شهرٍ ثَـلاثَـةَ أيامٍ ، وقلَّـما كان يفطر يوم الجمعة)). (٣٣٦)

---

[٢٥٦] _ المؤلف في ((الصوم)) برقم ٧٣٧.

(قلت : وكذا مسلم والنسائي وأحمد، وسنده صحيح كما تقدم آنفاً).

[٢٥٧] _ أخرجه المؤلف برقم ٧٤٢ وأبوداود برقم ٢٤٥٠ والنسائي وأحمد.

(قلت : وحسنه المؤلف، وصححه ابن خزيمة وهو مخرج في ((صحيح أبي داود)) ٢١١٦).

[٣٣٤] _ عبدالله: مەبەست عەبدوڵای کوڕی مەسعودە، چونکە کاتێ ناوی عەبدوڵا دەهێنرێت ئەو مەبەستە.

[٣٣٥] _ الغُرَّة: واتە سەرەتای مانگ.

[٣٣٦] _ واتە لەگەڵ ئەو دوو ڕۆژەی لە پێشیدایە بە بەڵگەی دوو فەرموودەکەی داهاتوو، کەواتە هیچ دژکاریەکی ئەم فەرموودەیە بە دیناکرێت لە گەڵ فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه و سلم (ڕۆژی هەینی تایبەت مەکەن بە ڕۆژوو گرتن).

٢٥٧_ لە عەبدوڵاوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەتای هەموو مانـگێکدا سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبوو، بە دەگمەن ڕۆژی هەینیش دەیشکاند)).

صحيح ٢٥٨_ عن عائشة قالت: ((كان النبي صلى الله عليه وسلم يَـتَـحَرَّى صومَ الأثنين والخميس)).

٢٥٨ _ لە عائشەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوای ڕۆژوو بونی ڕۆژی دوو شەمو پێنج شەمدا دەگەڕا)).

٢٥٩_ عن أبي هريرة: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: صحيح ((تُـعرَضُ الأعمال يومَ الأثنين والخميس، فَأُحِبُّ أن يُعرَضَ عملي وأنا صائمٌ)).

٢٥٩ _ لە ئەبی هورەیرەوە دەگێڕنەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((کردەوەکان ڕۆژانی دوو شەم و پێنج شەم دەخرێتە ڕوو، منیش حەزم بە خستنەڕووی کردەوەکانمە لە کاتێکدا بە ڕۆژووبم)).

صحيح ٢٦٠_ عن عائشة قالت: ((كان النبيُّ صلى الله عليه وسلم يصوم من الشهر السبتَ والأحَد والأثنين، ومن الشهر الآخرِ الثُّلاثاءَ والأربعاءَ والخميسَ)).

---

٢٥٨ _ أخرجه المؤلف برقم ٧٤٥ وابن ماجة برقم ٧٣٩ والنسائي.

(قلت : وحسنه المؤلف، وإسناده صحيح كما بينته في ((الإرواء)) ٤/ ١٠٥ و١٠٦).

٢٥٩ _ أخرجه المؤلف برقم ٧٤٧.

(قلت : وقال : ((حديث حسن غريب)).

قلت : بل هو ضعيف الإسناد صحيح المتن، فإن له شاهداً أخرجته مع الحديث في ((الإرواء)) ٩٤٨ و٩٤٩).

٢٦٠ _ أخرجه أحمد وابن ماجة نحوه.

(قلت : وإسناده صحيح، وهو مخرج في ((المشكاة)) (٢٠٥٩)، وصيامه يوم السبت ينافي بظاهره قوله صلى الله عليه وسلم : ((لا تصوموا يوم السبت إلا فيما أفترض عليكم..)) : واتە بە ڕۆژوو بونیشی صلى الله عليه و سلم لە ڕۆژی شەممەدا بە ڕواڵەت (بظاهره) پێچەوانەی فەرمایشتێتی لە فەرموودەیەکی تردا: (( ڕۆژی شەممە بە ڕۆژوو مەبن مەگەر هاوکاتی ئەو ڕۆژوانە بکات کە

٢٦٠ _ له عائیشەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگێدا شەممەو یەك شەمو دوو شەم بە ڕۆژوو دەبوو، لە مانگەكەی دیكەشدا سێ شەمو چوار شەمو پێنج شەم بە ڕۆژو دەبوو)).

صحيح ٢٦١_ عن عائشة قالت: ((ما كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يصوم في شهر أكثَـر من صيامـهِ في شعبان)).

٢٦١ _ لە عائیـشەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە ڕۆژوو نەدەبوو لە مانگێكدا زیاتر لە ڕۆژوو بوونی مانگی شەعبان)).

صحيح ٢٦٢_ معاذة قالت: قـلتُ لعائشة َ: أكان رسولُ الله صلى الله عليه وسلم يصومُ ثلاثـة َ أيامٍ من كلِّ شهر؟ قالت: نعم. قـلت: من أيِّـهِ كان يصوم؟ قالت: ((كان لا يبالي من أيِّـهِ صام)).

٢٦٢ _ موعاذە فەرموویەتی: بە عائیشەم گوت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو مانگێك سێ ڕۆژی بە ڕۆژوو دەبوو؟ فەرمووی: بەڵـێ. گوتم: لە چ ڕۆژێكیدا بە ڕۆژو دەبوو؟ فەرمووی: ((گوێی نـەدەدایە لە چ ڕۆژێكیدا بە ڕۆژو دەبێت)).

صحيح ٢٦٣_ عن عائشة قالت: ((كان عاشوراء (٣٣٧) يوماً تصومه قريشُ في الجاهلية، وكان رسول الله صلى الله عليه وسلم يصومُـه، فلما قَـدِمَ المدينة

---

فەرزكراوەتە سەرتاندا )) وهو مخرج في ((الإرواء)) (٩٤٢). وانظر ((صحيح الترغيب والترهيب)) (١٠٤٠).

[٢٦١] _ وأخرجه الترمذي برقم ٧٣٧. وفي نيل الأوطار ٣٤٥/٤ : أخرجه الشيخان أيضاً.

(قـلت : وهو مختصر حديثها المتقدم ٢٥٦).

[٢٦٢] _ (قـلت : إسناده صحيح على شرط مسلم، وقد أخرجه هو وابن خزيمة في ((صحيحيهما)) وأبو داود، وهو مخرج في ((صحيحه)) ٢١١٧).

[٢٦٣] _ وأخرجه المؤلف برقم ٧٥٣ والبخاري ومسلم.

(قـلت : وقال المؤلف : ((وهو حديث صحيح)).وهو في ((مختصر البخاري)) برقم ٩٨٠).

[٣٣٧] _ عاشوراء : ڕۆژی دەیەمی مانگی موحەڕەمە.

صامَـه، (٣٣٨) وأمر بصيامه، فلما افـتُـرض رمضان(٣٣٩) كان رمضان هو الفريضة، وترك عاشوراء، فمن شاء صامه، ومن شاء تركه)).

٢٦٣_ لە عائیشەوە فەرموویەتی: ((عاشوراءڕۆژێك بوو لە تاق نەفامیدا قورەیش بە ڕۆژو دەبوون تیایداو، پێغەمبەری خواش ﷺ بە ڕۆژوو دەبوو تیایدا، کاتێکیش تەشریفی هێنایە مەدینە دیسان بە ڕۆژوو دەبوو تیایداو، فەرمانیشی دابوو بە ڕۆژوو گرتنی، کاتێ ڕەمەزان فەرز کرا، ڕەمەزان بو بە فەرزو، لە ڕۆژوگرتنی عاشوراء وازی هێنا، ئیتر هەرکەس ئارەزووی هەبێت بە ڕۆژوو دەبێت تیایداو، هەرکەسیش ئارەزووی نەبێت وازی لێ دەهێنێت)).

صحيح ٢٦٤_ عن علقمة قال: ((سألت عائشة رضي الله عنها: أكان رسول الله صلى الله عليْه وسلم يَـخُـصُّ من الأيام شيئاً؟ قالت: ((كان عمله دِيمةً، (٣٤٠) وأيُّـكم يُـطيقُ ما كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يُـطِيق)).

٢٦٤ _ لە عەلقەمەوە فەرموویەتی: ((لە عائیشەم پرسی ڕەزای خوای لێبێت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ ڕۆژانێکی دەکرد بە شتێك؟ فەرمووی: ((پەرستنەکانەکانی بەردەوامیی بوو. کێتان توانای ئارامگرتنی هەیە بەرامبەر بەوانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئارامی لە سەر دەگرت)).

---

[٣٣٨] _ واتە ئیمامی بوخاری و موسلیم لە ئیبنو عەباسەوە ئەم فەرموودەیە دەگێـڕنەوە کەوا پێـغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کاتێ تەشریفی هێنایە مەدینە بۆی دەرکەوت جولەکەکان لە ڕۆژی عاشوراءبە ڕۆژو دەبن، سەبارەت بەو ڕۆژوگرتنە لێـی پرسین و ئەوانیش گوتیان : ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە خوای پەروەردگار موسای رزگارکردو فیرعەون و قەومەکەی خنکاند، ئیتر موسا وەکو سوپاسگوزاریەك تیایدا بە ڕۆژوو دەبوو ئێمەش تیایدا بە ڕۆژو دەبین. ئەوە بوو پێـغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: ئێمە لە ئێـوە شایستەترین بە موساو ئیتر تیایدا بە ڕۆژوو دەبوو فەرمانیشیدا بە ڕۆژو گرتنی ئەو ڕۆژە.

[٣٣٩] _ (فەرز) بوونی ڕەمەزان لە سالّی دووەمی کۆچیدا بوو.

[٢٦٤] _ (قلت : أخرجه الشيخان وأبوداود مثل رواية المؤلف، وهو في ((صحيح أبي داود)) (١٢٤٠)، وعزاه في الأصل للمؤلف فقط في ((الأدب)) (٢٨٦٠) وقال : ((حديث حسن صحيح)).

[٣٤٠] _ ديمة : واتە بە بەردەوامی.

صحيح ٢٦٥_ عن عائشة قالت: ((دخل عليَّ رسولُ الله صلى الله عليه وسلم وعندي امرأةٌ، (٣٤١) فقال: من هذه؟ قلت: فلانةٌ لا تنامُ الليلَ، فقال رسول الله صلى الله علية وسلم: ((عليكم من الأعمال ما تطيقون، فوالله لا يَمَلُّ الله حتى تملوا)).وكان أحبَّ ذلك إلى رسولِ الله صلى الله عليه وسلم الذي يَدومُ عليه صاحبُه)).

٢٦٥ _ له عائشەوه فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنایه لام و ژنێك به دیدەنی لام بوو، فەرمووی: ئەوه كێ یه؟ گوتم: فلان ژنه به شەو نانوێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((كردەوانێك ئەنجام بدەن كه توانای ئارام گرتنتان له سەری هەیه، سوێند به خوا پەروەردگار وەڕس نابێت تا ئێوه وەڕس نەبن)). وه خۆشەویسترین كردەوانێك به لای پێغەمبەری خواوه ﷺ ئەوەبوو كه خاوەنەكەی له سەری بەردەوام دەبوو)).

٢٦٦_ عن أبي صالح قال: سألت عائشة وأمَّ سلمة: صحيح- أي العمل كان أحبَّ إلى رسولِ الله صلى الله عليه وسلم؟ قالتا:((ما دِيمَ عليه وإن قل)).

٢٦٦_ له ئەبی صالەحەوه فەرموویەتی: له عائیشه و ئومو سەلەمەم پرسی: چ كردەوەیەك خۆشەویست بوو به لای پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرموویان: ((ئەوەی به بەردەوامی ئەنجام بدرێت ئەگەر كەمیش بێت)).

صحيح ٢٦٧_ عوف بن مالك يقول: ((كنتُ مع رسول الله صلى الله عليه وسلم ليلة فاستاكَ ثم توضأ ثم قامَ يصلي، فقمتُ معه، فبدأ فاستفتح البقرةَ، فلا يَمُرُّ

---

[٢٦٥] _ (قلت : أخرجه البخاري في ((الإيمان)) ومسلم في ((المسافرين)) (٢٢١) وهو في ((مختصر البخاري)) برقم (٣٣) وهو مخرج في ((صحيح أبي داود)) (١٢٣٨)، ولم يخرجه في الأصل وإنما قال : ((أشار إليه المؤلف في ((سننه)) في آخر حديث ٢٨٦٠))!).

[٣٤١] _ وعندي أمرأة : ناوی ئەو ژنەی به دیدەنی لای دانیشتبوو (ئەلحەولای كچی تویت كوڕی حەبیب) بوو له كۆمەڵی هاوڕێیانی خەدیجه.

[٢٦٦] _ أخرجه المؤلف في ((الأدب)) برقم ٢٨٦٠.

(قلت : وقال : ((حديث حسن غريب))).

بآيةِ رَحمةٍ إلا وَقَفَ فَسأَلَ، ولا يَمُرُّ بآيةِ عذابٍ إلا وَقَفَ فَتعَوَّذ، ثم ركع، فمكث راكعاً بقَدْرِ قيامِه، ويقول في ركوعه: ((سبحان ذي الجبروت والملكوت والكبرياء والعظمة))، ثم سجد بِقَدْرِ ركوعِه، ويقول في سجوده: ((سبحان ذي الجَبَروت والمَلَكوت والكبرياء والعظمة))، ثم قرأ (آل عمران) ثم سورةً سورةً، يفعل مثل ذلك)).

٢٦٧_ عەوفی کوڕی مالـك دەفەرموێت: ((شەوێك لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووم ﷺ ئەوە بوو سیواکی کردو دەستنوێژی گرت وپاشان هەستا نوێژ بکات، منیش لە گەڵیدا هەستام، دەستیپێکرد بە خوێندنی سورەتی (البقرة)، بە ئایەتێکی لێبوردیدا (رحمه) تێپەڕ نەدەبوو مەگەر (إلا) دەوەستاو داوای دەکردو، بە ئایەتێکی سزادانیشدا تێپەڕ نەدەبوو مەگەر دەوەستا و پەنای دەبرد، پاشان چەمایەوەو چووە ڕکوع، بە ئەندازەی وەستانەکەی لە ڕکوعدا مایەوەو، لە ڕکوعەکەشیدا دەیفەرموو: ((سپاس و ستایش بۆ خاوەن فەرمانداریێتی بێسنوورو موڵكو دەستەڵات و مەزنی))، پاشان سجوودی برد بە ئەندازەی ڕکوعەکەی و، لە سجودەکەیدا دەیفەرموو: ((پاكو بێگەردی بۆ خاوەن فەرمانداریێتی بێسنوورو موڵـكو دەستەلاتو مەزنی))، پاشان سورەتی (آل عمران)و سورەت سورەتی خوێندو، هاوشێوەی پێشتری دەکرد))٠

[٢٦٧] _ أخرجه أبوداود في ((الصلاة)) والنسائي فيه.

(قلت : إسناده صحيح، وهو مخرج في ((صحيح أبي داود)) ٨١٧).

## ٤٤ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە خوێندنی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

ضعيف ٢٦٨ _ عن يَـعْلَـى بن مَمْلَـك أنه:((سأل أم سلمة عن قراءة رسول الله صلى الله عليه وسلم؟ فإذا هي تَـنْـعَـت (٣٤٢) قراءةً مُـفسَّرةً حرفاً حرفاً)).

٢٦٨_ لە یەعلای کوڕی مەملـەکەوە: ((سەبارەت بە خوێندنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئومو سەلەمەی پرسیبوو؟ ئەویش بە خوێندنێکی (ترتیل) ی ئاشکەرای ڕوونی وشە بە ووشە وەسفی بۆ کرد)).

صحيح ٢٦٩ _ عن قـتـادة قال: ((قـلـت لأنس بن مالك: كيف كانت قرآءة رُسول الله صلى الله عليه وسلم؟ قال: مَـدّاً))

٢٦٩_ لە قەتادەوە فەرموویەتی: ((بە ئەنەسی کوڕی مالـکم گوت: شێوازی خوێندنی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بوو؟ فەرمووی: ئەو پیتەی شایستە بوایە درێژی دەکردەوە)).

---

[٢٦٨] _ المؤلف في ((ثواب القرآن))، وفي إسناده جهالة كما بينته في ((ضعيف أبي داود)) ٢٦٠).

[٣٤٢] _ تـنـعت : أي تصف، و (مفسرة) بين مشددة مفتوحة. من الفَسر، وهـو البيـان، أي واضـحة مرتـلة مبينـة.

ومعنى (حرفاً حرفاً): أي كلمة كلمة. واتە وەسفی خوێـندنەوەکەی دەکـرد، بـە خوێـندنێـکی (ترتیل) ی ئاشکەرای ڕوون، وشە بە وشە.

[٢٦٩] _ أخرجه البخاري في كتاب ((فضائل القرآن / باب الترتيـل في القـرآة)) وأبـوداود بـرقم ١٤٦٥ والنسائي وابن ماجة في ((الصلاة)).

(قـلـت : وهو مخرج في ((صحيح أبي داود)) ١٣١٨).

ومعنى (مداً) أي مد الحرف الذي يستحق المد. أنظر القسطلاني على البخاري ٧/٥٣٥.

وە مانای (مداً) واتە ئەو پیتەی شایستەی درێژکردنەوە بوایە درێژی دەکردەوە.

٢٧٠_ عن أمِّ سَلَمَةَ قالت: صحيح ((كان النبيُّ صلى الله عليه وسلم يُقَطِّعُ (٢٤٣) قرآءتَه يقول: (الحمد لله رب العالمين). ثم يقف. ثم يقول: (الرحمن الرحيم). ثم يقف. وكان يقرأ (مالك (٢٤٤) يوم الدين))).

٢٧٠_ له ئومی سەلەمەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندنەكەی كەرت كەرت دەكردو دەیفەرموو: (الحمد لله رب العالمین). پاشان دەوەستا. پاشان دەیفەرموو: (الرحمن الرحیم). پاشان دەوەستا. وە دەیفەرموو (مالك یوم الدین))).

صحيح ٢٧١_ عن عبدالله بن أبي قَيس قال: ((سألت عائشةَ رضي الله عنها عن قراءة النبي صلى الله عليه وسلم أكان يُسِرُّ بالقراءة أم يَجهر؟ قالت: كلُّ ذلك قد كان يفعل، قد ربما أسَرَّ، وربما جَهَر، فقلت: الحمد لله الذي جعل في الأمرِ سَعَةً))

٢٧١ _ له عەبدوڵای كوڕی ئەبی قەیسەوە فەرموویەتی: ((سەبارەت بە خوێندنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە عائیشەم پرسی ئایا بە بێدەنگی دەیخوێند یا

[270] _ أخرجه المؤلف برقم ٢٩٢٨ وأبوداود في ((الصلاة)) برقم ١٤٦٦ و ((القرءات)) برقم ٤٠٠١ والنسائي في ((الصلاة)).

(قلت : واستغربه المؤلف، فهو ضعيف، وقد بينت علته في ((ضعيف أبوداود)) (٢٦٠)، لكن الحديث له طرق كثيرة كما بينت في ((صفة الصلاة)) و((الإرواء)) (٣٤٢) وغيرهما).

[243] _ يقطع : من التقطيع وهو جعل الشيء قطعا قطعا، أي يقف على رؤوس الآى. واتە وشەی (یقطع) لە وشەی (تقطیع)ەوە هاتووە كە واتای كەرت كەرتكردنی شتێك دەبەخشێت، واتە لە سەری ئایەتەكاندا دەوەستا.

[244] _ (مالك) بالألف، وقد أخرجه المؤلف في ((سننه)) في ((كتاب القرآت)) بلا ألف.

(قلت : والقرآتان متواترتان عنه صلى الله عليه وسلم).

[271] _ أخرجه المؤلف في ((ثواب القرآن)) برقم ٢٩٢٥ وأبوداود في ((الصلاة)) برقم ١٤٣٥ والبخاري ومسلم والنسائي وابن ماجة.

(قلت : وصححه المؤلف، وهو مخرج في ((صحيح أبي داود)) (١٢٩١)، وعزوه للبخاري وهو محض).

بە دەنــگەوە؟ فەرمووی: هەموو ئەوانەی دەكرد، پێدەچێت بە بێدەنگی‌و، پێشدەچێت بە دەنــگەوە، ئەوەبوو گوتم: سپاس و ستایش بۆ پەروەردگار كە فراوانی خستۆتە كارەكەوە)).

حسن ٢٧٢_ عن أم هانيء قالت: صحيح ((كنـت أسمع قراءةَ النبيِّ صلى الله عليه وسلم بالليل وأنا على عريشي)).

٢٧٢_ لە ئومو هانیئەوە فەرموویەتی: ((بە شەو من بە سەر خەوگەكەمەوە (عریش) بووم و هاوكات گوێبیستی خوێندنی پێغەمبەری خوا دەبووم ﷺ)).

صحيح٢٧٣ _ عن معاوية بن قُـرَّة قال: سمعتُ عبد َالله بن مُـغَـفَّـل ، يقول:((رأيتُ النبيَّ صلى الله عليه وسلم على ناقـتـه يوم الفتح (٣٤٥) وهو يقرأ: (إنا فتحنا لك فتحاً مبينـا(٣٤٦) ليغفر لك الله ما تـقدم من ذنـبك وما تـأخر). قال: (٣٤٧) فقرأ ورَجَّـع (٣٤٨) قـال: (٣٤٩) وقال معاوية بن قـرة: لولا أن يجتمع الناسُ عليّ لأخذت لكم في ذلك الـصَّوت ، أو قال: اللَّـحْـن)). (٣٥٠)

---

[٢٧٢] _ أخرجه النسائي في ((الصلاة)) وابن ماجة فيه.

(قـلـت : وإسناده حسن صحيح، وأخرجه أحمد أيضاً (٦/٢٤٣)، ويشـهد لـه حـديث ابـن عبـاس الآتي بعد حديث).

وكان ذلك في مكة قبل الهجرة وذلـك في صـلاة الـنبي صـلى الله عليـه وسـلم في الليـل عنـد الكعبـة، ومعنى قولها : (وأنا على عريشي) أي على سريري. واتە ئەوە لە مەكەدا بوو پـێش كۆچـكردن لـە شەو نوێژی پێغەمبەری خوادا بوو صلى الله عليه و سلم لای كەعبە، وە مانای (وأنا علـى عريشـي) واتە من بە سەر خەوگەكەمەوە بووم.

[٢٧٣] _ أخرجه أبوداود في ((الصلاة)) برقم ١٤٦٧ والبخاري في ((المغازي)) و ((التفسير)) وفي ((فضائل القرآن)) و ((التوحيد)) ومسلم في ((الصلاة)) وأبوداود فيه.

(قـلـت : وهو مخرج في ((صحيح أبي داود)) ١٣١٩).

[٣٤٥] _ واتە رزگاكردنی مەككە.

[٣٤٦] _ إنـا فتحنـا لـك فتحـا مبينـا : ئـەم رزگاركردنـە رزگـاركردنی مەككـە بـوو، يـا رزگـاركردنی خەيبەر، زۆرینەش كۆڕان لەسەر حودەيبيە.

[٣٤٧] _ قال : واتە عەبدوڵای كوڕی موغەفەل فەرمووی.

[٣٤٨] _ رَجَّـعَ، بتشديد الجيم المفتوحة: واتە لەرانەوەی دەنـگ بە خوێــندن.

٢٧٣ _ لە موعاویەی کوڕی قوڕەوە فەرموویەتی: گوێبیستی عەبدوڵای کوڕی موغەففەل بووم دەیفەرموو: ((لە ڕۆژی ڕزگارکردندا (فتح) پێغەمبەری خوام بینیی ﷺ بەسەر وشترەکەیەوە بوو ئەم ئایەتەی دەخوێند: (إنا فتحنا لك فتحا ًمبينا ً. ليغفر لك الله ما تقدم من ذنبك وما تأخر) واتە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕاستی ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکەرامان پێبەخشیت. تا خوا لە هەموو گوناهانی ڕابردوو ئایندەشت خۆش بێت). عبدوڵای کوڕی موغەففەل فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیخوێندو دەنگی دەلەراندەوە شوعبە دەفەرموێت: موعاویەی کوڕی قوڕە فەرمووی: ئەگەر خەڵك لە سەرم کۆ نەبوایەنەوە دەنگیم بۆ لاسایدەکردنەوە، یا فەرمووی: بە ئاوازەوە بۆم دەخوێندنەوە)).

ضعيف ٢٧٤_ عن قتادة قال: ((ما بعث الله نبيا ًإلا حَسَنَ الوجه، حَسَنَ الصوتِ، وكان نبيُّكم صلى الله عليه وسلم حَسَنَ الوجهِ، حَسَنَ الصوتِ، وكان لا يُرَجِّع)).

٢٧٤ _ لە قەتادەوە فەرموویەتی: ((پەروەردگار هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە مەگەر (إلا) جوان بووەو، دەنگ خۆش بووە، پێغەمبەرەکەشتان جوان و، دەنگ خۆش بوو، دەنگیشی نەدەلەراندەوە (لا يرجع))).

حسن ٢٧٥_ عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: صحيح ((كانت قراءة النبي صلى الله عليه وسلم ربما يسمعه من في الحُجْرَةِ، وهو في البيتِ)).

---

[٣٤٩] _ قال : واتە شوعبە فەرمووی چونکە ئەوە کە لە موعاویەوە دەیگێڕێتەوە.

[٣٥٠] _ اللحن، بفتح اللام وسكون الحاء واحد اللحون، واتە خۆشکردن و لەرانەوە و باشترکردنی خوێندن.

[٢٧٤] _ هذا الحديث مرسل لأنه من رواية التابعي الذي لم يذكر الصحابي.

(قلت : طرفه الأول ليس بحديث، لأنه لم يرفعه الى النبي صلى الله عليه وسلم، ثم إن إسناده غير صحيح، فيه حُسام بن مِصَك، قال الحافظ : ((ضعيف يكاد يترك)). فلا داعي للتوفيق بينه وبين حديث ابن مغفل الذي قبله كما فعل في الأصل).

[٢٧٥] _ أخرجه أبوداود في ((الصلاة / باب رفع الصوت بالقرآة)) حديث ١٣٢٧.

٢٧٥ _ لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوا لە خۆی و بابیشی بێت فەرموویەتی: ((پێدەچێت ئەوانەی لە ژوورەکەدا (حجرة) بوون گوێبیستی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون، ئەویش لە ماڵدا دەیخوێند)).

(قلت : وإسناده حسن صحيح كما هو مبين في ((صحيح أبي داود)) (١١٩٨) وانظر (صفة الصلاة)) وهذا الحديث يدل على توسطه صلى الله عليه وسلم في القرآة. واتە ئەم فەرموودەیە بەڵگەی مام ناوەندێتی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه و سلم لە خوێندندا.

## ٤٥_ بەشی ئەوەی سەبارەت بە گریانی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ٢٧٦_ عبدالله بن الشِّخِّير قال: ((أتيتُ رسولَ الله صلى الله عليه وسلم وهو يصلي، ولجوفِه أزيز كأزيز المِرْجَلِ [351] من البكاء)).

٢٧٦_ عەبدوڵای کوڕی شەخیر فەرموویەتی: ((چوومە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوکات نوێژی دەکرد و، لە ناخەوە کوڵانێکی هەبوو هاوشێوەی کوڵانی مەنجەڵ لە گریاندا)).

صحيح ٢٧٧_ عن عبدالله بن مسعود رضي الله عنه قال: قال لي رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((اقرأ عليَّ)). فقلت: يا رسول أقرأ عليك وعليك أنزلَ؟ قال: ((إني أحِبُّ أن أسمَعَهُ من غيري)). فقرأتُ سورةَ (النساء) حتى بلغتُ (وجئنا بِكَ على هؤلاء شهيداً) قال: فرأيت عَيْنَيْ رسولِ الله تَهمِلان)).

---

[276] _ أخرجه أبوداود في ((الصلاة)).

(قلت : برقم (٩٠٤)، وإسناده صحيح، وصححه جمع كما بينته في ((صحيح أبي داود)) برقم ٨٣٩).

[351] _ أي غليان كغليان القدر. وهذا دليل على كمال خوفه صلى الله عليه وسلم من ربه، ومعلوم أن العمل على قدر العلم والمعرفة، وهو صلى الله عليه وسلم سيد العارفين بالله، وقد قال صلى الله عليه وسلم : ((إني لأعلمكم بالله وأشدكم له خشية)). وقال : ((إني لأخشاكم لله وأتقاكم لله)) وقال : ((إني لأستغفر الله في اليوم مائة مرة)). واتە کوڵانێك هاوشێوەی کوڵانی مەنجەڵ. ئەمەش بەڵگەی بە تەواو ترسانی پێغەمبەرە صلى الله عليه و سلم لە خواکەی، زانراویشە کردەوە بە ئەندازەی زانین و ناسینە، پێغەمبەری خواش صلى الله عليه و سلم گەورەی خواناسەکانە، چونکە دەفەرموێت: ((من زاناترینتانم بە خواو لە هەمووشتان زیاتر ترسم لێیەتی)). وە فەرموویەتی : ((من لە هەمووتان زیاتر ترسم لێیەتی و لە هەمووشتان زیاتر خۆمی لێدەپارێزم)) وفەرموویەتی : ((من لە ڕۆژێکدا زیاتر لە سەد جار (أستغفر الله) دەکەم.

[277] _ أخرجه المؤلف في ((التفسير)) برقم ٣٠٢٨ والشيخان وأبوداود والنسائي.

٢٧٧ _ لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ((قورئانم بۆ بخوێنەوە)). گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا قورئان بۆ تۆ بخوێنم و بۆ تۆش دابەزیوە؟ فەرمووی: ((من ئارەزووی بیستنی دەکەم لە کەسانی تر)). ئەوجا سورەتی (النساء)م بۆ خوێند تا گەشتم بە ئایەتی (وجئنا بك علی هؤلاء شهیداً) واتە (تۆشمان هێنا ئەی محمد ﷺ بە شایەت بە سەر ئەو خەڵکەوە)) [+]). عبدولای کوڕی مەسعود فەرمووی: بینیم چاوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ فرمێسکی دەڕشت)).

٢٧٨_ عن عبدالله بن عمرو قال: صحیح انكَسَفَتِ الشمسُ يوماً على عهدِ رسول ِالله صلى الله عليه وسلم، (٣٥٢) فـقـامَ رسولُ الله صلى الله عليه وسلم يصلي

---

[+] _ تەفسیری ئاسان.

[٢٧٨] _ أخرجه النسائي في ((صلاة الكسوف)).

(قـلـت : وكـذا أبـوداود (١١٩٤)، وهـو مخـرج في ((صـحيح أبـي داود)) (١٠٧٩) و((إرواء الغليـل)) (٢٦٢)، وسنده صحيح عند بعضهم، وفيه ركوعان في ركعة، وهو المحفوظ في أحاديث الكسـوف في ((الصحيحين)) وغيرهما عن ابن عمرو وغيره كما هـو مـبين في المصـدرين المـذكور، وقـد فصلته تفصيلا في جزء لي في ((صفة صلاة الكسوف))، فما في رواية الكتاب من ذكـر الركـوع مـرة شـاذ لا يصح).

وفي هذا الحديث إبطال ما كان أهـل الجاهليـة يعتقدونـه مـن تـأثير الكواكب في الأرض فالكسـوف يوجب حدوث تغيير في الأرض موتـا أو ضـرراً، فـأعلم الـنبي صـلى الله عليـه وسـلم أنـه أعتقـاد باطل.واتە ( سەنەد )ی فەرموودەکە بە لای هەندێك زانایانەوە ( صـحیح )ە و، لـە هـەر ڕکاتێکیشـدا دووجار ڕکوع بردنی تێدا یەو، لە فەرموودەکانی خۆرگیرانیشدا ئەمە پارێزراوە ( وهو المحفوظ ) کـە هەردوو زانای پایە بەرز ئیمامی بوخـاری و موسـلیم لـە ( صـحیح )ەکانیانـدا وزانایـانی دیکـەش لـە ئیبنــو عومــەرو کەســانی تریشــەوە گێڕاویانەتــەوە وەکــو ئــەوەی لــەو دوو سەرچــاوەیەدا ڕوونکراوەتەوەو، منیش لە بەشێکی خۆمـدا بـە نـاوی ( صـفة صـلاة الكسـوف ) درێـژەم پێداوە، ئەوەش کە لە ڕیوایەتی ئەم کتێبەدا هاتووەو باسی ڕکوع بردن بە یەك جار دەکات نامۆیـەو ڕاسـت نییە. لـەم فەرموودەیـەدا بیروبـاوەڕی خەڵـکانی تـاڤی نـەفامی پوچـکراوەتەوە کـە باوەڕیـان بـە کاریگەری هەسارەکان هەبووە بە سەر زەویدا کە گوایە خـۆرو مـانگگیران گۆڕانێك لـە سـەر زەوی پەیدا دەکەن بە مردن یا ژیان، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیـە و سـلم پوچـبونەوەی ئـەو باوەڕەی ڕوون کردەوە.

حتى لم يَـكَـدْ يَـركع، ثم ركع، فلم يَـكَـدْ يَـرفَـعُ رأسَهُ، ثم رفع رأسَـه، فـلـم يكد أن يسجدَ، ثم سَجَـدَ، فلم يَـكَـدْ أن يرفع رأسَـه، ثم رفع رأسَـه، فلم يكد أن يسجدَ، ثم سجدَ، فلم يكد أن يرفع رأسَـه، فجعل ينفخ ويبكي ويقول: رَبِّ ألم تَـعِـدني أن لا تُـعَذِّبَهُـم وأنا فيهم؟ رَبِّ ألم تَـعِـدني أن لا تعذبهم وهم يستغفرون، ونحن نَـسـتـغفرك؟ فلما صلى ركعتين انجلت الشمسُ، فـقـام فـحَـمَـدَ الله تعالى وأثـنى عليه ثم قال: ((إن الشمسَ والقمرَ آيتان مِن آيات الله لا يَـنـكسفان لموت أحدٍ ولا لحياتـه، فإذا انْـكَـسَـفا فافزعوا إلى ذكر الله)).(٣٥٣)

٢٧٨ _ لە عەبدوڵای كوڕی عەمر (جونكە لەحەدیسەكە عبدالله بن عمرو) فەرموویەتی: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕۆژێك خۆرگیران ڕویدا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا نوێژی دەكرد تا وەختەبوو نەچێتە ڕكوع، پاشان چەمایەوەو چووە ڕكوع، وەختەبوو سەری بەرزنەكاتەوە، پاشان سەری بەرزكردەوە. وەختەبوو نەچێتە سجود، پاشان چووە سجود، وەختەبوو سەری بەرز نەكاتەوە، پاشان سەری بەرزكردەوە. وەختەبوو نەچێتە سجود، پاشان چووە سجود، وەختەبوو سەری بەرزنەكاتەوە، ئینجا دەستیكرد بە فووكردن‌و دەگریاو دەیفەرموو: پەروەردگارم پەیمانت پێنەدام كە سزایان نەدەیت تا من لە نێوانیاندا بم؟، پەروەرگارم پەیمانت پێنەدام سزایان نەدەیت تا ئەوان داوای لێبوردن بكەن‌و، ئێمەش داوای لێبوردنت لێدەكەین؟ كە دوو ڕكات نوێژی كرد ڕۆژ دەركەوت، ئینجا هەستا سوپاس‌و ستایشی خوای كردو پاشان فەرمووی: ((خۆر و مانگ دوو

---

[٣٥٢] _ زاد البخاري : يوم مات إبراهيم فقال الناس : كسفت الشمس لموت إبراهيم. كان ذلك في السنة العاشرة. واتە ئیمامی بوخاری فەرموودەكە بەم زیادەوە دەگێـڕێـتەوە ؛ ئەو ڕووداوە لە ڕۆژی مردنی ئیبراهیمدا بوو ئەوەبوو خەڵـكی گوتیـان ؛ بە هـۆی مردنـی ئیبراهیمـەوە خـۆرگیران ڕوویدا. ئەو ڕوداوە لە ساڵی دەیەمی كۆچیدا بوو.

[٣٥٣] _ في رواية البخاري ((فـإذا رأيتموهـا فصلوا وادعـوا)). سميـت الصـلاة ذكـرا لإشـتمالها عليـه.واتـە لـە ( ریوایـە ) تەكـەی ئیمـامی بوخاریـدا هـاتووە (( هـەركات بینیتـان نویـژ بكـەن و دوعابكەن )) و نوێـژیش ناونراوە (ذكر) واتە یادكردنەوە چونكە هەر خۆی یادكردنەوەیە.

نیشانەن لە نیشانەكانی خوای پەروەردگار، هەركات بینیتان گیراون (انكسفا) هانا بەرنە بەر یادكردنەوە (ذكری) خوای تعالی)).

صحيح٢٧٩ _ عن ابن عباس قال: أخذ رسولُ الله صلى الله عليه وسلم ابنةً له تَـقْـضِي (٣٥٤) فاحْتَـضَـنَـها فوضعها بين يديه، فماتت وهي بين يديه، وصاحت أم أيمن، فقال يعني صلى الله عليه وسلم: أتَـبْكِـينَ عند رسول الله؟! فقالت: ألست أراك تبكي؟ قال: ((إني لستُ أبكي، إنـما هي رحمةٌ، (٣٥٥) إن المؤمنَ بكل خيرٍ على كل حالٍ، إنَّ نَـفْـسَـه تُـنـزع من بين جـنـبيه وهو يَـحْـمَـدُ الله عزوجل)).

٢٧٩_ لە ئیبنو عەباسەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ كچێكی خۆی هەڵگرت لە سەرەمەرگدا بوو لە ئامێزی گرتو خستیە نێوان دەستەكانیەوە، گیانی سپارد و لە نێوان دەستەكانیدا بوو، ئومو ئەیمەن دەستیكرد بە هاوارو گریان، فەرمووی (واتا پێغەمبەر ﷺ): لای پێغەمبەری خوادا دەگرێی؟! ئومو ئەیمەن فەرمووی: ئەی تۆ نابینم دەگرێی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((من ناگریم، لە ڕاستیدا ئەوە سۆزو بەزیەكە، لە هەموو بارێكدا ئیماندار هەر لە

---

[٢٧٩] _ أخرجه النسائي في ((الجنائز/ باب البكاء على الميت)) (١١/٤)

(قـلـت : وإسناد المؤلف صحيح، وصححه ابن حبان (٧٤٦) وهو مخرج في ((الصحيحة)) ١٦٣٢).

[٣٥٤] _ تَقْضِي : واتە لـە سـەرەمەرگدا بـوو. لـە (ڕیوایـە )تەكـەی ئیـمامی نەسائیشـدا هـاتووە كـە كچێـكی بچوك بووە و كچی زەینەبی كچی بووە لە عاصی كوڕی ڕەبیـع و بـە خـوازراویش (مجـاز) خستویەتیە پاڵ پێـغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و هەروەها بیروبـاوەڕی تـریش لـەو بـارەوە گوتراوە.

[٣٥٥] _ زاد في رواية الصحيحين : ((جعلها في قلوب عباده فـإنما يـرحم الله مـن عبـاده الرحمـاء)). واتە هەردوو ئیمامی پایە بەرز بوخاری و موسلیم ئەم زیادەیەشیان خستۆتە سـەر فەرموودەكـە : (( خوای تعالی خستویەتیە دڵی بەندەكانیـەوەو لـە ڕاستیشـدا خـوای تعـالی بـەزەی بـە بەنـدە بـە سۆزەكانیدا دێـتەوە.

وقد ورد ((أن العين تدمع وإن القلب يحـزن ولا نقـول إلا مـا يرضـى الـرب وإنـا لفراقـك يـا إبـراهيم لمحزونون)). واتە ئەمەش لە پێـغەمبەری خواوە صلى الله عليه و سلم هاتووە :(( چاو فرمێـسك دەڕێـژێ و دڵـیش غەمبار دەبێـت بەڵام هیچ ناڵـێـین جگە لەوەی جێـگەی ڕەزامەنـدی خـوای تعالایە و لە ڕاستیدا بۆ كۆچكردنت غەمبارین ئەی ئیبراهیم )).

خەیردایە، چونکە ڕوحی لە لاقەدەكانیەوە دەكێشرێتو ئەو سوپاس و ستایشی خوای عزوجل دەكات)).

صحیح ٢٨٠_ عن عائشة رضي الله عنها: ((أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قَبَّلَ عثمان بن مضعون وهو ميت، وهو يبكي أو قال: عيناه تُهْرقان)).

٢٨٠ _ لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێبێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی (عثمان كوڕی مضعون) كرد بە مردوویو دەگریا یا فەرمووی: چاوەكانی فرمێسكی دەڕشت)).

صحیح٢٨١ _ عن أنس بن مالك قال: ((شهدنا ابنة (٣٥٦) لرسول الله صلى الله عليه وسلم ورسول الله جالسٌ على القبر، فرأيت عينيه تَدْمعان فقال: ((أفيكم رجل لم يُقارِف (٣٥٧) الليلةَ؟)) قال أبو طلحة: (٣٥٨) أنا. قال: ((انزل)). فنزل في قبرها)).

---

٢٨٠ _ أخرجه المؤلف برقم ٩٨٩ وأبوداود برقم ٣١٦٣ وابن ماجة برقم ١٤٥٦.
(قلت: وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح)). وهو كما قال: فإن له شواهد تقويه، خرجت بعضها في ((أحكام الجنائز)) (ص ٢٠ _٢١)٠ ئەم فەرموودەیە شیاویتی ماچكردنی مردووی لە خواترس بە دەردەخات، چونکە ئیمامی ئەبوبەكر ماچی پێغەمبەری خوای صلى الله عليه و سلم كرد بە مردووی و دەیفەرموو: چاكیت و خۆشەویستیت بە مردووی و بە زیندوی ئەی دایك وبابم بە قوربانت بێت. پاشان ئیمامی ئەبوبەكر ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (إنك ميت...) إلخ. واتە تۆ دەمریت... هتد.

٢٨١ _ (قلت: أخرجه البخاري وغيره، وهو مخرج في ((أحكام الجنائز)) ص ١٤٩).

٣٥٦ _ شهدنا ابنة: واتە: ئامادەی ناشتنی ئومو كەلثومی خێزانی عوسمانی كوڕی عەفان بوون.

٣٥٧ _ يُقارف: ئەم ووشەیەی لە جیاتی جووت بوون بەكارهێناوە.

٣٥٨ _ أبو طلحة: كوڕی زەیدی كوڕی سەهلی ئەنصاری خەزرەجی نەجاری عەقەبی بەدریە، سەراپای جەنگەكانی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه و سلم بینیوەو پێغەمبەریش سەبارەت بە ئەبو طەلحە فەرموویەتی: ((دەنگی ئەبو طەلحە لە سوپادا لە سەد پیاو باشترە))، لە ڕۆژی جەنگی (حونەین) دا بیست پیاوی كوشتبوو، باخێكی هەبوو بە ناوی (بەیرەحاء) لە كاتی دابەزینی ئەم ئایەتەدا (لن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون) آل عمران / ٩٢. واتە

٢٨١_ لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە فەرموویەتی: ((ئامادەی ناشتنی کچێکی پێغەمبەری خوا بووین ﷺ و پێغەمبەری خواش ﷺ بە سەر گۆڕەکەوە دانیشتبوو، بینیم چاوەکانی فرمێسك دەرێژێ و فەرمووی: ((ئایا پیاوێکتان تێدایە ئەمشەو لە گەڵ خێزانەکەیدا جووت نەبووبێت؟)) ئەبو طەلحە فەرمووی: من. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دابەزە)). ئەوەبوو دابەزیە نێو گۆڕەکە)).

---

ئێوە هەرگیز ناگەنە پلەی چاکەو چاکەکاری هەتا لەو شتانەی کە خۆشتان دەوێت نەبەخشن. تەفسیری ئاسان. بەخێر بەخشیە موسلمانان. ئەبو طەلحە مامی ئەنەسە و مێردی ئومو سولەیمی دایکیشێتی. گوتراوە لە دەریادا کە چونە غەزا مردووە، بڕوانە کتێبی (تهذيب الأسماء)ی ئیمامی نەوەوی.

## ٤٦_ بەشی ئەوەی سەبارەت بە نوێنەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ٢٨٢_ عن عائشة رضي الله عنها قالت:((إنما كان فراشُ رسول ِ الله صلى الله عليه وسلم الذي ينام عليه من أَدَم ٍ (٣٥٩) حَشْوُهُ ليف)).

٢٨٢_ لە عائـشەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: ((لە ڕاستیدا نوێنەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە لە سەری دەنوست لە پێستە بوو پڕ كرابوو بە لفكەو ڕێشاڵـی دارەخورما)).

ضعيف جدا ٢٨٣_ جعفر بنْ محمد عن أبيه قال: ((سُئلتْ عائشةُ: ما كان فـراشُ رسول ِ الله صلى الله عليه وسلم في {بيتك}؟ قالت: من أَدَم ٍ حَشوه من لـيف)). وسئلت حفصة: ما كان فراشُ رسول ِ الله صلى الله عليه وسلم في بيتـك ؟ قالت: مِسْحاً (٣٦٠) نَثْنيه ثَنيَتَيْن ِ فينام عليه. فلما كان ذات ليلة ٍ قـلت: لو ثَنَيْتُهُ أربعَ ثَنْيات لكان أوطأ له. فَثَنَيْناه له بأربع ثَنْيات. فلما أصبح قال: ما فرشتموا لي الليلة؟ قالت: قلنا: هو فراشُكَ إلا أنا ثَنَيْناه بأربع ثَنْيات،

---

[٢٨٢] _ أخرجه مسلم في ((اللباس)) برقم ٢٠٨٢ والمؤلف فيه برقم ١٧٦١ وأبوداود فيه برقم ٤١٤٧ وابن ماجة بنحوه.

(قلت : وكذا البخاري في ((الرقاق))).

[٣٥٩] _ أَدَم، بفتحتين : جمع أديم : واتە پێستەی خۆشەكراو یا پێستە بە گشتی و ڕەهایی، (الليف) واتە لفكە و ڕێشاڵی دارەخورما.

[٢٨٣] _ في ((الجامع الصغير)) (كان فراشه مسحاً) : أخرجه المؤلف في ((الشمائل)) عن حفصة. ولم يذكر غيره.

(قلت : هذا القدر قطعة من حديث الباب كما ترى، وإسناده ضعيف جداً فيه عبدالله ابن ميمون وهو متروك، ووقع في الأصل (ابن مهدي) وهو تصحيف، وقد خرجته في ((الضعيفة)) (٤٨٧٧)، وسكت عنه ابن كثير).

[٣٦٠] _ مِسحاً، بكسر الميم وسكون السين : بەرگێكی ئەستورە لە خوری ئامادەكراوە بۆ نوێن.

قـلنا: هو أوطـأ لك، قـال: ((ردوه لحالتـه الأولى، فإنه مَنَعَتْني وطاءتُـه صلاتي الليلة)).

٢٨٣_ جەعفەری كوڕی محمد لە بابیەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ((لە عائـیشە یان پرسی: نوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ{لە مالـەكەی تۆدا} چ بوو؟ فەرمووی: لە پێستە بوو پڕ كرابوو بە لفكەو ڕێشالـی دارەخورما)). لە حەفصەشیان پرسی: نوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مالـەكەی تۆدا چ بوو؟ فەرمووی: ڕاخەر بوو دەماننووشتانەوە بە دوو قەدو لە سەری دەنووست. شەوێـكیان گوتم: ئەگەر بینووشتێنینەوە بە چوار قەد بۆی نزمتر دەبێت. ئەوەبوو بۆمان نوشتانەوە بە چوار قەد. كاتێ ڕۆژ بوویەوە فەرمووی: ئەمشەو چیتان بۆ ڕاخستبووم؟ حەفصە فەرمووی: گوتمان: نوێنەكەی خۆتە بەڵام نوشتانومانەتەوە بە چوار قەد، گوتمان: ئەوە بۆ تۆ نزمترە، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بیگەڕێننەوە بۆ یەكەم باری، چونكە نزمیەكەی ئەمشەو قەدەغەی نوێژی لێكردم)).

## ٤٧_ بەشی ئەوەی سەبارەت بە چاكێتی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ٢٨٤_ عن عمر بن خطاب قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((لا تُـطْرُوني (٣٦١) كما أطرت النـصارى ابن مريم، إنما أنا عَـبْـدٌ فقولوا: عبدُالله ورسولُـه)).

---

[٢٨٤] _ (قـلـت : أخرجـه البخـاري في ((الأنبيـاء)) والـدارمي (٢/٣٢٠) وأحمـد (١/٢٣ و٢٤ و٥٥) والطيالسي (٢٤٢٤) والبغوي في ((شرح السنة)) (١٣/٢٤٦) وقـال : ((حديث صحيح، أخرجه محمد)). يعني الإمام البخاري وهذا التصحيح من هذا الإمام من الأمثلة الكثيرة على جواز قولنا الذي كنا جرينا عليه في بعض تعليقاتنا : ((صحيح. رواه البخاري ومسلم)). وقد انكره بعض الحاقدين علينا، فرددته عليه بما لا مزيد في مقدمتي لـ ((شرح الطحاوية)) فليراجعها من شاء، وانظر التعليق الآتي على الحديث (٢٩٦). ثم إن الحديث عزاه ابن كثير لمسلم فوهم!)

[٣٦١] _ الإطـراء : چاكێـتی ستايشكردنە واتـە: زێـدەڕۆيی مەكـەن بـە چاكێـتی ستايشكردنم هاوشێـوەی زێـدەڕۆيی گاورەكـان بـە ستايشـكردنی عيسـا كـە كردويانـە بـە خواوەنـد يـا كـوڕی خواوەند. ( گوتم : بـە كارهێـنانی ئـەم فەرموودەيـە لـە بەشـی زێـدەڕۆكردن لـە ستايشـكردنی پێـغەمبەردا صلى الله عليـه و سلم گونجـاوی ناونانەكـەی دانـەر نييـە كـە بەشـەكەی ناونـاوە بـە خاكێـتی پێـغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم، چونكـە بـە ئاسايی زێـدەڕۆكردن هـاودەمی درۆكـردن و لـە سـنوور دەرچـونە لـە ئـاين، ئەمـەش حەرامـە، لـە بـەر ئـەوە قەدەغـەكردنی شـتگەلێـكی بەو هاوشێـوانە لەو كارانەيە كە خاكێـتی پێـغەمبەری خوا صلى الله عليـه و سلم بە ئاشكەرا ڕوون ناكاتەوە وەكو ئەوەی بە لای هەمووانەوە شتێـكی شاراوە نييە، لـە بـەر ئـەوە زۆر دورە مەبەستی دانەر ئەوە بێـت، لێـرەدا وا گونجاوە بگوترێـت مەبەستی پێغەمبەری خـوا صلى الله عليـه وسلم ئـەوە بـووە بلێـت: ستايشم مەكـەن بـە گشتیو ڕەهـايی (لا تمـدحوني مطلقا) چونـكە ديسـان ئـەوەش لـە ماناكـانی (الإطـراء) ە لـە ڕووی زمانيـەوە، هەرچـەند ئـەوە شياويـشە لـە بنچـينەدا، بـەڵام قەدەغـەكردنی شـتگەلێكی بـەو هاوشێـوانە دەكرێـت بـۆ داخستنی دەرگای بەهانە (من باب سد الذرائع) بێت، وەكو ئەوەی لە (علم الأصول) دا زانراوە، چونـكە واڵاكردنی دەرگای ستايشكردن (مدح) پـێـدەچێـت ببێـت بـە هۆكـاری پەيدا بـوونی دژكاری (مخالفة) لە شەرعدا وەكو ئەوەی لە وا قعدا بينراوە، يا بە نەفامی، يا بـە زێـدەڕۆكردن، بە يەكەوە تەماشايەكی ئەو گوتنانـە بكـەين كـە لـە ستايشـكردنی (مـدح)ی پێـغەمبەری خـوادا صلى الله عليه و سلم نوسراوە : دع ما أدعتـه النـصارى في نبيـهم واحكم بمـا شئت مـدحاً فيـه

٢٨٤_ لە عومەری كوڕی خەطابەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((زێدەڕۆیی لە چاكێتی ستایشكردنمدا مەكەن بە هاوشێوەی زێدەڕۆیی گاورەكان بە ستایشكردنی كوڕی مەریم، لە ڕاستیدا من بەندەی خوام، ئێوە بـلـێن: بەندەی خواو پێغەمبەرەكەی)).

صحيح ٢٨٥_ عن أنس بن مالك رضي الله عنه: أنَّ امرأةً (٣٦٢) جاءت إلى النبيِّ صلى الله عليه وسلم فقالتْ له: إن لي إليْكَ حاجة. فقال: ((اجلسي في أيِّ طريق المدينة شئتِ أجلِسْ (٣٦٣) إليك)).

---

واحتكم وا تـه : وازبێـنه لەو بانگەشانەی گاوران بۆ پێـغەمبەرەكەیان دەیكەن چ ئارەزوو دەكەی بە ستایشكردنی حوكم بدەو خۆویست كردار بكە چۆن گەیاندویەتی بەو ئاستەی كە دەربارەی گوتویەتی «فإن من جودك الدنيا و ضرتها ومن علومك علم اللوح والقلم.واتـه : لە بەخشندەیی تۆ دونیایەو ئەوەی تێیدایەتیو لەوح و قەڵەمیش یەكێكە لە زانستی تۆ. ئەمەش ڕاستەوخۆ ستایشكردنێتی بە شتێـكی پووچ، شتی بەو هاوشێـوانەش زۆرە بە تایبەت ئەوەی ناونراوە سرووده بە ئاینیەكان، قەدەغەكردنی پێـغەمبەری خواش صلى الله عليه و سلم بە ستایشكردنیی لە لایەن ئومەتەكەیەوە بە شتێـكی شیاو (جائز) بۆ ئەوەیە كە ستایشكار توشی حەرام و ناشیاو نەبێت، بێگومان ئەوەش لە خاكێـتی پێـغەمبەری خوایە صلى الله عليه و سلم وەكو ئەوەی تێـكڕای فەرموودەكانی ئەم بەشە شایەتی بۆ دەدەن، بە پێـچەوانەی هەڵـگرتنی قەدەغەكردنەكە بۆ ستایشـكردنی حەرام بە تەنها (بخلاف حمل النهي على المدح المحرم). ئەمەش شتێـكی شاراوە نیە إن شاء الله. بە پـشتـگیریكردنێـكی زیاتری فەرمایشتی لە كۆتـای ئەم فەرموودەیەدا كە دەڵێت : ((لە ڕاستیدا من بەندەی خوام...)). هـەروەكو ئـەوەی ئـەم فەرمایشتەی لە وەڵامدانەوەی پرسیارێـكی زانراودا فەرمویێـت بەم جۆرە : (ئەی چ بلـێـین لە ستایشی (مدح)ی تۆدا ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم؟ ئەویش فەرمویێـتی : ((بەندەی خوا و پێغەمبەرەكەی)) واتە ئەوە بلـێن كە لە شەرعدا ڕێـگەی پێـدراوە و من هەڵم گرتووە و تیامدایە و هیچ زیادەیەكی لە سەر دامەنێـن. لێـرەدا جێـگەی خۆیەتی بلـێـین ئەمڕۆ ئەو فەرمایشتانەی پێـغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە چ ئاستێـكی ئەو وەسفانەی هەندێـك موسـڵمانانداپە كەوا هەندێـك شـتـی وەكو مەولودنامەو شـتـی تریشیان داهێناوەو بە لای پێشـینەی چاكی ئەم ئومەتەوە نەناسراو بوو وەكو ئەوەی دەڵێـن؛ ڕوناكیو نورە. یا یەكەمین بە دیهێـنراوەكانی خوایەو، جبریل لە شەوی (إسراء)دا خزمەتـكاری بووەو، چەندین شتی تریش لە ستایشی پڕوپوچ. فـأعتبروا يا أولى الأبصار.

[٢٨٥] _ أخرجه البخاري ومسلم. (قـلـت : البخاري إنما رواه معلقاً في ((الأدب)) من طريق حميد الطويل : ثنا أنس به مختصراً. ووصله _ كالمؤلف_ أبوداود (٤٨١٨) وأحمد (٣/١١٩ و٢١٤)

٢٨٥_ لە ئەنەسی كوڕی مالكەوە ڕەزای خوای لێبێت: ژنێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی گوت: من پێویستیەكم بە تۆ هەیە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە هەر ڕێگەیەكی مەدینەدا ئارەزووی دەكەی دانیشە لات دادەنیشم)).

ضعيف ٢٨٦_ عن أنس بن مالك رضي الله عنه قال: ((كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يعود المرضى، ويشهدُ الجنائزَ، ويركب الحمارَ، ويجيب دعوة العبدِ، وكان يومَ بني قُـرَيْظَـةَ على حمارٍ مخطومٍ (٣٦٤) بِـحَـبْـلٍ من ليفٍ، وعليه إكافٌ (٣٦٥) مِـن لِـيفٍ)).

٢٨٦ _ لە ئەنەسی كوڕی مالـكەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی نەخۆشی دەكردو، ئامادەی ناشتنی تەرمی مردووەكان دەبوو، وەڵامی بانـگهێشتی بەندەكانی دەدایەوە، لە ڕۆژی بەنی (قورەیزە)دا بەسەر گوێ درێژێكەوە بوو جڵەو كرابوو بە حەبلێكی ڕێشاڵی دارەخورماو، كورتانێكیشی بە سەرەوە بو لە ڕێشاڵی دارەخورما)).

من هذا الوجه. وأما مسلم فوصله في ((الفضائل)) (٧٦) وكذا أبـوداود (٤٨١٩) وأبوالشـيخ (ص ٣٠) من طريق ثابت عن أنس. وأحمد أيضا (١٧٤/٣)من طريق علي بن زيد عنه).

[٣٦٢] _ لە بوخاریدا : ئافرەتێـك بووە لـە پشـتیوانان و لـە ( ریوایـە ) تێـكی تریشـدا : كوڕێـكی منداڵـی خۆی لە گەڵـدا بوو.

[٣٦٣] _ ئیمامی موسلیم لە ( ریوایە ) تێكدا فەرموودەكە بەم زیادەیەوە دەگێـڕێـتەوە : بـە تـەنیا لە گەڵـیدا كۆبـۆوە لـە ڕێـگەیەكدا تـا كارەكـەی تـەواو بـوو. مەبەسـتیش بـە دووركەوتنەوەكـە ئەوەبوو تا كەس گوێـبیسـتی سكاڵاكەی نەبێت.

[٢٨٦] _ أخرجه المؤلف في ((الجنائز)) وابن ماجة في ((التجارات)).

(قـلـت : وفي ((الزهد)) (٤١٧٨) وقال المؤلف ثـمَّـة (١٠١٧) : ((حـديث لا نعرفـه إلا مـن حـديث مسلم الأعور، يُـضـَّـف)). وقـال الحـافظ في ((التقريـب)) : ((واه)). ومـن طريقـه رواه الطيالسـي (٢٤٢٥) والبغوي ٣٦٧٣).

[٣٦٤] _ مخطوم : أي ذي خطم وهو (الزمام) : الحبل من ليف. واتە جڵـەو كرابـوو بـە حەبلێـكی ڕێـشاڵـی دارەخورما.

[٣٦٥] _ الإكاف : كورتان بۆ گوێـدرێـژ هاوشێـوەی زینە بۆ ئەسپ.

صحيح ٢٨٧_ عن أنس بن مالك رضي الله عنه قال: ((كان النبيُّ صلى الله عليه وسلم يُدعى إلى خبزِ الشعيرِ والإهَـالَـةِ السَّنِـخةِ (٣٦٦) فيجيبُ، ولقد كان له درعُ (٣٦٧) عندَ يهودي (٣٦٨) فما وجد ما يَـفُـكُّـها حتى مات)).

٢٨٧_ لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ بانـگهێشتی نانی جۆ و ڕۆنی بۆنـکردوو دەکرا و داواکەی بە جێدەهێنا، قەڵـغانەکەی بە لای جوولەکەیەکەوە بوو هیچی دەستنەکەوت بۆ کردنەوەی ڕەهنەکەی تا گیانی سپارد)).

صحيح٢٨٨ _ وعنه رضي الله عنه قال: حجَّ رسول الله صلى الله عليه وسلم على رَحلٍ رَثّ، (٣٦٩) وعليه قَـطِـيفةٌ لا تساوي أربعةَ دراهم، فقال: ((اللهم اجعله

---

[٢٨٧] _ أخرجه المؤلف في ((البيوع)) برقم ١٢١٥ والبخاري فيه برقم ١٠٤٦ و((الرهن)) والنسائي في ((البيوع)) وابن ماجة في ((الأحكام)).

٣٦٦ _ الإهالـة، بكسـر الهمـزة : هـەموو ڕۆنێـــکی تواوەیـە نـانی پێـــوە بخورێـــت، یـا ڕۆنـی بەستووەو، (السنخة) واتە ڕۆنی بۆنکردوو بە هۆی زۆری مانەوەوە.

[٣٦٧] _ ئیمامی بوخاری ئەم زیادەیەشی خستۆتە سەر فەرموودەکە : قەڵـغانێـك لـە ئاسـن، ئـەم قەڵــغانەش بە (ذات الفضول) ناو دەبرێــت.

[٣٦٨] _ ئەو پیاوەی قەڵـغانەکەی لابوو بە (رهن) نـاوی (ئـەبو شـەحم) ی جولەکـە بـوو لـە (بـەنی ظفر) کە تیرەیـەك بـوو لـە هـۆزی (ئـەوس)، کـە هاوپـەیمانیان بـووە وەکـو ئـەوەی لـە (الفتح)دا هاتووە. لە کتێبە سەرەکیەکەشدا بە (ئەنصاری) ناوبراوە! بـەڵام ئـەوە هەڵــەیەکی ئاشـکەرایە. قەڵـغانەکەشی لابوو بە (رهن) بە هۆی (٣٠) (صاع) جـۆوە بـە پێــی (ڕیوایـە) تـەکانی ئیمـامی بوخـاری و ئیبنوماجـە و تەبـەرانی و کەسـانی تـریش. ئیمـامی ئیبنوحیبـانیش دەگێڕێتــەوەو دەفەرمێت ماوەی ڕەهنەکە سالـێـك بوو، بەڵام پێـغەمبەری خـوا صلى الله عليـە وسلم پێــش تەواو بوونی مـاوەی ڕەهنەکـەی گیـانی سـپاردووە، ئاشکەراشـە ئیمـامی ئـەبو بـەکر ڕەهنەکـەی کـردەوە چـونکە تێـکڕای ئـەو قەرزانـەی بـە سـەر پێـــغەمبەری خـواوە بـوو گەڕانـدەوە بـۆ خاوەنەکانیان. سوودی فەرموودەکەش لەوەدایە کە : شیاوێــتی مامەڵـەکردنی بێـــباوەڕان بـە دەردەخات لە گەڵ خراپی دەستکەوتو خراپی مامەڵـەیاندا، هـەروەها شیاوێــتی ڕەهــنکردن و فرۆشتن و بە کرێــگرتنی چەك لە بێـباوەڕان بە دەردەخات ئەگەر سـەربازی نەبێــت. لەگـەڵ بـە دەرخستنی کڕینی بۆ ماوەیی (الشراء لأجل) وڕەهنکردن لە شارنشیندا.

حَجاً لا رِياءَ (٢٧٠) فيه ولا سُمعة)).وفي رواية: ((كنا نرى ثَمَنَها أربعة َدراهم، فلما استوت به راحلته قال: لَبَّيْكَ بحجةٍ لا سُمعةَ فيها ولا رياء /٣٣٣)).

٢٨٨_ هەر لە هەمان هاوەڵەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ بە سەر كۆپانی وشترێكی شڕەوە چوو بۆ حەج، جلێكی قەدیفەی پۆشیبوو نرخی چوار دیرهەم نەدەبوو، ئەوەبوو فەرمووی: ((پەروەردگارا بیكە بە حەجێك نە ڕووپامایی تێدا بێتو نە ناوبانگی)). لە (ڕیوایە) تێكی تریشدا: ((بە دیدی ئێمە نرخەكەی چوار دیرهەم بوو، كاتێكیش بەسەر كۆپانەكەوە دانیشت فەرمووی: پەیڕەویت دەكەم خوایە گیان بە حەجێك نە ناوبانگی تێدابێت و نە ڕووپامایی)).

•

صحيح ٢٨٩_ وعنه أيضاً رضي الله عنه قال: ((لم يكن شخصُ أحبَّ إليهم من رسولِ الله صلى الله عليه وسلم (٢٧١) قال: وكانوا إذا رأوه لم يقوموا لما يعلمون من كراهته لذلك)).

٢٨٩ _ لە هەمان هاوەڵەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: ((هیچ كەسێك بە لایانەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشەویستر نەبوو" ئەنەس فەرمووی: بەڵام ئەگەر بیانبینیایە لە پێشیدا هەڵنەدەستان چونكە دەیانزانی ڕقی لێیەتی)).

---

[٢٦٩] _ الرَّحل : دەخرێتە سەر پشتی وشتر بۆ سواربوونو بە (كۆپانیش) ناودەبرێت كە بە نیسبەت وشترەوە هاوشێوەی زینی ئەسپە و (الرث) واتە شڕ .

[٢٧٠] _ واتە بە دڵسۆزی بۆ خوای تعالی بێت.

[٢٨٩] _ أخرجه المؤلف في ((الأدب)) برقم ٢٧٥٥.

(قلت : والبخاري في ((الأدب المفرد)) (٩٤٦) وغيره كأبي الشيخ (ص ٦٣) وقال المؤلف : ((حديث حسن صحيح)) وهو على شرط مسلم وهو مخرج في ((الضعيفة)) تحت حديث ٣٤٦ ((لا تقوموا كما تقوم الأعاجم...))).

[٢٧١] _ ڕێزیان لێدەگرتو لە خودی خۆیان پەسەندیتر دەكرد، لە بەر ڕەزامەندیی نیشتمانی خۆیانیان بە جێهێشت و لەگەڵ باب و كوڕ و تیرەكانیاندا جەنگان تا ئەو ئاستەی ئەبا عوبەیدە بابی خۆی و موصعەبی كوڕی عومەیر براكەی و عومەر خاڵی خۆیانیان كوشت. پێغەمبەری خواش صلى الله عليه و سلم فەرموویەتی : ((ئیمانی هیچ كەسێكتان تەواو نابێت تا منی لە باب و برا و هەموو كەس لا خۆشەویستر نەبێت)).

صحيح ٢٩٠_ وعنه رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((لو أهدي إليَّ كُراعٌ لَقَبِلتُ، ولو دُعيتُ عليه لأجبْتُ)).

٢٩٠_ هەر لە هەمان هاوەڵەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر قووله پێیەکم پێبەخشرا قبووڵی دەکەم و، ئەگەر بانگهێشتی خواردنیشی کرام داواکە بە جێدێنم)).

صحيح ٢٩١_ عن جابر رضي الله عنه قال: ((جاءني رسولُ الله صلى الله عليه وسلم ليس بِـراكبِ بغل ولا بِـرْذَوْن)).

٢٩١ _ لە جابرەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ دیدەنی کردم نە سواری ئێستر ببوو نە بارگیر)).

صحيح ٢٩٢_ عن يوسف بن عبدالله بن سَلام (٣٧٢) قال: ((سمَّاني رسولُ الله صلى الله عليه وسلم يوسُفَ، وأقعدني في حِجره، ومسح على رأسي)).

---

[٢٩٠] _ أخرجه المؤلف في ((الأحكام)) برقم ١٣٣٨.
(قلت : وقال : ((حديث حسن صحيح)). وأخرجه البخاري في ((الهبة)) وأحمد (٤٢٤/٢ و٤٧٩و٤٨١ و٥١٢) من حديث أبي هريرة، وأحمد أيضاً (٢٠٩/٣) عن أنس).

[٢٩١] _ أخرجه البخاري عن جابر : ((أتاني رسول الله يعودوني وأبوبكر وهما ماشيان)) واته: ئیمامی بوخاری لە جابرەوە ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە بە بێژەی : (( پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم بە یاوەرەی ئەبو بەکر دیدەنیان کردم و بەپێ ڕێیان دەکرد )). سوودی فەرموودەکەش لەوەدایە کە خاکێتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە دەردەخات تا ئەو ئاستەی بە پێ دیدەنی هاوەڵانی دەکرد، چونکە پاداشتێکی زۆری تێدایە. وە (البرذون) : جۆرێکە لە ئاژەڵ لە ئەسپ جیاوازترەو، جەستەشی گەورەیە.
(قلت : هذا طرف من حديث أخرجه البخاري في ((المرضى)). ثم أخرجه فيه بعد أبواب مختصراً بلفظ الكتاب، وكذلك أخرجه أبوداود (٣٠٩٦) من طريق أحمد، وهذا في ((المسند)) (٣٧٣/٣)والمؤلف في ((سننه)) (٣٨٥٠) وقال : ((حسن صحيح))).

[٢٩٢] _ قلت : إسناده صحيح، رجاله كلهم ثقات. وأخرجه أحمد (٣٥/٤ و٦/٦) وعزاه في الأصل للطبراني فقط! وذكر أنه زاد في آخره : ((ودعا له بالبركة)).

٢٩٢_ یوسوفی کوڕی عەبدوڵای کوڕی سەلام فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ یوسفی ناونام و، لە کۆشیدا داینام و، دەستی بەسەردا هێنام)).

صحيح ٢٩٣_ عن عَمْرَةَ قالت: قيل لعائشة: ماذا كان يفعل رسول الله صلى الله عليه وسلم في بيته؟ قالت: ((كان بَشَراً من البَشَرِ "يَفْلِي ثوبه، ويَحلُبُ شاتَه، ويَخدِم نَفسَه)).

٢٩٣_ لە عەمرەوە فەرموویەتی: بە عائیشەیان گوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵەکەی خۆیدا چیدەکرد؟ فەرمووی: ((مرۆڤێک بوو لە مرۆڤەکان، جلەکەی خۆی خاوێن دەکرد و، مەڕەکەی خۆی دەدۆشیو، خزمەتی خۆی دەکرد)).

---

[٣٧٢] _ هاوەڵێکی بچوکە و کوڕی عەبدوڵای کوڕی سەلامە و، بابیشی مژدەی بەهەشتی پێدراوە.

[٢٩٣] _ ئەم فەرمودەیە لای دانەر بە ژمارە (٢٤٩١) ە بەم بێژەیە (لفظ) (لە هەڵسوڕاندنی پێشەی خێزانەکانیدا دەبوو))) والبخاري في ((الأدب)) و((الصلاة)) و((النفقات)). (گوتم: تەواوکاریشی لای هەردوکیان بەم جۆرەیە: ((ئەگەر کاتی نوێژ بوایە هەڵدەستا نوێژی دەکرد)) وهو في مختصر البخاري برقم (٣٧٢)، ولا يخفى أن هذا حديث آخر، وأما حديث الباب، فأخرجه المؤلف من طريق البخاري وهذا في ((الأدب المفرد)) والبغوي في ((شرح السنة)) (٣٦٧٦)، وضعف إسناده المعلق عليه، وفاته أنه جاء من طرق أخرى كما بينته في ((الصحيحة)) (٦٧١).

## ٤٨_ بەشی ئەوەی سەبارەت بە خوو و ڕەوشتی (خُلُق) پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

ضعيف ٢٩٤_ عن خارجة بن زيد بن ثابت قال: ((دخل نفر على زيدِ بن ثابت فقالوا له: حدِّثْنا أحاديثَ رسول الله صلى الله عليه وسلم. قال: ماذا أحدثكم؟ كُنتُ جارَه، فكان إذا نَزَلَ عليه الوحيُ بَعَثَ إليَّ، فكتبته له، فكنا إذا ذكرنا الدنيا ذكَرَها معنا، وإذا ذكَرْنا الآخرةَ ذكرها معنا، وإذا ذكرنا الطعامَ ذكره معنا، فكُلُّ هذا أحدِّثُكُم عن رسول الله صلى الله عليه وسلم)).

٢٩٤ _ لە خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی ثابیتەوە فەرموویەتی: ((چەند کەسێك چوونە دیدەنی زەیدی کوڕی ثابتو پێیان گوت: پێغەمبەری خوامان ﷺ بۆ باسبکە. زەیدیش فەرمووی: چیتان بۆ باسبکەم؟ دراوسێی بووم، هەرکات سروشی بۆ دابەزیایە کەسێکی دەنارد بە دوامداو، منیش بۆم دەنووسیەوە، ئینجا ئەگەر دونیامان یاد بکردایەوە لە گەڵماندا یادی دەکردەوەو، ئەگەر ڕۆژی دوایمان یاد بکردایەوە لە گەڵماندا یادی دەکردەوەو، ئەگەر خواردەمەنیشمان یاد بکردایەوە هەر لەگەڵماندا یادی دەکردەوە، هەموو ئەمانەتان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ باسدەکەم)).

حسن ٢٩٥_ عن عَمرو بن العاص قال: ((كان رسولُ الله صلى الله عليه وسلم يُقْبِل بوجهه وحديثِه على أشَرِّ القوم، يتألَّفُهم بذلك، فكان يُقْبِل

---

[٢٩٤] _ قلت: إسناده ضعيف، ورجاله ثقات غير سليمان بن خارجة بن زيد بن ثابت، فإنه مجهول كما يشير إلى ذلك الذهبي في ((الميزان)): ((وثِّقَ))، ما علمت روى عنه سوى الوليد شيخ الليث)) وأخرجه البغوي في ((شرح السنة)) (٣٦٧٩) من طريق المؤلف رحمهما الله تعالى، والطبراني في ((المعجم الكبير)) رقم (٤٨٨٢) من طريق سليمان. وذكره ابن كثير من رواية البيهقي من هذا الوجه ساكتا عليه!

[٢٩٥] _ أخرجه المؤلف برقم ٣٨٨٠ مختصراً ومسلم برقم ٢٣٨٥ والبخاري بنحوه.

بوجهه وحديثه عليّ، حتى ظننتُ أني خيرُ القوم، ﴿ فقلت: يا رسول الله! أنا خيرُ أو أبوبكر؟ قال: أبوبكر ﴾. فقلت: يا رسول الله! أنا خيرُ أو عُمَرُ؟، فقال: ((عُمَرُ)). فقلت: يا رسول الله! أنا خيرُ أو عثمان؟ قال: ((عثمان)). فلما سألتُ رسولَ الله صلى الله عليه وسلم فصَدَقَني، فلَوَدِدْتُ أني لم أكن سألتُه)).

٢٩٥_ لە عەمری كوڕی عاصەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ بە فەرمایشتی ڕووی لە خراپترینی خەڵكەكە دەكرد، بەوەش ئاشنایەتیو ڕێكێتی دروست دەكردو، بە ڕوو بەفەرمایشتیشی ڕووی لە من دەكرد، هەتا وام دەزانی من باشترینی خەڵكەكەبم، ﴿ ئەوەبوو گوتم: ئەی پیغەمبەری خوا! من چاكترم یا ئەبو بەكر؟ فەرمووی: ئەبو بەكر ﴾. گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! من چاكترم یا عومەر؟ فەرمووی: ((عومەر)). گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! من چاكترم یا عثمان؟ فەرمووی: ((عثمان)). كاتێك لە پێغەمبەری خوام پرسی ﷺ و بەڕاستی وەڵامی دامەوە، خۆزگەم دەخواست كە لێم نەپرسیبا)).

صحيح ٢٩٦_ عن أنس بن مالك رضي الله عنه قال: ((خَدَمتُ رسولَ الله صلى الله عليه وسلم عَشرَ سنين، فما قال لي أُفٍّ (٢٧٣) قَطُّ، وما قال لي لشيء صنعتُه: لِمَ صنعتَه، ولا لشيء تركتُه: لم تركتَه، وكان رسول الله صلى الله

---

(قلت : ما أخرجه هؤلاء غَيرُ هذا، فإنه ليس فيه إلا أن أبابكر خير الرجال، ولذلك أورده الهيثمي في ((المجمع)) من رواية الطبراني، وحسن إسناده، وهو كما قال " إن كان إبن إسحاق قد صرح فيها بالتحديث، فإنه قد عنعنه هنا، ولذلك خرجته في ((الضعيفة)) ٦١ ١٤).

[٢٩٦] _ المؤلف برقم ٢٠١٦ والبخاري في ((الأدب)) و ((الوصايا)) و ((الديات)) ومسلم وأبوداود برقم ٤٧٧٤. (قلت : والدارمي (١/ ٣١) وقال المؤلف : ((حديث حسن صحيح)). وتبعه البغوي فإنه أخرجه (٢٦٦٤) من طريقه وقال : ((حديث صحيح، أخرج مسلم آخره، وأخرجا أوله من طرق عن أنس))).

[٢٧٣] _ أُفّ " بضم الهمزة و تشديد الفاء وكسرها بالتنوين و بدون التنوين : وشەیەكی نیگەرانی و بیزاربوونە لە كاتی پەستیو وەڕسبووندا دەگوترێت. بۆ تاكو كۆو نێرو مێ بە هەمان شێوە بە كاردەهێنرێت.

عليه وسلم من أحسن الناس خُـلُـقاً، ولا مسَسْتُ خَـزاً(٢٧٤) ولا حريراً ولا شيئاً كان ألين من كَـفِّ رسولِ الله صلى الله عليه وسلم، ولا شممت مسكاً ولا عطراً كان أطيب من عـرَق النبي صلى الله عليه وسلم)).

٢٩٦ _ لە ئەنەسی كوڕی مالكەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: ((دە ساڵ خزمەتكاری پێغەمبەری خوا بووم ﷺ، هەرگیز پێی نەگوتم ئۆف، شتێكیشم كردبێت پێی نەگوتوم: بۆ كردوتەو شتێكیشم بە جێهێڵابێت پێی نەگوتوم: بۆ بە جێتهێڵاوە، پێغەمبەری خوا ﷺ چاكترینی خەڵـك بوو لە خوڕەوشتەوە، هەرگیز دەستم نەداوە نە لە ئاورێشمێكو، نە لە پەشمێكو، نە لە شتێك لە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ نەرمتربێت، بۆنی میسكێك یا عەترێكم نەكردوە لە ئارەقی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆن خۆشتر بێت)).

ضعيف ٢٩٧_ وعنه رضي الله عنه: عن رسول الله صلى الله عليه وسلم: أنه كان عنده رجل به أثَـر صُـفرة (٢٧٥) قال: وكان رسول الله صلى الله عليه وسلم لا يكاد يُواجه أحداً بشيءٍ يكرهُـه، فلما قام قال للقوم: ((لو قلتم له يَدَعُ هذه الصُّفْـرةَ)).

٢٩٧ _ لە هەمان هاوەڵـەوە ڕەزای خوای لێبێت: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ: كەوا پیاوێك لە خزمەتیدا بووە و پاشماوەی ڕەگی زەردی پێوە دیار بووە، ئەنەس فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ وەختەبوو ڕوو بە ڕووی هیچ كەسێك نەبوایەتەوە بە شتێك ڕقی لێبوایەتەوە، لە بەر ئەوە كاتێ پیاوەكە هەڵـسا بە خەڵـكەكەی فەرموو: ((ئەگەرپێتان بگوتایە وازی لەم ڕەنگە زەردە بهێنیبا)).

---

[٢٧٤] _ الخز : پۆشاكێـكە لە خوری و پەشم دروست دەكرێـت.

[٢٩٧] _ أخرجه أبوداود بنحوه.

(قلت : في ((الترجل)) (٤١٨٢) و ((الأدب)) (٤٧٨٩) وأحمد (١٣٣/٣ و ١٥٤ و ١٦٠). وفيه سلم العلوي قال الذهبي في ((الكاشف)) : ((ليس بالقوي)). وقال الحافظ : ((ضعيف)).

[٢٧٥] _ صفرة : واتە:پاشماوەی ڕەنگی زەردی زافەران.

صحيح ٢٩٨ _ عن عائشة أنها قالت: ((لم يكن رسول الله صلى الله عليه وسلم فاحشاً ولا مُتَفَحِشاً،(٢٧٦) ولا صخّاباً(٢٧٧) في ألأسواق، ولا يُجزيءُ بالسيئة ، ولكن يَعفو و يَصفَح)).

٢٩٨_ لە عائیشەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ بەد ڕەوشت نەبوو بەد ڕەوشتیشی نەدەنواند، لە بازاڕەکانیشدا دەم بە هاوار نەبوو، سزای بە خراپە نەدەدایەوە، بەڵکو دەیبورد و چاوی دەپۆشی)).

صحيح٢٩٩ _ وعنها رضي الله عنها قالت: ((ما ضَرَبَ رسولُ الله صلى الله عليه وسلم بيده شيئاً قط إلا أن يجاهدَ في سبيل الله، ولا ضَرَبَ خادماً ولا امرأةً)).

٢٩٩_ هەر لە هەمان هاوەڵەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: ((هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستەکانی خۆی لە شتێکی نەداوە مەگەر تێکۆشا بێت لە پێناوی خوا، وە نە لە خزمەتکارێك و نە لە ئافرەتێکیشی نەداوە)).

صحيح ٣٠٠ _ وعنها أيضا قالت: ((ما رأيتُ رسولَ الله صلى الله عليه وسلم مُنْتَصِراً من مَظلمة ظُلِمها قَطُّ ما لم يُنتهكْ من مَحارمِ الله شيء، فإذا

---

[298] _ أخرجه المؤلف في ((البر)) برقم ٢٠١٧.

(قلت : وقال : ((حديث حسن صحيح)) ورواه الطيالسي (٢٤٢٣) وأحمد (٦/ ١٧٤ و ٢٣٦و٢٤٦) وسنده صحيح، وللشطر الأول منه شواهد عند أبي الشيخ ص ٣٧).

[276] _ الفاحش : واتە؛ ڕەفتاری خراپ و ناجۆر لە خوو ڕەوشتیدا بە تایبەت لە گوفتارو کردەوەو سیفاتەکانیدا، ئەگەر چی بە کارهێنانی وشەکە لە بواری گوفتاردا زیاترە. (المتفحش) واتە: بەد ڕەوشتی نەدەنواد.

[277] _ الصخاب : دەم بە هاوار.

[299] _ أخرجه ابن ماجة في ((النكاح)) برقم ١٩٨٤.

(قلت : هذا تقصير فاحش، فإنه مع أنه ليس عنده الأستثناء، فقد رواه مسلم فيه (٧٩) بتمامه، وكذا الدارمي (٢/١٤٧) وأحمد (٦/٣٢ و٢٠٦ و٢٢٩و٢٣٢و٢٨١) وابن سعد (١/٣٦٧). ولأبي داود (٤٧٨٦)الجملة الأخيرة منه).

[300] _ البخاري في ((الحدود)) وفي ((صفة النبي صلى الله عليه وسلم)) وفي ((الأدب)) ومسلم في ((فضائل النبي صلى الله عليه وسلم)) وأبوداود في ((الأدب)) برقم ٤٧٨٥ و((الطب)). ((قلت :

انتُـهِـك من محارم الله شيء كان مِـنْ أشدِّهم في ذلك غَـضباً، (٣٧٨) وما خُـيِّـر بين أمرين إلا اختـار أيْـسَرَهُـما، ما لم يكن مَـأْثَـمَاً)).

٣٠٠ _ دیسـان لە هەمان هاوەڵەوە فەرموویەتی: ((هەرگیز نەم بینیوە پێغەمبەری خوا ﷺ تۆڵە بكاتەوە دەرهەق بە ستەمكاریەك ستەمی لێكرابێت تاوەكو سنووری خوای تعالی پێشێل نەكرابا، ئەوجا هەركات سنووری خوای تعالی پێشێل بكرایە توندترینیان بوو لە تورەبووندا، وە سەر پشكی نێوان دوو كاریش نەدەكرا مەگەر ساناترینیانی هەڵدەبژارد، ئەگەر تاوان نەبوایە)).

صحيح ٣٠١_ وعنها رضي الله عنها قالت: استـأذنَ رجلٌ على رسول الله صلى الله عليه وسلم وأنا عنده، فقال: ((بئسَ ابنُ العَـشيرةِ (أو) (٣٧٩) أخو العَـشيرة)). ثم أَذِنَ له، فلما دخل ألانَ له الـقولَ، (٣٨٠) فلما خرج قـلـت: يا رسول الله! قـلـتَ ما قـلـتَ ثم ألنتَ له الـقـولَ. فقال: ((يا عائـشة إنَّ مِـن شَـرِّ الناس مَـن تَـرَكَـه الناسُ أو وَدَعَـه الناسُ اتـقـاءَ فُـحْـشِـه )).

وكذا أحمد (٦/٣٢ و١١٤ و١١٦ و١٣٠ و١٨٢ و٢٢٣و ٢٣٢ و٢٦٢و٢٨١) وأبوالشيخ (ص ٣٥ و٣٦)، وأحد ألفاظه بلفظ الكتاب، بخلاف الأخرين فـإنه رووه بنحوه، وأحد أسانيد مسلم إسناد المؤلف، إلا أنه لم يسبق لفظه فليؤخذ من هنا)).

[٣٧٨] _ واتە: تۆڵە بكاتەوە لەو كەسەی تاوانەكەی دەكرد چونكە لـە لايـەن ئـاين و بیروبـاوەڕەوە تۆكمە بوو.

[٣٠١] _ المؤلف في ((البر)) بـرقم ١٩٩٧ والبخـاري في ((الأدب)) ومسـلم بـرقم ٢٥٩١ وأبـوداود بـرقم ٤٧٩١.

(قـلـت : وأحمد (٦/ ٣٨ و٨٠ و١٥٨و ١٧٣) وقال المؤلف : ((حديث حسن صحيح))).

[٣٧٩] _ الشك من الراوي، ورواية البخاري : ((أخو العشيرة)) دون الشك.

[٣٨٠] _ پێـغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم فەرمایشتەكانی بۆ ئەو پیاوە نەرمونیان كـردەوە بـۆ دروستكردنی ئاشنایەتی ڕێـكێـتی لـە گەڵـیدا لـە پێـناو موسڵـمان بـوونی هۆزەكەیدا چـونكە سـەرۆكیان بـوو گوێرایەڵیشـی بـوون، ئـەوەش لـە خـوو ڕەوشـتی دڵـڕەقانە، چـونكە ئەگـەر فەرمایشـتەكانی بـۆ نـەرمونیان نەكردایەتـەوە بـارودۆخی خێڵـەكەی تێـك دەداو ڕێـگای یاخیبونیشی بۆ دەڕازاندنەوە، چونكە خێڵەكەی سەرپێچی فەرمانیان نەدەكرد.

٣٠١ _ هەر لە هەمان هاوەڵـەوە فەرموویەتی: پیاوێك موڵـەتی هاتنە ژوورەوەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ خواستو من لە خزمەتیدا بووم. گوتی: ((هەژار كەویت كوڕی خێڵ (یا) برای خێڵ)). پاشان مۆڵــەتی پیاوەكەی دا، كە هاتە ژوورەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بە نەرمونیانی قسەی لەگەڵدا كرد، كاتێ چووە دەرەوە گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! چیت فەرموو فەرمووت پاشان بە نەرمی قسەت لەگەڵدا كرد. ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەی عائیشە خراپترینی كەس ئەوەیە خەڵــكی وازی لێبێنن یا بە جێیی بهێڵن بۆ خۆپاراستن لە خراپەی)).

صحيح ٣٠٢ _ عن جابر بن عبدالله يقول: ((ما سئل (٣٨١) رسولُ الله صلى الله عليه وسلم شيئـاً قط فقـال: لا)).

٣٠٢ _ جابری كوڕی عەبدولاّ دەفەرموێت: ((هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ داوای شتێكی لێنەكراوە و بلــێت: نەخێر)).

صحيح ٣٠٣_ عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: ((كان رسول الله صلى الله عليه وسلم أجودَ الناس بالخير، وكان أجودَ ما يكون في شهر رمضانَ حتى ينسلخ، فيأتيه جبريلُ فـيَـعرِضُ عليه القـرآن، فإذا لَقِيَه جبريلُ كان رسولُ الله صلى الله عليه وسلم أجودَ بالخير من الريح المرسلَة)).

---

[٣٠٢] _ أخرجه البخاري في ((الأدب)) ومسلم في ((الفضائل)).

(قـلـت : وكذا الدارمي (٣٤/١) والبغوي (٣٦٨٦) وصححه، وابـن سـعد (٣١٨/١) وأبوالشـيخ (ص ٥١). وله عنده شاهد من حديث أنس، وثان عن عائشة، وثـالث عن مالك بن ربيعة).

[٣٨١] _ پێغەمبەری خـوا صـلى الله علیـە و سـلم هـەرگیز داوای شتێــكی خـەیری دونیـایی لێـنەكراو بلـێت : ناتدەمێ و بیگەڕێنێـتەوە، بەڵـكو ئەگەر بەردەست بوایـە بـە ئاسـانی پێـیـدەدا، یـا بـە چەند گوفتارێـكی خۆش و سانا پەیمانی پێـدەدا یا دوعاو نزای خەیری بۆ دەكردو بە ڕێـی دەكرد.

[٣٠٣] _ أخرجه البخاري في ((بدء الوحي)) وفي ((صفة النبي صـلى الله عليـه وسـلم)) وفي ((فضـائل القرآن)) وبدء الخلق، ومسلم في ((فضائل النبي صلى الله عليه وسلم))

(قـلـت : والنسائي في أول ((الصوم)) وأحمد (١/ ٢٣١و٢٨٨و٣٢٦و٣٦٣و٣٦٦و٣٦٧و٣٧٣) وابـن سعد(٣٦٨/١و٣٦٩) وأبو الشيخ (ص٥) والبغوي ٣٦٨٧).

٣٠٣ _ لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ بەخشندەترین كەس بوو بە خەیرو چاكە، بەخشندەتریش دەبوو لە مانگی ڕەمەزاندا تا كۆتایی دەهات، لەو كاتەدا جبریل دەهاتە لای و ئەویش قورئانی بۆ دەخوێندەوە، ئینجا هەركات جبریلی پێگەیشتایە "پێغەمبەری خوا ﷺ لە بای خێراو بەردەوام بەخشندەتر دەبوو بە خەیرو چاكە)).

صحيح ٣٠٤ _ عن أنس بن مالك رضي الله تعالى عنه قال: ((كان النبي صلى الله عليه وسلم لا يدخر شيئاً لغد)).

٣٠٤ _ لە ئەنەسی كوڕی مالـكەوە ڕەزای خوای تعالای لێبێت فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شتێكی پاشەكەوت نەدەكرد بۆ سبەینێ)).

ضعيف ٣٠٥ _ عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه: ((أن رجلاً جاء إلى النبي صلى الله عليه وسلم فسأله أن يُعطِيَه. فقال النبي صلى الله عليه وسلم: ((ما عندي شيء، ولكن ابْتَـعْ عَلَـيَّ، فإذا جاءني شيء قَضَيْتُـه)). فقال عمر: يا رسول

---

[٣٠٤] _ أخرجه المؤلف في ((سننه)) في ((الزهد)) برقم ٢٣٦٣.

(قلت : واستغربه، لكن إسناده صحيح على شرط مسلم، وصححه ابن حبان (٢١٣٩ و٢٥٥٠) والبغوي (٣٦٩٠)، ووهم ابن كثير فقال : ((وهذا الحديث في الصحيحين))). ئەمەش لەبەر پشت پێ بەستنی تەواوی پێغەمبەری خوا بوو صلى الله عليه و سلم بە خواكەی، بەلام پێدەچێت بۆ خاوخێزانی خواردەمەنی سالێكی پاشەكەوت بكردایە لەبەر لاوازی پشبەستنیان بە بەراورد لە گەل پێغەمبەری خواداو، بۆ ئەوەی سونەتێكیش بێت بۆ بەخێوكارانی ئوممەتەكەی. چونكە لە((الصحيحين))یشدا هاتووە : كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم بۆ خاوخێزانی خواردەمەنی سالێكی پاشكەوت دەكرد.

[٣٠٥] _ قلت : إسناده ضعيف، فيه موسى بن أبي علقمة المديني وهو مجهول. وتابعه يحيى بن محمد بن حكيم، ولم أعرفه، ودونه عبد الله بن شبيب، وهو واه. وأخرجه أبوالشيخ (ص ٥٣). وفي ((المجمع)) (١٠/٢٤٢) :

((رواه البزار، وفيه إسحاق بن إبراهيم الحُنَيني، وقد ضعفه الجمهور، ووثقه ابن حبان وقال : ((يخطيء)))، والحديث سكت عليه الحافظ ابن كثير.

الله! قد أعطيتَه (٣٨٢) فما كَلَّفَكَ الله ما لا تقدر عليه، فكره صلى الله عليه وسلم قولَ عمر. فقال رجل من الأنصار: يا رسول الله! أنفق ولا تَخَفْ من ذي العرش إقلالاً)). فتبسم رسول الله صلى الله عليه وسلم، وعرف في وجهه البِشْر لقول الأنصاري، ثم قال:((بِهذا أمرتُ)).

٣٠٥ _ لە عومەری كوڕی خەطابەوە ڕەزای خوای لێبێت: ((پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای لێكرد پێی ببەخشێت. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هیچ شتێكم نییە، بەڵكو پێم بفرۆشە، هەركات شتێكم بۆ هات داواكەت بە جێ دێنم)). عومەر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! پێت بەخشیوەو خوای تعالی داوای كردنی كارێكی لێنەكردووی لە توانای تۆدا نەبێت، پێغەمبەری خوا ﷺ بە گوفتارەكانی عومەر ناقایل بوو. پیاوێك لە پشتیوانان فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! ببەخشەو مەترسێ خاوەن عەرش كەمی كاتەوە)) پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنە گرتیو، بە هۆی قسەكانی پیاوە پشتیوانەكەوە شادی بەڕوویەوە دەبینرا. پاشان فەرمووی: ((بەمە فەرمانم پێكراوە)).

صحيح ٣٠٦_ عن عائشة رضي الله عنها: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم كان يَقْبَلُ الهديَّةَ، و يُثيبُ عليها)).

٣٠٦ _ لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ دیاری قبوڵ دەكردو، پاداشتیشی لەسەر دەدایەوە)).

---

[٣٨٢] _ پێدەچێت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم لە جارێكی پێشودا پێی بەخشیبێت و پێشدەچێت مەبەستی ئیمامی عومەر ئەوە بێت كە چەند فەرمایشتێكی سانات بە گوێدا دا كاتێك فەرمووت ؛ هیچ شتێكم نییە، ئیتر پێویست بەوە ناكات هیچ شتێكی بۆ لە ئەستۆ بگریت.

[٣٠٦] _ أخرجه المؤلف في ((البر)) وأحمد والبخاري وأبوداود في ((البيوع)) برقم ٣٥٣٦.

قلت : وقال المؤلف : ((حديث حسن صحيح))، وهو مخرج في ((الإرواء)) (١٦٠٢).

## ٤٩_ بەشی ئەوەی سەبارەت بە شەرمی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ٣٠٧_ عن أبي سعيد الخدري قال: ((كان صلى الله عليه وسلم أشدَّ حياءً مِن العَذراء في خِـدْرِها، (٣٨٣) وكان إذا كره شيئـاً عُـرِفَ (٣٨٤) في وجهه)).

**٣٠٧ _ لە ئەبی سەعیدی خودریەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەورە كچی نێو پەردە بە شەرمتر بوو، هەركات شتێكیشی بە دڵ نەبووایە بە ڕوویەوە هەستی پێدەكرا)).**

ضعيف ٣٠٨_ عن مولى لعائشة قال: قالت عائشة: ((ما نظرت إلى فرج رسول الله صلى الله عليه وسلم. أو قالت: ما رأيت فَـرجَ رسول الله صلى الله عليه وسلم قط)).

**٣٠٨ _ لە هاریكارێكی عائیشەوە فەرموویەتی: عائـیشە فەرمووی: ((تەماشای ئەندامی نێرینەی (فەرج) پێغەمبەری خوام ﷺ نەكردوە. یا فەرمووی: هەرگیز ئەندامی نێرینەی (فەرج) پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە)).**

---

[٣٠٧] _ البخاري في ((صفة النبي صلى الله عليه وسلم)) وفي ((الأدب)) ومسلم في ((فضائل النبي صلى الله عليه وسلم)) وابن ماجة في ((الزهد)). برقم ٤١٨٠.

(قلت : وأحمد (٣/٧١ و٧٩و٨٨و٩١و٩٢) والطيالسي أيضاً (٢٤٢٩) وابن سعد (١/٣٦٨) وأبو الشيخ (٣٩و٤٠)، وله عنده شاهد من حديث أنس رضي الله عنه).

[٣٨٣] _ العذراء : كچی شوو نەكردوو، (الخدر) : واتە پەردە.

[٣٨٤] _ عرف في وجهه : واتە ڕووی دەگۆڕا و ئیتر هەستی پێـدەكرا كە ئەو شتەی بە دڵ نییە.

[٣٠٨] _ أخرجه ابن ماجة في ((الطهارة)) برقم ٦٦٦٢.

(قلت : وابن سعد (١/٣٨٤) وأحمد (٦/٦٣و١٩٠)، وإسناده ضعيف فيه مولى لعائشة لم يسم).

## ٥٠_ بەشی ئەوەی سەبارەت بە كەڵەشاخ كردنی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە: [٢٨٥]

صحيح ٣٠٩_ عن حُمَيدٍ قال: سُئِلَ أنسُ بنُ مالك عن كَسْبِ الحَجَّام؟ فقال: احْتَجَمَ رسولُ الله صلى الله عليه وسلم، حَجَمَهُ (أبوطَيْبَةَ)،(٢٨٦) فأمرَ له بصاعين (٢٨٧) من الطعام، وكَلَّم أهلَه، فوضعوا عنه مِن خَراجه، وقال: ((إن أفضل ما تَداويتُم به الحجامةُ،(٢٨٨) أو: إن مِن أمثلِ ما تداويتم به الحجامة)).

٣٠٩_ لە حومەیدەوە فەرموویەتی: سەبارەت بە دەستكەوتی كەڵەشاخگر لە ئەنەسی كوڕی مالكیان، پرسی؟ فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ كەڵەشاخیگرتو، ئەبو طەیبە كەڵەشاخی بۆ گرت، ئەوەبوو فەرمانیدا چوار گوێل (صاعین) خواردەمەنی بدرێتیو، لەگەڵ سەرگەورەكەشیدا دووا و، ئەویش لە باجەكەی كەم كردەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بە دڵنیای چاكترین چارەسەركردنتان بە كەڵەشاخە، یا: باشترین چارەسەركردنتان بە كەڵەشاخە)).

---

[٢٨٥] _ الحِجامة، بكسر الحاء : بریتیە لە ڕووشاندنی پێست و دەرهێنانی خوێنەكە بە پیاڵەی خوێن گرتن، ئەمەش بە كەڵەشاخگرتن ناو دەبرێت. كەڵەشاخگرتنی پێغەمبەری خواش صلى الله علیه و سلم ئاماژە بە ڕەوایەتی (مشروعیة) چارەسازی جەستە دەكاتو دژ بە پشتپێبەستنیش (توكل) نییە.

(٣٠٩) _ أخرجه المؤلف في ((البيوع)) برقم ١٢٧٨ والبخاري في ((الطب)) برقم ١٠٦٥ ومسلم في ((المساقاة)) برقم ٦٢ وأبوداود برقم ٣٢٢٤.

(قلت : وقال المؤلف : ((حديث حسن صحيح)) وأحمد (١٧٤/٣و١٨٢) وابن سعد (٤٤٣/١و٤٤٤).

[٢٨٦] _ أبوطيبة: ناوی نافیعەو بەندەیكی (بەنی حارثە) یا (ئەبی مەسعودی ئەنصاری) بوو.

[٢٨٧] _ الصاع : پێوەرێكە چوار گوێل لە خۆ دەگرێت.

[٢٨٨] _ ڕاسپاردەكە بۆ خەڵكی حیجازو ئەو وەڵاتە گەرمانەیە كە لە حوكمی حیجازدانو، كەڵەشاخگردنیش بە جیاوازی زەمەن و شوێن و تاقەت و ئارەزوو دەگۆڕێت.

٣١٠ _ عن علي قال: صحيح ((أن النبي صلى الله عليه وسلم احتجم، وامرني فأعطيتُ الحَجّامَ أجْرَه)).

**٣١٠ _ لە عەلیەوە فە رموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ کەلـەشاخیگرد و، فەرمانیشی بە من کرد کرێی کەڵەشاخگرەکەم دا)).**

صحيح ٣١١ _ عن ابن عباس أظنه قال: ((إن النبي صلى الله عليه وسلم احتجم على الأخدَعَيـْن، (٣٨٩) وبين الكتـِفَيْـن، وأعطى الحجّامَ أجرَه، ولو كان حراماً لم يُعطِه)).

**٣١١_ لە ئیبنو عەباسەوە بە مەزەندەم فەرمووی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەر هەردوو دەماری خوێنبەری ئەملاو ئەو لای ملیو، لە نێوان هەردوو شانیدا کەلـەشاخی کردو، کرێکەشی بە کەڵەشاخگرەکەداو، ئەگەر حەرامیش بووایە پێینەدەدا)).**

صحيح٣١٢ _ عن ابن عمر: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم دعا حَجّاما فحَجَمَه، وسأله: كم خراجك؟ فقال: ثلاثة آصُع. فوضع عنه صاعا، وأعطاه أجْرَه)).

---

[٣١٠] _ ابن ماجة في ((التجارات)) برقم ٢١٦٣.

(قلت : وأحمد (١/ ٩٠ و ١٣٤ و١٣٥) وسنده ضعيف، لكنه يتجبر بما قبله وما بعده).

[٣١١] _ أخرجه أبوداود في ((البيوع)) برقم ٣٤٢٣ والبخاري ومسلم بلفظ : ((حجم النبي صلى الله عليه وسلم عبد لبني بياضة فأعطاه النبي صلى الله عليه وسلم أجره، وكلم سيده، فخفف عنه من ضريبته ولو كان سحتاً لم يعطه النبي صلى الله عليه وسلم)). واتە هەردوو شێخی پایە بەرز فەرموودەکە دەگێڕنەوە بە بێژەی: ((بەندەیەکی (بەنی بەیاضة) هەڵسا بە کەڵەشاخگردنی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم کرێکەی دایەو، لەگەڵ سەرگەورەکەشیدا دووا، ئەویش هەندێك لە باجەکەی کەمکردەوەو ئەگەر حەرامیش بوایە پێی نەدەدا)).

قلت : وأحمد نحوه (١/٣١٦ و٣٢٤و ٣٣٣و ٣٦٥).

[٣٨٩] _ الأخدعان : دوو دەماری خوێن ڕاگوێزی ئەملاو ئەو لای ملن.

٣١٢ _ لە ئینو عومەرەوە: ((پێغەمبەری خوا ﷺ كەڵـەشاخگرێكی بانــگكرد و ئەوەبوو كەڵــەشاخی بۆ كردو، لێشی پرسی: باجەكەت چەندە؟ كەڵـەشاخگرەكەش گوتی: سێ (صاع)ە. پێغەمبەری خوا ﷺ (صاع)ێكی بۆ كەم كردەوەو، كرێكەشی پێدا)).

صحيح ٣١٢ _ عن أنس بن مالك رضي الله عنه قال: ((كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يحتجم في الأخدعين والكاهل، (٢٩٠) وكان يحتجم لِسَبْعَ عشرة، وتسعَ عشرة،(٢٩١) وإحدى وعشرين)).

٣١٣_ لە ئەنەسی كوری مالكەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەر هەردوو دەماری خوێن ڕاگوێزی ئەملاو ئەو لای ملیو سەرووی پشتیدا كەڵەشاخی دەكرد، لە حەڤــدەو، نۆزدەو، بیستو یەكی مانگیشدا كەڵەشاخی دەگرد))

صحيح ٣١٤_ وعنه: ((أن رسول الله صلى الله عليه وسلم احتَـجَمَ وهو مُحرِمُ بـ (مَلَل) (٢٩٢) على ظَـهرِ القَدَم )).

---

٣١٢ _ (قلت : حديث صحيح، ورجال إسناده ثقات غير ابن أبي ليلى، وأسمه محمد ابن عبد الرحمن وهو فقيه سيء الحفظ. لكن لحديثه شاهد بسند صحيح عن جابر مثله. أخرجه أحمد (٣٥٣/٣) وابن سعد (٤٤٣/١) وله عنده طريق أخرى. وشاهد آخر من حديث علي عند أحمد (١/ ١٣٥)، وهو رواية له في حديثه المتقدم آنفاً ٣١٠).

٣١٣ _ أخرجه المؤلف في ((الطب)) برقم ٢٠٥٥ وابن ماجة فيه برقم ٣٤٨٦ بنحوه.

(قلت : وقال المؤلف : ((حديث حسن غريب)). وصححه الحاكم على شرط الشيخين ووافقه الذهبي، وهو كما قالا، وله شاهد خرجته في ((الصحيحة)) ٩٠٧).

٢٩٠ _ الكاهل : واتە سەرووی پشــت.

٢٩١ _ واتە لە حەڤـدەمین شەوی ڕابردووی مانــگدا كەڵەشاخیـدەگرت و بەو جۆرە.

٣١٤ _ (قلت : إسناده صحيح على شرط الشيخين، وأخرجه أحمد (١٦٤/٣) وعنه أبو داود (١٨٣٧) والنسائي دون قوله : ((بملل)) وزاد : ((من وجع كان به))). واتە ئیمامی نەسائی فەرموودەكە دەگێڕێتەوە بە بێ فەرمایشتی (لە مەلەل)و ئەم زیادەیەشی دەخاتە سەر ؛ ((بە هۆی ئازارێكەوە توشی ببوو)).

٣١٤ _ لە هەمان هاوەڵەوە: ((پێغەمبەری خوا ﷺ لە (مەلەل) كەڵەشاخی كرد لە سەر پشتی پێی و ئیحرامیشی پۆشیبوو))

[٣٩٢] _ ملل : شوێـنێـكە كەوتۆتە نێوان مەكە و مەدینەی پیرۆزەوە و نزیكەی حەڤدە میل لە مەدینەوە دورە.

## ٥١ _ بەشى ئەوەى سەبارەت بە ناوەكانى پێغەمبەرى خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ٣١٥_ عن جبير بن مطعم قال: قال رسول الله عليه وسلم: ((إنَّ لي أسماءً: أنا محمد، وانا أحمد، وأنا الماحي الذي يَمحو الله بي الكفرَ، وأنا الحاشرُ الذي يَحشُرُ الناسَ على قدمي، (٣٩٣) وأنا العاقب، (٣٩٤) والعاقب الذي ليس بعده نبي)). (٣٩٥)

٣١٥_ لە جوبەيرى كورى مەطعەمەوە دەگێرنەوە فەرموويەتى: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى: ((من گەلێ ناوم هەيە:

من ﴿ محمد ﴾ م: رەوشت بەرز،

من ﴿ أحمد ﴾ م: سوپاسگوزار،

من ﴿ الماحي﴾ م: لابەر كە خواى تعالى كوفرم پێ لا دەبات،

من ﴿ الحاشر ﴾م: كۆكار كە لە رۆژى مەحشەردا پێشى خەڵك دەكەوم و بە دواشمدا خەڵك كۆدەكرێتەوە،

---

[٣١٥] _ أخرجه المؤلف في ((الأدب)) برقم ٢٨٤٢ والبخاري في ((صفة النبي صلى الله عليه وسلم)) وفي ((التفسير / سورة الصف)) ومسلم في ((فضائل النبي صلى الله عليه وسلم)). وزاد : ((ونبي الرحمة، ونبي التوبة)) وفي رواية ((ونبي الملحمة)). وا تە ئيمامى موسليم فەرموودەكە دەگێرێتەوەو ئەم زيادەيەشى دەخاتە سەر : ((پێغەمبەرى سۆز و ميهرەبانىو، پێغەمبەرى تەوبەكردن ))و لە (ريوايە)يەتێكى ديكەشدا ((وە پێغەمبەرى داستانى جەنگە مەزنەكان ))م (قلت : وقال المؤلف : ((حديث حسن صحيح)) والدارمي (٢/٢١٧) وابن سعد (١/ ١٠٤) وأحمد (٤/ ٨٠و٨٤). وله عنده طريق أخرى عن جبير بن مطعم (٤٣ / ٨١) وكذا ابن سعد).

[٣٩٣] _ لە رۆژى (مەحشەر)دا پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم پێشى خەڵك دەكەوێتو بەدوايشيدا خەڵك كۆدەكرێتەوە.

[٣٩٤] _ واتە لەپاش پێغەمبەرانەوە هاتووە و هيچ پێغەمبەرێكى ترى بە دوادا نايەت.

[٣٩٥] _ گوتراوە ئەمە لە فەرمايشتەكانى ئيمامى (زوهريە ) كەوا بێ لە فەرموودەكەدا (مدرج) ه.

من ﴿ العاقب ﴾ م: جێگیر: جێگیریش كە لە دوای پێغەمبەرانەوە هاتووەو هیچ پێغەمبەرێك بە دوایدا نایەت.

حسن ٣١٦ _ عن حذيفة قال:لقيت النبي صلى الله عليه وسلم في بعض طرق المدينة فقال:((أنا محمدُ، وأنا أحمدُ، وأنا نَبِيُّ الرحمة ، (٣٩٦) ونَبِيُّ التوبةِ، وأنا المُقَفِّي، (٣٩٧) وأنا الحاشر، ونبيُّ الملاحم)). (٣٩٨)

٣١٦ _ لە حوذیفەوە فەرموویەتی: لە هەندێ ڕێگاكانی مەدینەدا چاوم كەوتە پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی: ((من ﴿ محمد ﴾م‌و، من ﴿ أحمد ﴾م، وەمن پێغەمبەری سۆزو میهرەبانیم‌و، پێغەمبەری تەوبەو پەشیمانیم‌و، من پەیڕەوكارم‌و، من كۆكارم‌و، پێغەمبەری داستانی جەنگە مەزنەكانم)).

---

[٣١٦] _ (قلت : إسناده حسن، وصححه ابن حبان (٢٠٩٥)، ورواه أحمد أيضا (٥/٤٠٥) وابن سعد)

[٣٩٦] _ قال تعالى : ((وما أرسلناك إلا رحمة للعالمين)) الأنبياء / ١٠٧. واتە (ئەی محمد ) ئێمە تۆمان ڕەوانە نەكردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت كە ببیتە ڕەحمەت و بەزەیی بۆ هەموو جیهانەكان ( جیهانی ئادەمیزادو، گیاندارو، ڕووەكو، پەری... هتد ) تەفسیری ئاسان. برهان محمد أمین.

[٣٩٧] _ المُقفِي، بكسر الفاء: ومعناه الذي قفا آثار من سبقه من الأنبياء قال تعالى: ((أولئك الذين هدى الله فبهداهم أقتده)) الأنعام / ٩٠ واتە ئەو پێغەمبەرەی بە دوای ئاسارو شوێن دەستی پێغەمبەرانی پێشكەوتی خۆی كەوت، خوای تعالی دەفەرمێت : ( ئەو ناوبراوانە ) ئەو كەسانەن كە خوا ( بە تایبەت ) هیدایەت و ڕێنموویی كردوون، تۆش (ئەی محمد صلی الله علیه وسلم، ئەی ئیماندار) شوێنی هیدایەت و ڕێنموویی ئەوانە بكەوە، تەفسیری ئاسان، برهان محمد أمین.المُقفَى بفتح الفاء، أي الذي قفى به آثار الأنبياء وختم به الرسالة، قال تعالى : ((ثم قفينا على آثارهم برسلنا)). الحديد / ٢٧. واتە ئەو پێغەمبەرەی پەروەردگار بە دوای ئاساری پێغەمبەراندا ناردوویەتی و پەیامەكەی كۆتایی پێهێناوە، خوای تعالی دەفەرمێت: لەوەودوا بە شوێن پێغەمبەراندا پێغەمبەرانی ترمان ڕەوانە كرد، تەفسیری ئاسان، برهان محمد أمین.

[٣٩٨] _ الملاحم : كۆی (ملحمة) یە واتە جەنگ، ئەو ناوەی لێنراوە چونكە گۆشتی خەڵك هەندێكیان بە هەندێكی تر تێكەڵ دەبێت.

## ٥٢ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە تەمەنی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ٣١٧_ عن ابن عباس قال: ((مَكَـثَ النبيُّ صلى الله عليه وسلم بمكةَ ثلاثَ عشرةَ سنة يُوحَى إليه، وبالمدينة عشراً، وتوفي وهو ابن ثلاث وستين)).

٣١٧ _ لە ئیبنو عەباسەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ سیازدە ساڵ لە (مەککە) دا مایەوە سروشی بۆ دادەبەزی‌و، دە ساڵـیش لە مەدینە، لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا بوو گیانی سپارد)).

صحيح ٣١٨_ عن جرير عن معاوية أنه سمعه يخطُب قال:((مات رسول الله صلى الله عليه وسلم وهو ابن ثلاث وستين، وأبوبكر وعمر، وأنا (٣٩٩) ابن ثلاث وستين)).

٣١٨ _ لە جەریرەوە کە گوێبیستی موعاویە بوو وتاری دەداو دەیفەرموو: ((پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا بوو کۆچی دوای کردو،

---

[٣١٧] _ أخرجه المؤلف في ((المناقب)) برقم ٣٦٢٥ والبخاري في ((الهجرة)) و((المغازي)) وفي ((فضائل القرآن)) ومسلم في ((الفضائل)). (قلت : وقال المؤلف : ((حديث حسن صحيح)) وأحمد (١/٣٧٠ و٣٧١)، وله عنده طرق أخرى عن ابن عباس (١/ و ٣٧٠ و٣٧١) وعزوه للبخاري في ((الهجرة)) خطأ، فإنه ليس فيه إلا حديث عائشة الاتي بعد حديث، ثم إنه ليس عنده في الموضعين الأخرين سن الوفاة).

[٣١٨] _ أخرجه مسلم في ((فضائل النبي صلى الله عليه وسلم)).

(قلت : وقال المؤلف (٣٦٥٥) : ((حديث حسن صحيح)) وأحمد ٩٦/٤ و٩٧ و١٠٠).

[٣٩٩] _((وأنا أبن ثلاث وستين)). ئەمە گوفتارێـکی دەسپێـکراوە واتە:منیش چاوەڕوانی هاوکاتبونیانم و پێـدەچێـت لەم ساڵەمدا بمرم. ئیمامی نەوەوی بەم شێـوەیە لێـکیداوەتەوە . ئیمامی (القسطلاني) فەرموویەتی : (معاویە ) پێـش ناردنی پێـغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم بە پێـنج ساڵ لە دایك بووەو، مردنیشی دوای ئەو ساڵـەی ئامازەی پێـداوە لە فەرمودەکەدا دواکەوت‌و تا دەوروبەری هەشتا ساڵـی ژیاوە .

ئەبو بەکرو عومەریش، هەروەها منیش لە تەمەنی شەستو ساڵیدامو چاوەڕوانی هاوکاتبونی مردنیانم.

صحيح ٣١٩ _ عن عائشة: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم مات وهو ابن ثلاث وستين سنة)).

٣١٩ _ لە عائیشەوە: ((پێغەمبەری خوا ﷺ تەمەنی شەستو سێ ساڵ بوو کۆچی دوای کرد))

صحيح ٣٢٠ _ عن ابن عباس يقول: شاذ ((توفي رسول الله صلى الله عليه وسلم وهو ابن خمس وستين)).

٣٢٠ _ لە ئیبنو عەباسەوە دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ تەمەنی شەست و پێنج ساڵ بوو کۆچی دوای کرد)).

ضعيف ٣٢١ _ عن دَغْفَل (٤٠٠) بن حنظلة: ((أن النبي صلى الله عليه وسلم قُبِضَ وهو ابن خمسٍ وستين)). قال أبو عيسى: ودغفل لا نعرف له سماعاً من النبي صلى الله عليه وسلم، وكان في زمن النبي صلى الله عليه وسلم رجلاً.

---

[٣١٩] _ أخرجه المؤلف في ((المناقب)) والبخاري في ((المغازي)) و((صفة النبي صلى الله عليه وسلم)) ومسلم في ((الفضائل / باب كم سن النبي صلى الله عليه وسلم ؟)).
(قلت : وأحمد (٦/٩٣) وقال المؤلف : (٣٦٥٤): ((حسن صحيح))).

[٣٢٠] _ أخرجه المؤلف في ((المناقب)) برقم ٣٦٥٢ والبخاري في ((الهجرة)) وفي ((فضائل القرآن)) ومسلم في ((الفضائل))، ئیمامی محمدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری فەرموویەتی : (ریوایە )تی شەستو سێ زۆرترە. وە ئیمامی نەوەویش فەرموویەتی: ڕاستترو بەناوبانگترە، (عروة ) ش نکوڵی لە (ریوایە ) تەکەی ئیبنوعەباس دەکاتو فەرموویەتی: بە سەرەتای پێغەمبەرایەتی نەگەشتووە. (گوتم : بەڵکو نکوڵی لەو کەسانە دەکرێت کە ئەوەیان لە ئیبنو عەباسەوە گێڕاوەتەوە، چونکە بە (صحیح )ی فەرموودەی دیکەیان لێوە گێڕاوەتەوە هاوشێوەی ئەو فەرموودانەی کە زۆرینە لە سەرەتای بەشەکەدا دەیگێڕنەوەو، بەکارهێنراویش ئەمەیە وەکو ئیمامی (ئیبنو حەجەر) فەرموویەتی، ئەوەش کە پێچەوانەیەتی نامۆیە یا لێکدراوەتەوە ( شاذ أو مؤول ). ثم إن عزوه هذه الرواية للبخاري وهم محض، فإنه إنما روى في المواضع الثلاثة المشار إليها الحديث الأول كما تقدم).

٣٢١ _ لە دەغفەلــی کوڕی حەنـظەلەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ تەمەنی شەست و پێنج ساڵ بوو گیانی سپارد)). ئەبوو عیسی فەرموویەتی: هیچ گوێبیستێکی (دغفەل) مان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ پێنەگایشتووەو، لە سەردەمی پێغەمبەریشدا ﷺ پیاوێك بووە.

٣٢١ _ فهذا الحديث مرسل. (قـلـت : بل منكر).

٤٠٠ _ دغفل " بوزن جعفر : کوڕی (ئیبنو زەیدی سەدوسی) یە ڕەچەڵك ناسەو سەردەمی پێــش ئیسلام وپاش ئیسلامیشی بینیوە، چۆتە (بەصرە) و لە جەنگەکانی دژ بە (خوارج) دا کوژراوە.

## ٥٣ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە مردنی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ٣٢٢ _ عن أنس بن مالك قال: ((آخر نظرة نظرتُها إلى رسول الله عليه وسلم، كَشَفَ الستارة (٤٠١) يوم الاثنين، فنظرتُ إلى وجهه كأنَّه ورَقَةُ مُصحف، (٤٠٢) والناسُ خَلفَ أبي بكر، فكاد الناس أن يضطربوا، فأشار إلى الناس أن اثبُتُوا، وأبو بكر يؤمهم، وألقى السَّجفَ، وتوفي رسول الله صلى الله عليه وسلم من آخر ذلك اليوم)).

٣٢٢ _ لە ئەنەسی كوڕی مالكەوە فەرموویەتی: ((دوامین تەماشاكردنێك تەماشای پێغەمبەری خوام ﷺ تێدا كرد، ڕۆژی دووشەم بوو كە پەردەكەی هەڵدایەوە، تەماشای دەموچاویم كرد هاوشێوەی كاغەزی پەڕاو بوو، خەڵكەكەش لە پشتی (ئەبو بەكر)ەوە بوون، ئەوەندەی نەمابوو خەڵكەكە بشڵەژێن، بەڵام ئاماژەی بۆ خەڵكەكە كرد جێگیربن و، (ئەبو بەكر) پێش نوێژی بۆ دەكردن و، ئەوەبوو پەردەكەی دادایەوە و، پێغەمبەری خوا ﷺ لە كۆتای ئەو ڕۆژەدا گیانی سپارد))

---

[٣٢٢] _ أخرجه البخاري ومسلم بنحوه. (قلت : أخرجاه في ((الصلاة)) والنسائي وابن ماجة في ((الجنائز)) وابن سعد (٢١٦/٢) وأحمد (١١٠/٣) وسنده ثلاثي. وهو في ((مختصر البخاري)) برقم ٣٧٤).

[٤٠١] _ الستارة " بكسر السين : لە بنچینەدا بریتیە لەو شتەی مرۆڤ خۆی پێدادەپۆشێت، نەرێتیشیان بریتی بوو لە هەڵواسینی پەردە بە ماڵەكانیانەوە بۆیە لێرەدا مەبەست ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم فەرمانیدا بە هەڵدانەوەی پەردە هەڵواسراوەكەی ماڵە موبارەكەكەیانەوە .

[٤٠٢] _ كأنه ورقة مصحف: واتە هاوشێوەی كاغەزی پەڕاو لە جوانی و ڕوونیدا.

صحيح ٣٢٣_ عن عائشة قالت: ((كنت مسندةَ النبي صلى الله عليه وسلم إلى صدري، أو قالت: إلى حِجْري، فدعا بطَستٍ(٤٠٣) ليبول فيه، ثم بال فمات (٤٠٤))).

٣٢٣ _ لە عائیشەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوام ﷺ پاڵپشت كردبوو بە سینگمەوە، یا فەرمووی بە كۆشمەوە، بانگی كرد تەشتێكی بۆ بێنن میزی تێدا بكات، پاشان میزی كردو گیانی سپارد)).

ضعيف ٣٢٤ _ وعنها أيضا أنها قالت: رأيت رسولَ الله صلى الله عليه وسلم وهو بالموت، وعنده قدَحٌ فيه ماءٌ، وهو يُدخل يده في القدح ثم يمسح وجهه بالماء، ثم يقول: ((اللهم أعِنيٍّ على منكرات ﴿ الموت ﴾ أو قال: سكرات الموت)).

٣٢٤_ هەر لە هەمان هاوەڵەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوام بینیی ﷺ لە سەرەمەرگدا بوو، پەرداخێكی پڕ ئاوی لە تەنشتدا دانرابوو، دەستی دەكرد بە نێو پەرداخەكەداو بە ئاوەكە دەموچاوی دەسڕی‌و، پاشان دەیفەرموو:

---

[٣٢٣] _ (قلت : إسناده صحيح على شرط مسلم، وقد أخرجه النسائي في ((الطهارة)) و((الوصايا)) وابن سعد أيضاً(٢/٢٦٠ و٢٦١). وهو عند البخاري في ((المغازي)) و ((الوصايا)) ومسلم فيه (١٩) وابن ماجة (١٦٢٦)نحوه دون ذكر البول. وعزاه الحافظ في ((الفتح)) لرواية الإسماعيلي بلفظ : ((ليتفل)) ولعله محرف. والله أعلم).

[٤٠٣] _ الطست : واتە تەشت.

[٤٠٤] _ في رواية للبخاري ((قبضه الله وإن رأسه لبين سَحري و نَحْري)) واتە لە (ریوایە ) تێكی ئیمامی بوخاریدا هاتووە : (( خوای تعالى گیانی كێشاو سەری لە نێوان كۆنەندامی هەناسە و ملمدا بوو )) مەبەستیش ئەوەبوو كە لە كۆشیدا مردووە، ئەمەش ئیمامی بوخاری لە بەشەكانی ((المغازي)) و ((الخمس))دا دەیگێڕێتەوە.

[٣٢٤] _ أخرجه المؤلف في ((الجنائز)) برقم ٩٧٨ وابن ماجة برقم ١٦٢٣.

(قلت : ورواه ابن سعد (٢/٢٥٨) وأحمد (٦/٦٤و٧٠و٧٧و١٥١) وأستغربه المؤلف في بعض النسخ، وحسنه بل وصححه في نسخ أخرى، وهو أبعد ما يكون عن حال إسناده فإن فيه جهالة ونكارة كما بينته في الرد على الدكتور البوطي ((دفاع عن الحديث النبوي والسيرة)) ص ٥٧ و٥٩). فێنك كردنەوەی دەموچاویش بە ئاو بەڵگەی كۆشش كردنی سوكردنەوەی ئازارە. ( منكرات الموت ) واتە ناڕەحەتیەكانی مردن ئەوەش بە نیسبەت پێغەمبەرانەوە بەرزكردنەوەی پلەوپایەیە.

((پەروەردگارا یارمەتیدەرم بە لە سەر ناڕەحەتیەكانی ﴿ مردن ﴾ یا فەرمووی: تەنگانەكانی مردن))

صحيح ٣٢٥ _ وعنها قالت: ((لا أغبِـطُ أحداً بهَـوْنِ موتٍ،(٤٠٥) بعد الذي رأيتُ من شِـدَّةِ موتِ رسولِ الله صلى الله عليه وسلم)).

٣٢٥ _ لە هەمان هاوەڵـەوە فەرموویەتی: ((مژدەی ئاواتە خوازبوونی مردنێكی ئاسوودە بە كەس نادەم، پاش ئەوەی سەختی مردنی پێغەمبەری خوام بینی ﷺ))

٣٢٦_ وعنها قالت: صحيح لـّما قـُبِـضَ رسولُ الله صلى الله عليه وسلم اختـلفوا في دفـنه، فقال أبوبكر: سْمعتُ مِـنْ رسولِ الله صلى الله عليه وسلم شيئـاً ما نسيتُـه، قال: ((ما قـَبَضَ الله نـَبـِيّـاً إلا في الموضع ِالذي يُحِـبُّ أن يُـدفنَ فيه)).ادفنوه في موضع فراشه.

٣٢٦ لە هەمان هاوەڵەوە فەرموویەتی: ((كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ گیانی سپارد لەسەر ناشتنی پێكنەهاتن، ئەوە بوو (ئەبوبەكر) فەرمووی: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێبیستی شتێك بووم بیرم نەچۆتەوە، فەرمووی: ((خوای تعالی ڕوحی هیچ پێغەمبەرێكی نەكێشاوە مەگەر (إلا) لەو جێگەیەدا نەبێت كە خوازیاری ناشتن بووە تیایدا)). لە جێگەی نوێنەكەیدا بینێژن.

---

[٣٢٥] _ أخرجه المؤلف في ((الجنائز)) برقم ٩٧٩ والنسائي فيه.
(سـكت عنه المؤلف، ولعل ذلك لأن فيه عبد الرحمن بن العلاء بن اللجلاج، لم يوثـقه غير ابن حبان، فهو مجهول. لكنه عند النسائي من غير طريقه، وكذلك رواه البخاري أيضاً في آخر ((المغازي)) وأحمد ٦/ ٦٤ و ٧٧).

[٤٠٥] _ واتە بە مردنێـكی ئاسوودە سەختی تێـدا نەبێـت.

[٣٢٦] _ أخرجه المؤلف في ((الجنائز)) برقم ١٠١٨.
قـلـت : واستغربه المؤلف لأن فيه عبد الرحمن بن أبي بكر المليكي. لكن الحديث صحيح بما له من الشواهد كما هو مبين في ((أحكام الجنائز)) (ص ١٣٧ و١٣٨).

صحيح ٣٢٧ _ عن ابن عباس وعائشة: ((أن أبا بكر قبَّل النبي صلى الله عليه وسلم بعدما مات)).

٣٢٧ _ لە ئیبنو عەباس و عائیشەوە فەرموویانە: (((ئەبو بەكر) هەڵسا بە ماچكردنی پێغەمبەری خوا ﷺ پاش ئەوەی گیانی سپارد)

حسن ٣٢٨_ وعنها: ((أن أبابكر دخل على النبي صلى الله عليه وسلم بعد وفاته فوضع فمه بين عينيه، ووضع يديه على ساعديه وقال: وانبياه! واصفياه! واخليلاه!)).

٣٢٨ _ هەر لە هەمان هاوەڵەوە: (((ئەبو بكر) چووە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پاش مردنی و دەمی خستە نێوان چاوەكانی‌و، دەستەكانی خستە سەر هەردوو باسكی‌و فەرمووی: بە داخەوە بۆ پێغەمبەر، بە داخەوە بۆ هاوڕێی دڵسۆزو بە ئەمەك، بە داخەوە بۆ دۆستو برادەری گیانی بە گیانی)).

صحيح ٣٢٩_ عن أنس قال: ((لـمَّا كان اليومُ الذي دَخَلَ فيه رسولُ الله صلى الله عليه وسلم المدينةَ، أضاء منها كُلُّ شيء، فلما كان اليوم الذي مات فيه

---

[٣٢٧] _ أشار إليه المؤلف في ((الجنائز)) بعد حديث ٩٨٩ وأخرجه ابن ماجة برقم ١٤٥٧.
(قلت : وإسناده صحيح على شرط مسلم. وأخرجه أحمد أيضاً (٦/٥٥). وله عند النسائي طريق ثانية، وزاد : ((بين عينيه)).واتە ئیمامی نەسائی لە ڕێگەیەكی دووەمەوە فەرموودەكەی گێڕاوەتەوەو ئەم زیادەیەشی تێدایە : ((لە نێوان هەردوو چاویدا)). والمؤلف (٩٨٩) وابن ماجة (١٤٥٦) من طريق ثالثة عن عائشة فقط، وقال المؤلف : ((حسن صحيح)). وله عنده طريق رابعة وهو الآتي بعده. وخامسة عند البخاري وغيره وهو في ((أحكام الجنائز)) ص ٢٠و٢١).
[٣٢٨] _ (قلت : رجال إسناده ثقات إلا يزيد بن بابنوس، ما روى عنه غير أبي عمران الجوني، وقال الدارقطني : ((لا بأس به))، وذكره إبن حبان في ((الثقات))، فهو حسن الإسناد إن شاء الله تعالى. وقد رواه أحمد (٦/٣١) مختصراً كما هنا و(٦/٢١٦) مطولاً، وكذا ابن سعد ٢/٢٦٧).
[٣٢٩] _ أخرجه المؤلف في ((المناقب)) برقم ٣٦٢٢ وابن ماجة في ((الجنائز)) برقم ١٦٣١. (قلت : وقال المؤلف : ((حديث صحيح غريب)) وصححه ابن حبان أيضاً (٢١٦٢) والحاكم (٣/٥٧) على شرط مسلم ووافقه الذهبي. وأخرجه أحمد أيضاً (٢/٢٢١و٢٦٨) وابن سعد ٢/٢٧٤).

أظلم منها كُـلُّ شـيء، وما نَـفَـضْـنا أيدينا من الترابِ وإنّـا لَـفي دفـنِـه حتى أنـكرنا قـلوبَـنا (٤٠٦))).

٣٢٩ _ لە ئەنەسەوە فەرموویەتی: ((ئەو ڕۆژەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنایە مەدینە، هەموو شتێكی تێدا ڕووناك بویەوەو، ئەو ڕۆژەش گیانی سپارد هەموو شتێكی تێدا تاریك بوو، دەستمان لە خاكوخۆڵكە نەتەكاندبو، هێشتا لە ناشتنیدا بووین تا لە ئەنجامی خەمێكی زۆرو بچڕانی سروش (وەحی)و لە دەست چونی هاوەڵێتیدا خۆمان بیر چۆوە)).

صحيح ٣٣٠_ عن عائـشة قالت: ((توفي رسول الله صلى الله عليه وسلم يوم الأثـنين)).

٣٣٠ _ لە عائیشەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی دووشەم گیانی سپارد))

٣٣١ _ عن جعفر(٤٠٧) بن محمد عن أبيه (٤٠٨) قال: صحيح ((قُـبِـضَ رسول الله صلى الله عليه وسلم يومَ الأثـنين، فمكث ذلك اليومَ وليلة الثـلاثاء، ودُفِـنَ من

---

[٤٠٦] _ حتى أنكرنا قـلوبنا : ئەمە دەربڕینێكە سەبارەت بە سۆزو ئەندێشەیەك بۆ لە دەستدانی بەڕێزترینی پێغەمبەران.چونكە كاتێكی سەخت بوو تا خۆیانیان بیر چۆوە بە هۆی خەمو پەژارەیەكی زۆر و بچڕانی سروش (وحی )و لە دەستدانی هاوەڵێتیدا.

[٣٣٠] _ (قـلـت : أخرجه البخاري في ((الجنائز)) والطيالسي (٢٤٠٠) وأحمد (٦/٤٥و١١٨و١٣٢) في حديث تراه في ((مختصر البخاري)) برقم (٦٩٢). ووقع للمعلق هنا وهم عجيب، فقال : أخرجه الترمذي في ((الجنائز/ باب موت النبي صلى الله عليه وسلم)) يوم الأثنين وقد سألها أبوبكر : في أي يوم توفي رسول الله صلى الله عليه وسلم ؟ قالت : يوم الأثنين))٠ وهذا الباب لا وجود لهما في ((الترمذي))، وأظنه محرفا ًمن ((البخاري)) فإنه فيه. واتە دوانبێژ لێرەدا كەوتۆتە هەڵەیەكی سەرسوڕمێنەوە، كە دەڵێت : ئیمامی ترمذی (تخریج ) ی دەكات لە (الجنائز / بەشی مردنی پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم ) ڕۆژی دووشەم و ئەبو بەكریش لە دایكە عائیشەی پرسی : لە چ ڕۆژێكدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم گیانی سپارد ؟ فەرمووی : ڕۆژی دووشەم. چونكە ئەم بەشە بوونی لە (ترمذی )دا نیە، واشتێدەگەم لە (بوخاری ) وە گۆڕابێت بۆ (ترمذی ) چونكە خۆی لە (بوخاری ) دایە.

الليل (٤٠٩). ((قال سفيان)): (٤١٠) وقال غيره (٤١١): يُسمعُ صوت المَساحي (٤١٢) من آخر الليل)).

٣٣١ _ جەعفەری کوڕی محمد لە بابیەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی دووشەم گیانی سپارد، ئەو ڕۆژەو شەوی سێشەم مایەوە، لە نیوە شەوی چوارشەمدا نێژرا. ((سوفیانی کوڕی عویینە)) فەرموویەتی: کەسانی دیکەش جگە لە محمدی باقر فەرموویانە: دەنگی ڕاماڵەکان لە کۆتایی شەودا دەبیستران.

ضعيف ٣٣٢ _ عن أبي سلمة بن عبد الرحمن بن عوف قال: ((تُوُفِّي رسول الله صلى الله عليه وسلم يوم الأثنين، ودفن يوم الثلاثاء)). قال أبو عيسى: هذا حديث غريب.

---

[٣٣١] _ (قلت : إسناده صحيح رجاله كلهم ثقات رجال مسلم، لكنه مرسل، فإن محمداً هذا هو الباقر بن علي بن الحسين بن علي بن أبي طالب، من أفاضل ثقات أهل البيت وتابعيهم، ومن الظاهر أنه تلقاه عن آبائه الطاهرين، فقد رُوي معناه عن علي رضي الله عنه. أخرجه ابن سعد (٢٧٣/٢)، وله شاهد عن عائشة قالت : توفي النبي صلى الله علية وسلم يوم الأثنين ودفن ليلة الأربعاء. أخرجه أحمد (٦/ ١١٠) ورجاله ثقات. ثم روى (٢٧٤/٦) بسند جيد عنها : ((ما علمنا بدفنه صلى الله عليه وسلم حتى سمعنا صوت المساحي من جوف الليل، ليلة الأربعاء)).

[٤٠٧] _ جعفر : واتە جەعفەری صادق.

[٤٠٨] _ واتە : محمدی باقر کوڕی علی کوڕی زین العابد ین کوڕی حسن یەکێکە لە ( تابعین ) کەواتە فەرموودەکە ( مرسل ) ە.

[٤٠٩] _ واتە : شەوی چوار شەم، نیوەی شەو، بەڵام غوسڵ و کفن کردن ڕۆژی سێشەم ئەنجام درا.

[٤١٠] _ سفيان : واتە سوفیانی کوڕی عویینە کە پێشکەوتووە لە سەندەکەدا.

[٤١١] _ وقال غيره : واتە کەسانی تریش جگە لە محمدی باقر.

[٤١٢] _ المَساحي، بفتح الميم جمع مِسحاة بكسر الميم. لە خاکەناز دەچێت و ئەو کەسەش گۆڕەکەی هەڵکەند (ئەبو طەلحە ) بوو، ناشتنەکەشی دواکەوت بە هۆی جیاوازبوونیان لە سەر دیاری کردنی جێگەی ناشتنەکەی و سەرسوڕمانیان بەم کارەساتە گەورەیەو. سەرقاڵبونیان بە دانانی پێشەوایەك بەرژەوەندی موسڵمانان بەڕێوەبەرێت، دەنگی ڕاماڵەکانیش دەبیستران چونکە شەوێکی کپ بوو.

٣٣٢ _ لە ئەبی سەلەمەی کوڕی عبدولڕحمانی کوڕی عەوفەوە فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی دووشەم گیانی سپاردو، ڕۆژی سێ شەم نێژرا)). ئەبو عیسا فەرموویەتی: ئەمە فەرموودەیەکی (غەریب)ە.

صحيح ٣٣٣ _ عن سالم بن عُبَيد _ وكانت له صحبة _ قال: ((أُغمي على رسول الله صلى الله عليه وسلم في مَرَضِـه فـأفاق، فقال: ((حَـضَـرت الصلاةُ؟)). فقالوا: نعم. فقال: ((مُـروا بلالاً فليؤذِّنْ، ومُـروا أبا بكرٍ أنْ يُـصـليَ للناس)) أو قال: ((بالناس))، قال: ثم أُغمي عليه فأفاق فقال: ((حضرتِ الصلاة؟)). فقالوا: نعم، فقال: ((مُـروا بلالاً فليؤذن، ومروا أبابكر فليصل بالناس)). فقالت عائشة: إن أبي رَجلٌ أسيفٌ (٤١٣) إذا قام ذلك المقامَ (٤١٤) بكى فلا يستطيع، فلو أمرتَ غَـيرَه. قال: ثم أغمي عليه فأفاق، فقال: مُروا بلالاً فيؤذن، ومروا أبابكر فليصل بالناس، فإنـَّكُن صَوَاحِبُ أو صواحباتُ (٤١٥) يوسف. قال: فأُمِـرَ بلالُ فـأذّن، وأمر أبوبكر فصلى بالناس، ثم إنَّ رسول الله صلى الله عليه وسلم وجد خِـفـَّـة، فقال: ((انظروا لي من أتـَّـكِـيءُ عليه)).

٣٣٣ _ لە سالمی کوڕی عوبێدەوە _ کە هاوەڵێتی هەبووە _ فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشیەکەیدا بووڕایەوەو ئینجا بەهۆش

---

[٣٣٢] _ (قـلـت : إسناده ضعيف لإرساله، وأشار إلى ذلك المؤلف بقوله : ((حديث غريب))، بل هو منكر لمخالفته لحديث عائشة الذي ذكرته آنفا، فلا داعي للتوفيق بينهما).

[٣٣٣] _ أخرجه ابن ماجة في ((الصلاة)) برقم ١٢٣٤ في ((باب صلاة رسول الله في مرضه)).

(قـلـت : إسناده وإسناد المؤلف واحد، وهو صحيح كما قال البوصيري في ((الزوائد))، لكن ليس عنده قوله : ((والله لا أسمع..)) إلخ. وروى من حديث عائشة وسهل بن سعد. فـانظرهما إن شئت في ((مختصر البخاري))٣٦٦ _٣٧٦).

[٤١٣] _ أسيف : غەمبارەو، غەم بە سەریدا زاڵە.

[٤١٤] _ إذا قام ذلك المقام: واتە ئەگەر لە جێـگەی پێـش نوێـژیدا بوەستێـت کە جێـگەی پێـغەمبەری خوا بوو صلى الله عليه و سلم.

[٤١٥] _ صواحبات يوسف: واتە هاوشێـوەی ژنانی هاوەڵی یوسفن بە دەرخستنی پێـچەوانەی شاردراوە لە دڵتاندا.

هاتەوەو، فەرمووی: ((كاتی نوێـژ هاتووە؟)). گوتیان: بەڵـێ. فەرمووی: ((فەرمان بدەن با بیلال بانگ بفەرمێـتو، فەرمانیش بدەن با (ئەبا بەکر) نوێـژ بۆ خەڵـکەکە بکات)) یا فەرمووی: ((بە خەڵکەکە))، سالم فەرمووی: ((پاشان بوورایەوەو بە هۆشیش هاتەوەو فەرمووی: ((كاتی نوێـژ هاتووە؟)). گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: ((فەرمان بدەن با بیلال بانـگ بفەرمێـتو، فەرمانیش بدەن با (ئەبا بەکر نوێـژ بە خەڵکەکە بکات)). ئەوەبوو عائیشە فەرمووی: بابم پیاوێـکی غەمبارەو ئەگەر لەو جێـگەیەدا بوەستێـت دەگریو ئیتر ناتوانێـت، ئەگەر فەرمانت بە کەسێـکی تر بکردایە. سالم فەرمووی: پاشان بوورایەوەو بە هۆش هاتەوەو، فەرمووی: فەرمان بدەن با بیلال بانـگ بفەرمێـتو، فەرمانیش بدەن با (ئەبا بەکر) نوێـژ بە خەڵکەکە بکات، چونکە ئێـوەهاوشێـوەی ژنانی هاوەڵـی یوسفن سەبارەت بە دەرخستنی پێـچەوانەی شاردراوە لە دڵتاندا. سالم فەرمووی: فەرماندرا بیلال بانـگی فەرموو، فەرمانیش درا (ئەبا بەکر) نوێـژی بە خەڵکەکە کرد، پاشان پێـغەمبەری خوا ﷺ هەستی بە سووکی لەشی کردو، فەرمووی: ((تەماشای کەسێـکم بۆ بکەن خۆمی بە سەردادەم)).

فجاءت بَريرة (٤١٦) ورجل آخر (٤١٧) فأتـكأ عليهما، فلما رآه أبوبكر ذهب لِينكُصَ، (٤١٨) فأوْمأ إليه أن يثـبتَ مكانَـه، حتى قضى أبوبكر صلاتَـه.ثم إن رسول الله صلى الله عليه وسلم قُـبِـضَ. فقال عمر: والله لا أسمع أحداً يذكر أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قبض إلا ضربته بسيفي هذا. قال: وكان الناس أميِّـين (٤١٩) لم يكن فيهم نبي قبله، فـأمسك الناسُ، فقالوا: يا سالم انطلق إلى

---

[٤١٦] _ بَريرة : ژنێـکی قبطی یا حبشی بوو، بەندەی عائیشە بوو.

[٤١٧] _ ورجل آخر : لە (ریوایە) تەکەی (الصحیحین) دا هاتووە کەوا پێـغەمبەری خوا صلی الله علیە و سلم چووە دەرەوە لە نێـوان عەباس و پیاوێـکی تردا کە (علی کوڕی ئەبی طالب) بوو. گوتراویشە (عەباس والفضلی) کوڕی بوون. نێـوان (ریوایە) تەکانیش کۆ دەکرێـتەوە بە زۆری چوونە دەرەوەی پێـغەمبەری خوا صلی الله علیە و سلم.

[٤١٨] _ لینکص : ویستی پاش کەوێـت.

[٤١٩] _ کان الناس أُمیِّین : واتە نە دەیانخوێـندەوەو، نە دەشیاننووسی.

صاحب رسول الله صلى الله عليه وسلم فـادْعُه، فـأتيتُـه أبكي دَهَـشاً، فلما رآني قال ﴿ لي ﴾: أقُـبِـضَ رسولُ الله صلى الله عليه وسلم؟ قـلـت: إن عُمرَ يقول: لا أسمعُ أحداً يَـذكرُ أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قُبِـضَ إلا ضربته بسيفي هذا! فقال لي: انطلق.

ئەوە بوو (بەریرە) و پیاوێـكی تر هاتنە پێـشەوەو خۆیدا بە سەریاندا، كاتێ (ئەبا بەكر) پێـغەمبەری خوای ﷺ بینی ویستی پاش كەوێت، بەڵام ئاماژەی بۆ كرد لە شوێـنەكەیدا جێـگیر بێـت، تا(ئەبا بەكر) نوێـژەكەی بە جێـهێـنا.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ گیانی سپارد. ئەوەبوو (عومەر) فەرمووی: سوێـند بە خوا گوێـبیستی هەر كەسێك بم و بڵـێـت پێـغەمبەری خوا ﷺ گیانی سپاردوە بەم شمشێـرە لێـی دەدەم. سالم فەرمووی: خەڵـكەكە نەخوێـندەوار بوون‌و لە پێـشیدا پێـغەمبەرێـكیان لە نێـواندا نەبوو، لەبەر ئەوە بێـدەنـگ بوون، گوتیان: ئەی سالم ڕاپەڕە بچۆ بانگی هاوەڵـی پێـغەمبەری خوا ﷺ بكە، منیش چوومە لای‌و بە سەرسوڕمانەوە دەگریام، كە تەماشای كردم ﴿ پێـی ﴾ فەرمووم: ئایا پێـغەمبەری خوا ﷺ گیانی سپاردوە؟ گوتم: (عومەر) دەفەرموێت: ئەگەر گوێـبیستی هەر كەسێـك بم‌و بـڵـێـت پێـغەمبەری خوا ﷺ گیانی سپاردوە بەم شمشێـرە لێـی دەدەم! (ئەبابەكر) پێـی فەرمووم: ڕاپەڕە.

فانطلقت معه، فجاء والناس قد دخلوا على رسول الله صلى الله عليه وسلم، فقال: يا أيها الناس أفرجوا لي. فـأفرجوا له. فجاء حتى أكبَّ عليه ومَـسه، فقال: (إنَّـك ميِّـتٌ وإنهم ميتون)، (٤٢٠) ثم قالوا: يا صاحبَ رسولِ الله أقُـبِـضَ رسولُ الله صلى الله عليه وسلم؟ قال: نعم. فعلموا أن قد صدق. قالوا: يا صاحبَ رسولُ الله: أيُـصَـلّـى على رسول الله؟ قـال: نعم، قالوا: وكيف؟ قال: يدخل قوم فيكبرون ويصلون ويدعون، ثم يخرجون، ثم يدخل قوم فيكبرون ويصلون ويدعون، ثم يخرجون، حتى يدخلَ الناسُ، قالوا: يا صاحبَ رسولِ الله! أيـدفن رسولُ الله صلى الله عليه وسلم؟

---

[٤٢٠] _ سورة الزمر / ٣٠.

قال: نعم. قالوا: أين؟ قال: في المكان الذي قبض الله فيه رُوحه، فإن الله لم يقبض روحه إلا في مكان طيب. فعلموا أن قد صدق، ثم أمرهم أن يُغَسِّلهُ بنو أبيه. (٤٢١) واجتمع المهاجرون يتشاورون، (٤٢٢) فقالوا:

لەگەڵیدا ڕاپەڕیم، کە گەشتە ئەوێ خەڵکەکە چوبونە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەی خەڵکینە ڕێگەم بدەن. ئەوە بوو ڕێیان بۆ کردەوە. هاتە پێشەوە تا خۆیدا بە سەریداو دەستی پێدا هێناو، فەرمووی: (إنك میت وإنهم میتون) واتە تۆ دەمریتو ئەوانیش دەمرن، پاشان خەڵکەکە گوتیان: ئەی هاوەڵی پێغەمبەری خوا ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ گیانی سپاردوە؟ (ئەبا بەکر) فەرمووی: بەڵێ. ئەوەبوو دڵنیابوون کە ڕاستی فەرمووە. ئینجا خەڵکەکە گوتیان: ئەی هاوەڵی پێغەمبەری خوا: ئایا پێغەمبەری خوا نوێژی لە سەر دەکرێت؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتیان: چۆن؟ فەرمووی: بەشێکی خەڵکەکە دێنە ژوورەوە (الله أكبر)و نوێژو دوعاو نزا دەکەن، پاشان دەچنە دەرەوەو، بەشێکی تری خەڵکەکە دێنە ژوورەوە (الله أكبر)و نوێژو دوعاو نزا دەکەنو، دەچنە دەرەوە، تا تێکڕای خەڵکەکە دەچنە ژوورەوە، گوتیان: ئەی هاوەڵی پێغەمبەری خوا! ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ دەنێژرێت؟ فەرمووی: بەڵێ. گوتیان: لە کوێ؟ فەرمووی: لەو جێگەیەدا کە پەروەردگار ڕوحی کێشاوە تیایدا، چونکە پەروەردگار ڕوحی نەکێشاوە مەگەر (إلا) لە جێگەیەکی پاکدا. ئەوەبوو دڵنیابوون کە ڕاستی فەرمووە، پاشان فەرمانی پێکردن خزمانی بابی بیشۆن. کۆچکردوانیش کۆبونەوە ڕاوێژیان دەکرد، گوتیان:

انطلق بنا إلى إخواننا من الأنصار نُدخلهم معنا في هذا الأمر. فقالت الأنصار: (٤٢٣) منا أمير، ومنكم أمير. فقال عمر (٤٢٤) بن الخطاب: من له مثل هذه

---

[٤٢١] _ بنو أبيه : ﴿ واتە خزمانی بابی ﴾ ئەوەبوو پێشەوامان (عەلی کوڕی ئەبی طالب) ڕەزای خوای لێبێت دەیشتو (فەضلی کوڕی عەباس و ئوسامە و شەقران) ی بەندەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم ئاویان دەدایە دەستی.

[٤٢٢] _ يتشاورون : واتە لە کاروباری جێنشینیدا ڕاوێژیان دەکرد.

الثلاثة (٤٢٥): (ثاني اثـنين إذ هما في الغار إذ يقول لصحابه لا تَـحْـزَنْ إن الله معنا)، من هما؟ (٤٢٦) قال: ثم بسط يده فبايعه، وبايعه الناس بيعة حسنةً جميلة)).

ڕاپەڕن با بچینە خزمەتی برا پشتیوانەکانمانو لەم کارەدا بەشداریان بکەین. ئەوەبوو پشتیوانان فەرموویان: با لە ئێمە ئەمیرێك و، لە ئێوەش ئەمیرێك بێت. (عومەری کوڕی خەتاب) فەرمووی: چ کەسێك ئەم سیانەی تێدایە: ((دووەمی دوو کەس کە لە ئەشکەوتەکەدان بە هاوەڵەکەی دەفەرمێت غەمبار مەبە بە دڵنیای خوامان لە گەڵدایە)). ئەو دوانە کێن؟ سالم فەرمووی: پاشان دەستی درێژکردو کفتی پێداو، خەڵــکەکەش گفتیان پێدا گفتپێدانێکی چاکی جوان)).

صحيح ٣٣٤_ عن أنس بن مالك قال: لما وَجَد رسولُ الله صلى الله عليه وسلم من كربِ الموتِ ما وَجَدَ، قالت فاطمة رضي الله تعالى عنها: واكَـرْباه! فقال النبي

[٤٢٣] _ لە کەپرەکەی (بەنی ساعیدە)دا کۆبوونەوەو، بێـژەریش (ئەلحەبابی کوڕی مـنـذر) بوو.

[٤٢٤] _ فقال عمر: لە (ریوایە) تێـکدا هاتووە کەوا: (عومەر) فەرمووی: ئەی کۆمەڵـی پشـتیوانان: ئایا لای هەمووتان زانراو نییە کەوا پێـغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم فەرمانیدایە (ئەبو بەکر) پێـش نوێـژی بکات. کامتان شادو خۆشحاڵە پێـشی (ئەبو بەکر) بکەوێت؟ ئەوەبوو پشتیوانان فەرموویان: پەنا دەگرین بە خوا کە پێـشی (ئەبو بەکر) بکەوین.

[٤٢٥] _ من لە مثل هذه الثلاثة: واتە چ کەسێـك ئەم سێ تایبەتمەندیە چاکانەی تێدایە کە بۆ ئیمامی (ئەبو بەکر) جێـگیر بووە، ئەوەش پرسیارێـکی نکۆڵـیکردن بوو (إستفهام إنكاري) مەبەستی بوو بەر پەرچی پشتیوانان بداتەوە کە وایان دەزانی هەقیان لە جێـنشیندا هەیە. چاکەی یەکەم: یەکێـکە لەو دوانەی خوای تعالى دەربارەیان فەرموویەتی: (دووەمی دوو کەس لە ئەشکەوتەکەدا) خوای تعالى لەگەڵ پێـغەمبەرەکەیدا باسی دەکات بە ڕاناوی دووتاکردن (ضمير التـثـنية). چاکەی دووەم: سەلماندنو جێـگیرکردنی هاوەڵـێـتی لە گوفتاری خوای پەروەردگاردا (إذ يقول لصاحبه لا تحزن) واتە بە هاوەڵەکەی دەفەرمێـت: غەمبار مەبە. چاکەی سێیەم: سەلماندنو جێگیرکردنی لەگەڵبوون لە گوفتاری خوای پەروەردگارا (إن الله معنا) واتە خوامان لە گەڵدایە، بۆیە جێـگیربوونی ئەم تایبەتـمەندیانە تیایدا ڕێـی پێدەدا هەقی جێـنشینی هەبێــت.

[٤٢٦] _ من هما: واتە کێــن ئەوانەی لەم ئایەتەدا ئاماژەیان بۆ کراوە؟.

[٣٣٤] _ البخاري في آخر ((الغازي)) وابن ماجة في ((الجنائز)) والنسائي فيه بنحوه. (قـلـت: هو عند ابن ماجة (١٦٢٩) بإسناد المؤلف ومتـنه، وهو حسن، رجالـه ثـقات رجال الشيخين غير عبدالله بن الزبير الباهلي، وقد وثـقه ابن حبان وقال الدارقطني: ((صالح)) وروى عنه جمع.

صلى الله عليه وسلم: ((لا كَـرْبَ على أبيك بعد اليوم، إنه قد حَـضَرَ من أبيك ما ليس بتارك منه أحداً، (٤٢٧) الموافاة يوم القيامة (٤٢٨))).

٣٣٤ _ لە ئەنەسی كوڕی مالكەوە فەرموویەتی: كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئازارو ناڕەحەتیەكانی مردنی توشبوو ئەوەی تووشیبو، فـاطیمە ڕەزای خوای تعالای لێبێت فەرمووی: داخەكەم بۆ ئەم ئازار و ناڕحەتیانە! ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((پاش ئەمڕۆ هیچ ئازارو ناڕەحەتیەك تووشی بابت نابێت، ئەو مردنەی كە بۆ بابت هاتووە هیچ كەسێك بە جێناهێلێت، پێگەیشتنیش ڕۆژ ی (قیامەت)ە)).

ضعيف ٣٣٥_ ابن عباس رضي الله تعالى عنهما يحدث أنه سمع رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: ((من كان له فَـرَطان (٣٢٩) من أمتي أدخله بهما الجنة)). فقالت عائـشة رضي الله عنها: فمن كان له فرط من أمتـك؟ قال: ((ومن كان له فرط

---

وتابعه حماد بن زيد دون قوله : ((إنه قد حضر...)). وهكذا هو عند البخاري، وكذلك رواه النسائي في ((الجنائز)) من طريق معمر. وتابعه المبارك بن فضالة بالزيادة. أخرجه أحمد (٣/ ١٤١)، وسنده حسن، فالحديث صحيح بتمامه أيضاً وقد خرجته في ((الصحيحة)) ١٧٣٨).

٤٢٧ _ واتە ئەگەرچی مردن تووشی بابت بووە بەڵام بۆ هەمووان شتێـكی گشتی یە و كارەساتیش كە گشتی بوو سووكو سانا دەبێـت.

٤٢٨ _ الموافاة يوم القيامة : واتە پێـگەیشتن ڕوودەداتو بەدڵنیایی دێـتە ئاراوە ڕۆژی قیامەت.

٣٣٥ _ أخرجه المؤلف في((الجنائز)) برقم ١٠٦٢.

(قـلـت : وقال : ((حديث حسن غريب، لا نعرفه إلا من حديث عبد ربة بن بارق، وقد روى عنه غير واحد من الأئمة)).

قـلـت : لكن قال الساجي : ((حدث عنه الحرشي بمناكير)). وابن معين : ((ليس بشيء)). وأما أحمد فقال : ((ما أرى بأسا والله أعلم. ومن طريقه أخرجه في ((المسند)) (١/٣٣٤_ ٣٣٥) والخطيب في ((التاريخ)) (٢٠٨/١٢) والضياء في ((المختارة)) ٦١/٢٦٦/١).

٣٢٩ _ فـرَطان : واتە ئەو كەسەی دوو منداڵی مردبێـت كوڕ بێـت یا كچ و لە پێـش خۆیدا مردبن ﴿والفرط﴾ لە بنچینەدا : كەسێـكی پێـشكەوتووی خەڵـكێـكی كۆچكردوە لە پێـشی خۆیانەوە دەینێـرن جێـگەی دابەزینیان بۆ ئامادە بكات.

یا مُـوَفـّـقَــة)). قالت: فمن لم یکن له فرط من أمتـك؟ قال:((فـأنا فرط لأمتي، (٤٣٠) لن یصابوا بمثـلي)).

٣٣٥ _ له ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوا له خۆی و باپیشی بێت دەڵێت گوێبیستی پێغەمبەری خوا بووم ﷺ دەیفەرموو: ((هەرکەسێك دوو منداڵی بمرێت و پێشیکەوێت له ئومەتەکەم پەروەردگار بە هۆی هەردوکیانەوە دەیخاتە بەهەشتەوە)). عائـیشە ڕەزای خوای لێبێت فەرمووی: ئەی ئەو کەسەی منداڵـێکی مردووی پێشکەوتی هەبێت له ئوموتەکەت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەو کەسەی منداڵـێکی مردووی پێشکەوتیشی هەبێت ئەی شاد و سەرکەوتوو)). عائـیشە فەرمووی: ئەی ئەوەی منداڵی مردووی پێشکەوتی نەبێت له ئومەتەکەت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەوجا من مردووی پێشکەوتی ئومەتەکەمم و تووشی هیچ کارەساتێکی تر نابن هاوشێوەی کارەساتی مردنم)).

[430] _ فـأنا فرط لأمتي : واتە من مردووی پێـشکەوتووی ئومەتەکەمم و، کارەساتی مردنیشی سەخترین کارەساتەکان بوو .

## ٥٤_ بەشی ئەوەی سەبارەت بە میراتی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە:

صحيح ٣٣٦_ عن عَمرو بن الحارث أخي جويرية _ له صحبة _ قال: ((ما ترك رسولُ الله صلى الله عليه وسلم إلا سلاحَـه، (٤٣١) وبغلـتَــه، (٤٣٢) وأرضاً (٤٣٣) جعلها صدقـةً(٤٣٤))).

٣٣٦ _ لە عەمری كوڕی حارثی برای جویریەوە _ كە هاوەڵــێتی هەبووە _ فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی بە جێنەهێشت جگە لە چەكەكەیو، ئێسترەكەیو، زەویەك كردی بە خەیر)).

حسن ٣٣٧_ عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: ((جاءت فاطمة إلى أبي بكر فقالت: من يرثـك؟ فقال: أهلي وولدي. فقالت: مالي لا أرث أبي؟ فقال أبوبكر: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: ((لا نُـورَث)). ولكني أعُـولُ (٤٣٥) من

---

[٣٣٦] _ أخرجه البخاري في ((الخمس)) و((الجهاد)) و((المغازي)) و((الوصايا))والنسائي في ((الأحباس)).

(قـلـت : وأحمد أيضاً (٤/٢٧٩) وابن سعد ٢/٢١٦).

[٤٣١] _ سلاحە: واتە چەكەكەی وەكو شمشێرو ڕمو میغفەرو حەربەكەیو هتد.

[٤٣٢] _ بغلـتە: واتە ئێسترە سپیەكەی كە ناوی ( دول دول ) بوو.

[٤٣٣] _ أرضاً: واتە بەشێـك لە زەویەكانی فەدەكو خەیبەرو بەنی نەضیر.

[٤٣٤] _ جعلها صدقة : كردی بە خێـر لەبەر ئەو فەرمودەیەی كە دەفەرمێـت : ((نحن معاشر الأنبياء لا نورث، ما تركناه صدقة)). واتە ئێـمەی كۆمەڵی پێـغەمبەران میرات بە جێــناهێـڵـین و ئەوەش بە جێـمان هێـڵاوە خەیرو چاكەداریە.

[٣٣٧] _ أخرجه المؤلف في ((السير)) برقم ١٦٠٨. (قـلـت : وقال : ((حسن غريب))، وأخرجه أحمد (١/١٠) لكنه لم يذكر أبا هريرة في إسناده، والطريق واحد، لكنه أثبته (٢/٣٥٣) من طريق أخرى، فالأسناد حسن).

[٤٣٥] _ واتە خەرجی و بژێـوی ئەو كەسە دەدەم كە پێـغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم خەرجی و بژێـوی دەدا.

كان رسولُ الله صلى الله عليه وسلم يعولُـه، وأُنْـفِـقُ على من كان رسولُ الله صلى الله عليه وسلم يُـنْـفِـقُ عليه)).

٣٣٧ _ لە ئەبی هوریرەوە ڕەزای خوای لیٚ بێت فەرموویەتی: ((فاطمە ڕەزای خوای لێبێت چووە خزمەتی ئیمامی (ئەبو بەکر)و پێی فەرموو: کیٚ میرات گرتە؟ ئەبو بەکر فەرمووی: خێزانو منداڵەکانم. فاطمة فەرمووی: ئەی من بۆ میرات گری بابم نیم؟ ئەبوبەکر فەرمووی: گوێبیستی پێغەمبەری خوا بووم ﷺ دیفەرموو: ((میرات گرمان نییە)). بەڵام ئەو کەسەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە خێوی دەکرد منیش بە خێوی دەکەم، ئەوەش پێغەمبەری خوا ﷺ خەرجیو بژێوی دەدا منیش خەرجی و بژێوی دەدەم)).

٣٣٨ _ عن أبي البَـخْـتَـري (٤٣٦) أن العباس وعلياً جاءا إلى عمر يختصمان، يقول كُـلُّ واحدٍ منهما الصحابه: أنت كذا أنت كذا، فقال عمر لطلحة والزبير وعبدالرحمن بن عوف وسعد رضي الله تعالى عنهم: أنشدكم بالله أسمعتم رسولَ الله صلى الله عليه وسلم يقول: صحيح ((كل مال نبيٍ صدقة إلا ما أطْـعَـمَـهُ، إنا لا نورَث))؟ وفي الحديث قصة.

٣٣٨ _ لە ئەبی ئەلبەختریەوە: ئیمامی عەباس و ئیمامی عەلی چوونە خزمەتی ئیمامی عومەرو ناکۆکیان لە نێواندا بوو، هەر یەکێك بە هاوەڵەکەی دەگوت: تۆ ئاوەها تۆ ئاوەها. ئەوەبوو ئیمامی عومەر بە طەلحەو زوبێرو عبدولڕەحمانی کوڕی عەوفـو سەعدی فەرموو ڕەزای خوایان لێبێت: سوێندتان دەدەم بە خوا ئایا گوێبیستی پێغەمبەری خوا بوون ﷺ بفەرموێت؟: ((سەراپای

---

[٣٣٨] _ أخرجه أبوداود في ((الخراج)) برقم ٢٩٧٥.

(قـلـت : وعنده القصة التي أشار إليها المؤلف، وفي إسنادهما انقطاع كما بينته في ((الصحيحة)) (رقم ٢٠٣٨)، لكن له شاهد يقويه ذكرته هناك).

[٤٣٦] _ البَـخْـتَـري" بفتح الباء وسكون الخاء وفتح التاء : ناوی تەواوی سەعیدی کوڕی زەیدی فەیروزی طائي کوفیە، تابعیەکی بەڕێزە و ساڵی (٨٣) کۆچی لە (الجماجم) مردوە.

ماڵو سامانی پێغەمبەران خەیرو چاكەداریە بە دەر لەوەی بە خواردی داوە))؟ لە فەرموودەكەشدا چیرۆكێك هەیە.

صحيح ٣٣٩ _ عن عائشة رضي الله تعالى عنها: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: ((لا نورَث، ما تَـرَكـنـا فهو صَدَقَــةٌ)).

٣٣٩ _ لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((میرات گرمان نییە، ئەوەی بە جێمان هێشتووە خەیرو چاكەداریە)).

صحيح ٣٤٠_ عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: ((لا يَـقـسِـم ورثـتي ديناراً ولا دِرهماً، ما تركتُ بعد نفقةِ نسائي ومؤنةِ عاملي فهو صدقة)).

٣٤٠ _ لە ئەبی هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: ((میراتگرانم نە دینارو نە دیرهەم دابەش ناكەن، ئەوەی بە جێم هێشتووە پاش خەرجیو بژێوی خێزانەكانمو ئازوخەی كرێكارانی زەویەكانم خەیرو چاكەداریە))

صحيح ٣٤١_ عن مالك بن أوس بن الـحَدْثـان قال: ((دخلتُ على عُـمَـرَ، فدخل عليه عبد الرحمن بنِ عوفٍ وطلحةَ وسعد، وجاء علي والعباس يختصمان،

---

٣٣٩ _ أخرجه البخاري في ((الفرائض)) ومسلم في ((الجهاد)) حديث ١٧٥٨.

٣٤٠ _ أخرجه البخاري ومسلم وأبوداود في ((الخراج)) برقم ٢٩٧٤. وزاد فيه ((مؤنة عاملي، (يعني أكَـرَة الأرض) والخليفة من بعدي كأبي بكر وعمر إلخ. واتە ئەم زیادەیەش دەخاتە سەر فەرموودەكە ((مؤنة عاملي، (واتە: كرێی كرێكارانی زەویەكان)والخليفة من بعدي (واتە جێنشینەكانی پاش خۆم وەكو ئەبو بەكرو عومەر وهتد...) هەروەها ئیمامی ئەبو داود بە ژمارە (٢٩٧٢) دەگێڕێتەوە كە زەویەكانی فەدەك تایبەت بوو بە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم و خەرجیو بژێویشی لێدەكرد، پاشان ئەبو بەكرو عومەریش چاودێریان دەكردو دەیانگرتە ئەستۆ، پاشانیش مەروان بۆ خۆی تەرخانی كردبوو، كاتێكیش عومەری كوری عبدالعزيز بو بە خەلیفە گەڕاندیەوە بۆ (بيت المال).

فقال لهم عمر: أنشدكم بالذي بإذنه تقوم السماء والأرض أتعلمون أن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال: ((لا نورَث، ما تركناه صدقة))؟

فقالوا: اللهم نعم)). وفي الحديث قصة طويلة.

٣٤١ _ لە مالكی كوڕی ئاوسی كوڕی ئەلحەدثانەوە فەرموویەتی: ((چوومە خزمەتی ئیمامی عومەرو، هاوكات عبدولرحمانی كوڕی عەوفو طەلحەو سەعدیش هاتنە ژوورەوەو، لەو كاتەشدا عەلیو عەباسیش هاتنە ژوورەوەو ناكۆكیان لە نێواندا بوو، ئەوەبوو عومەر پێی فەرموون: سوێندتان دەدەم بەو خوایەی كە بە مۆڵەتی خۆی ئاسمانو زەوی ڕاگیربووە ئایا ئێوە دەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویێتی: ((میراتگرمان نییە، ئەوەی بە جێمان هێڵاوە خەیرو چاكەدارییە)). فەرموویان: ((پەروەردگارا بەڵێ)). فەرموودەكەش چیرۆكێكی درێژی تێدایە.

صحيح ٣٤٢ _ عن عائشة رضي الله عنها قالت: ((ما ترك رسول الله صلى الله عليه وسلم ديناراً ولا درهماً ولا شاةً ولا بعيراً)). قال: وأشُكُّ في العبد والأمة.

٣٤٢ _ لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێت فەرموویەتی: ((پێغەمبەری خوا ﷺ پاش مردنی هیچی بە جێ نەهێشتن نە دیناروو نە دیرهەمو نە مەڕو نە وشترێك)). فەرمووی: بە گومانیشم لە بەندەو كەنیزەدا.

---

[٣٤١] _ أخرجه البخاري في ((الجهاد)) و((الفرائض)) ومسلم في ((الجهاد)) برقم ١٧٥٧ وأبوداود برقم ٢٩٦٣والمؤلف برقم ١٦١٠ والنسائي. (قلت : وقال المؤلف : ((حديث حسن صحيح غريب))).

[٣٤٢] _ أخرجه مسلم وأبو داود والنسائي. (قلت : وابن ماجة أيضاً (٢٦٩٥) كلهم في ((الوصايا)) من طريق أخرى عن عائشة دون قوله : ((قال : وأشك)). وإسناد المؤلف حسن، وبه أخرجه أحمد (١٣٦/٦) دون الشك، وكذا ابن سعد

(٣١٦/٢_٣١٧) وعند الأولين مكانهما : ((ولا أوصي بشيء)). والطريق الأولى إسنادها صحيح على شرط الشيخين، كما في ((صحيح أبي داود)) ٢٥٤٩).

## ٥٥ _ بەشی ئەوەی سەبارەت بە بینینی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەوندا هاتووە:

صحيح ٣٤٣ _ عن عبدالله بن مسعود عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: ((من رآني في المنام فقد رآني، فإن الشيطان لا يتمثل بي)).

٣٤٣ _ لە عەبدوڵای كوڕی مەسعودەوە لە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر كەسێك لە خەوندا منی بینیبێت بە دڵنیایی بینیومیەتی، چونكە شەیتان توانای خۆ چواندنی بە من نییە))

صحيح ٣٤٤_ عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((مَنْ رآني في المنام فقد رآني، فإنَّ الشيطان لا يَتَصَوَّرُ أو قال: لا يَتَشَبَّه بي))

٣٤٤ _ لە ئەبی هوریرەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر كەسێك لە خەوندا منی بینیبێت بە دڵنیایی بینیومیەتی، چونكە شەیتان توانای هاوشێوەیی یا فەرمووی: وێچوونیی بە من نییە)).

٣٤٥ _ عن أبي مالك الأشجعي عن أبيه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: صحيح ((مَنْ رآني في المنام فقد رآني)). (٤٣٧) قال أبو عيسى: وأبو مالك هذا

[٣٤٣] _ أخرجه المؤلف في ((كتاب الرؤيا)) برقم ٢٢٧٧ وابن ماجة في ((الرؤيا)) برقم ٣٩٠٢. (قلت: وقال المؤلف: ((حديث حسن صحيح))، ورواه الدارمي أيضاً (٢/١٢٣_١٢٤) وأحمد ١/ ٤٤٠ و٤٥٠).

[٣٤٤] _ أخرجه ابن ماجة برقم ٣٩٠١.

(قلت : وإسناده صحيح على شرط مسلم، وإسناد المؤلف على شرط الشيخين، وقد أخرجه أحمد بهما، وبأسانيد أخرى (١/ ٤٠٠و٢/ ٢٣٢ و٢٦١ و٣٤٢ و٤١٠ و٤١١ و٤٢٥ و٤٦٣ و٤٦٩ و٤٧٢ و ٥/٣٠٦) وكذا الشيخان وأبو داود (٥٠٢٣) والطيالسي (١٧٩٢) من طرق عن أبي هريرة بألفاظ متقاربة، صحح أحدهما المؤلف ٢٢٨١).

هو سعد بن طارق بن أشْـيَـم، وطارق بن أشيم هو من أصحاب النبي صلى الله عليه وسلم، وقد روى عن النبي صلى الله عليه وسلم أحاديث. (٤٣٨).

٣٤٥ _ ئەبی مالکی ئەشجەعی لە بابیەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێك لە خەوندا منی بینیبێت بە دڵنیایی بینیومیەتی)). ئەبو عیسا فەرموویەتی: ئەم ئەبو مالکە سەعدی کوڕی طارقی کوڕی ئەشیەمەو، طارقی کوڕی ئەشیەمیش یەکێك بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺو چەند فەرموودەیەکیشی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

صحيح ٣٤٦ _ عن أبي هريرة يقول: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((مَـنْ رآني في المنامِ فقد رآني، فـإن الشيطان لا يَـتَـمَثَّـلُـني)). قال أبي: (٤٣٩)

---

[٣٤٥] _ (قـلـت : إسناده على شرط مسلم، لكن فيه خلف بن خليفة وكان اختـلط، لكن الحديث صحيح بشواهده الكثيرة التي منها ما ذكره المؤلف. والحديث رواه أحمد أيضاً (٤٧٢/٣ و٣٩٤/٦). وأبومالك الأشجعي : سعد بن طارق بن أشيحة ثـقة.

٤٣٧ _ ئەوەش یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم چونکە پارێزراو بوو لە شەیتان.

[٤٣٨] _ من هذه الأحاديث حديث القنوت في الصلاة ﴿ محدث ﴾، عند الترمذي والنسائي وابن ماجة. وحديث دعاء ((اللهم أغفر لي وارحمني)) عند مسلم وابن ماجة، وحديث ((من قال لا إله الله حرم دمه وماله)). عند مسلم. (قـلـت : وهذا كل ماله في الكتب الستة). واتە لەو فەرموودانەی کە (ئەبو مالك) دەیگێڕێتەوە ؛ فەرموودەی قنوت لە نوێژدا ﴿ داهێنراوە ﴾، کە ئیمامی ترمذیو نەسائی و ئیبنو ماجە ( تخريج ) ی دەکەن. وە فەرموودەی نزای ؛ (( پەروەردگارا لیم خۆش بەو بەزەیت پێمدا بێتەوە )) کە ئیمامی موسلیمو ئیبنو ماجە ( تخريج )ی دەکەن. هەروەها فەرموودەی ؛ (( هەر کەسێك بڵێت لا إله إلا الله ماڵ و خوێنی حەرام دەبێت )). کە ئیمامی موسلیم ( تخريج ) ی دەکات.

[٣٤٦] _ (قـلـت : إسناده صحيح رجاله كلهم ثـقات، وأخرجه أحمد (٢٣٢/٢) من هذا الوجه والحاكم (٣٩٣/٤) وقال : ((صحيح الإسناد)). ووافقه الذهبي، وقال الحافظ في ((الفتح)) :((وسنده جيد)). وفيه تأييد لما رواه إسماعيل القاضي عن أيوب قال : كان ابن سيرين (وهو ممن روى هذا الحديث عند الشيخين) إذا قـصَّ رجل أنه رأى النبي صلى الله عليه وسلم قال : صفه لي. ذكرت الحسن بن علي فـشـبهـته به. قال: قد رأيـته. وسنده جيد.وعـلـقه البخاري) واتە: فەرموودەکەی ئەبی هوریرە پشتگیری گێڕانەوەکەی ئیسماعیلی قازی لە ئەیوبەوە دەکات

فحدثـت به ابن عباس فقلت: قد رأيتُـه (٤٤٠) فذكرت الحسن بن علي فقلت: شبهته به. فقال ابن عباس: إنه كان يشبهه.(٤٤١)

٣٤٦ _ ئەبو هوريرە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر كەسێك لە خەوندا منی بیـــنیـــبێت بە دڵنیای بینیومیەتی چونكە شەیتان خۆی بە من ناچوێنێت) عاصم فەرموویەتی: بابم فەرمووی: ئەم فەرموودەیەم بۆ ئیبنو عەباس گێڕایەوەو گوتم: بە دڵنیای پێغەمبەری خوام ﷺ لە خەوندا بینیوەو حەسەنی كوڕی عەلیشم بەیادهێنایەوەو گوتم: شێوەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەچوو. ئەوەبوو ئیبنو عەباس فەرمووی: بەدڵنیایی شێوەی لەو دەچوو.

حسن ٣٤٧_ عن يزيد الفارسي وكان يكتب المصاحف قال: ((رأيتُ النبي صلى الله عليه وسلم في المنام زَمَنَ ابن عباسٍ، فقلت لأبن عباس: إني رأيت رسول الله صلى الله عليه وسلم في النوم. فقال ابن عباس: إن رسول الله صلى الله عليه وسلم كان يقول:((إن الشيطان لا يستطيع أن يتـشبه بي، فمن رآني في النوم فقد رآني)). هل تستطيع أن تَـنْـعتَ هذا الرجل الذي رأيتَـه في النوم؟ قال: نعم، أنعتُ لك رجلاً بين الرجلين، جسمُـه ولحمه أسمر إلى البياض، أكحلُ العينين، حسن الضحك، جميل

كە دەفەرموێت: ئیبنو سیرین (یەكێكە لەو پیاوانەی فەرموودەكەی لای بوخاریو موسلیم گێڕاوەتەوە ) هەركات پیاوێك بۆی باسكردایە كەوا پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم لە خەوندا بینیوە دەیفەرموو: وەسفێكم بۆ بكە. منیش حەسەنی كوڕی عەلیم بە یادهێنایەوەو بە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم چواند. ئیبنوسیرین فەرمووی: بە دڵنیایی بینیوتە.

[٤٣٩] _ قال أبي : واتە (كولەیبی) بابی عاصم، پیاوێـكی تابعیەو ﴿ بە ئیبنو شهاب بە ناوبانـگە، پیاوێكی ڕاستگۆیە ﴾.

[٤٤٠] _ قد رأيته : واتە پێـغەمبەری خوای صلى الله عليه و سلم لە خەوندا بینیوە.

[٤٤١] _ إنە كان يشبهه : واتە شێـوەی حەسەنی كوڕی عەلی لە پێـغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم دەچوو.

[٣٤٧] _ أخرجه ابن ماجة في ((الرؤيا)) برقم ٣٩٠٥.

(قـلـت : يعني المرفوع منه دون الـقصة، وهو رواية لأحمد (٢٧٩/١)، وإسناد االمؤلف جيد رجاله ثـقات رجال الشيخين غير يزيد الفارسي، قال ابن أبي الحاتم (٢٩٤/٩) عن أبيه : ((لا بأس به)). وأخرجه أحمد أيضاً (١/ ٣٦١ _ ٣٦٢) ويشهد له ما قبله).

دوائر الوجه، ﴿ قد ﴾ لأت لحيتُــه ما بين هذه إلى هذه، قد ملأت نحره. قال عوف (٤٤٢): ولا أدري ما كان مع هذا النعت، فقال ابن عباس: لو رأيته في اليقظه ما استطعت أن تنعته فوق هذا)).

٣٤٧_ له یەزیدی فارسیەوە كە قورئانی دەنوسیەوە فەرموویەتی: ((لە زەمەنی ئیبنو عەباسدا پێغەمبەری خوام ﷺ لە خەوندا بینیو، بە ئیبنو عەباسم گوت: پێغەمبەری خوام ﷺ لە خەوندا بینیوە. ئیبنو عەباس فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((شەیتان توانای وێچوونی بە من نییە، هەركەس لە خەوندا منی بینیبێت بە دڵنیایی بینیومیەتی)). ئایا توانای وەسفكردنی ئەو پیاوەت هەیە كە لە خەوندا بینیوتە؟ یەزید فەرمووی: بەڵێ: وەسفی پیاوێكت بۆ دەكەم باڵا مامناوەند، گۆشتی جەستەی گەنمی (أسمر) بەرەو سپی بوو، چاوڕەشو، دەم بە پێكەنینێكی جوان، شێوەو ڕوخسار جوان، ڕیشی نێوان ئەمە تا ئەمەی پڕ كردبوو، بە تەواوی ملی پڕ كردبوو. عەوف فەرمووی: نازانم چیتر لەگەڵ ئەم وەسفەدا بوو، ئەوەبوو ئیبنوعەباس فەرمووی: ئەگەر لە كاتی بە ئاگابونیشتدا بتبینیبا نەتدەتوانی لەمە زیاتر وەسفی بكەی).

صحيح ٣٤٨_ قال أبو قتادة: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((من رآني _ يعني _ في النوم فقد رأى الـحَقَّ)).

٣٤٨ _ ئەبو قەتادە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر كەسێك منی بینیبێت _ مەبەستی _ لە خەوندایە بە دڵنیایی هەقی بینیوە)).

صحيح ٣٤٩_ عن أنـس: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: ((مَــنْ رآني في المنام فقد رآني، فـإن الشيطان لا يَتَــخَــيَّـلُ بي)).

---

[٤٤٢] _ عوف هذا هو ابن أبي جميلة الراوي عن يزيد الفارسي.

[٣٤٨] _ أخرجه أحمد والبخاري ومسلم / الجامع الصغير/

(قـلـت : هو في ((المسند)) (٣٠٦/٥) ورواه الدارمي ١٢٤/٢).

[٣٤٩] _ أخرجه أحمد والبخاري والمؤلف. ((الجامع الصغير)).

٣٤٩ _ لە ئەنەسەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێك لە خەوندا منی بینیبێت بە دڵنیایی منی بینیومیەتی، چونکە شەیتان توانای هاوشێوەیی منی نییە)).

صحيح ٣٥٠_ وقال: ((ورؤيا المؤمن جزء من ستة وأربعين جزءاً من النبوة)).

٣٥٠ _ هەروەها فەرموویەتی: ((خەونی ئیماندار بەشێکە لە چـل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی)).

صحيح ٣٥١ _ قال عبدالله بن المبارك: ((إذا ابتُـلِيتَ بالقضاء فعليك بالأثر)).(٤٤٣)

٣٥١ _ لە عەبدوڵای کوڕی موبارەکەوە: ((هەرکات تاقیکرایتەوە بە دادوەری نێوان خەڵك فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەزموون وشارەزایی (أثر) جێنشینەکانیی بە کاربێنە)).

---

(قـلت : لم يروه المؤلف في ((السنن)) وإنما هنا فقط، وليس عند البخاري وأحمد (٣/٢٦٩) : ((وقال))، وإنما جعلا قوله : ((ورؤيا...)) من تمام ما قبله. فهو مرفوع جزماً فلا وجه للتردد فيه، وأنه معروف له حكم المرفوع كما وقع في الأصل. ويؤيده التخريج الآتي).

[٣٥٠] _ في الجامع الصغير أخرجه أحمد والبخاري في ((التعبير الرؤيا)) وكذا مسلم عن أنس، وأبوداود في ((الأدب)) برقم ٥٠١٨ عن أنس عن عبادة، والمؤلف عن عبادة بن صامت برقم ٢٢٧٢. (قـلت : وقال : حديث صحيح).

[٣٥١] _ (قـلت : إسناده إلى ابن المبارك صحيح، وهو من كبار شيوخ الأمام أحمد الذين يكثر من الرواية عنهم في ((المسند)) وغيره. توفي سنة ١٨١). واتە عەبدوڵای کوڕی مبارك لە گەورە شێخەکانی ئیمام ئەحمەدە کە بە زۆری فەرموودەی لێدەگێڕێتەوە لە (( المسند )) و هیدیکەشدا، ساڵی ١٨١ کۆچی مردووە.

[٤٤٣] _ واتە ئەگەر تاقیکرایتەوە بە دادوەری لە نێوان خەڵـکدا (فعليك بالأثر) واتە ئەو فەرموودانەی لە پێغەمبەری خواو جێـنـشـینەکانیەوە ( ریوایە ) ت کراوە لە بواری حوکمدانیاندا بە کاربێـنە. قال النووي في ((شرح مسلم)) : ((الأثر عند المحدثين يعم المرفوع والموقوف، كالخبر والحديث)).

صحيح ٣٥٢_ عن ابن سيرين (٤٤٤) قال: ((هذا الحديث (٤٤٥) دِينٌ، فانظروا (٤٤٦) عمن تـأخذون دينكم)).

٣٥٢ _ له ئیبنو سیرینەوە فەرموویەتی: ((ئەم فەرموودانە خواپەرستی پێدەكرێت كەوابو تێڕوانن لە چ كەسێكەوە ئاینەكەتان وەردەگرنو دەگێڕنەوە)).

(پەروەردگارا پاك و بێگەردی و سوپاس و ستایش بۆ تۆیە، شایەتی دەدەم كە هیچ خوایەك نی یە بە حەق جگە لە تۆ، داوای لێخۆش بونت لێدەكەم و دەگەڕێمەوە بۆ لات).

بەراوردكردنی بە دەستنوسی یەكەم و ڕاستكردنەوەی لە سەری و ئامادەكردنی بۆ چاپ بەرەبەیانی ڕۆژی یەك شەممەی (٢٣) ڕەجەبی ساڵی ١٤٠٢ كۆچی كۆتای پێهات، والحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات.

عمان _ الأردن
محمد ناصرالدين الألباني

---

٣٥٢ _ أخرجه مسلم وغيره.
(قلت: هو في ((مقدمة صحيح مسلم)) بلفظ: ((إن هذا العلم دين...)) وقد رواه بعض الضعفاء مرفوعاً إلى النبي صلى الله عليه وسلم ولا يصح، وقد خرجته في ((الضعيفة)) ٢٤٨١).

٤٤٤ _ ابن سيرين: (سيرين) ناوى دايكيەتىو كەنيزەى (ئومو سەلەمە)ى دايكى ئيمانداران بووە ڕەزاى خواى لىٚ بێت. لێرەشدا ئەم (أثر)ە خراوەتە ڕوو بۆ ڕوونكردنەوەى زۆر دڵنيابوونو پارێزكردن لە وەرگرتنى (ريوايە)كانو گێڕانەوەى فەرموودەكاندا.

٤٤٥ _ مەبەست بە (حديث) ئەوەى جێگیر بووە لە پێغەمبەرى خواوە صلى الله عليه وسلم. (دين) : واتە ئاينداری پێدەكرێت چونكە پێویستە خوا پەرستی پێبكرێت.

٤٤٦ _ واتە: تێڕوانن لە چ كەسێكەوە ئاینەكەتان دەگێڕنەوە، پاشانیش تەنها لە كەسێكەوە بیگێڕنەوە كە لێهاتووى ئاشكرا بووە بە تايبەت كەسانى بە دادو باوەڕ پێكراو ڕێك و پێك.

## ناوەڕۆك